"فاتیمە پارچەیەکە لە من."

حەزرەتی موحەممەد(ﷺ)

گوڵباخەکەی خۆشەویست

# فاتیمە

رضي الله عنها

ڕۆمان

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

نوردان داملە

وەرگێڕانی: هانا ماجد

RENWEN



نوردان داملە

# فاتیمە

## گوڵەباخەکەی خۆشەویست

وەرگێڕانی

هانا ماجد مشیر

ناوی کتێب: فاتیمە
گوڵەباخەکەی خۆشەویست
ناوی نووسەر: نوردان دامڵە
وەرگێڕانی: هانا ماجد مشیر
دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢٣
چاپ: ناوەندی ڕێنوێن
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٠١٩)ی ساڵی (٢٠٢٣)ی پێ دراوە.

**مافی لەچاپدانەوەی پارێزراوە بۆ ناوەندی ڕێنوێن©**







**ناوەندی ڕێنوێن**



**07511408868 - 07501269689**



**hakem1423@yahoo.com**
**renwen2009@yahoo.com**



**سلێمانی - بازاڕی کاسۆمۆڵ - نهۆمی دووەم**
**دوکانی ژمارە (٤٥)**



# پێڕست



# پێشەکی

بسم الله

داواکارم لە ماوەی خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا زووزوو سەڵات و سڵاو بنێرن بۆ ڕەسولی گیانی گیانانمان و ئەهلو بەیتەکەی...

فاتیمەی زهرا ئەستێرەی ئاسمان و گوڵەباخی سەر ڕووی زەوی بوو، پەیوەندییەکی نهێنی لەنێوانیاندا هەبوو، ئەستێرە و گوڵی زەوی، گوڵڕەنگ و ئاهەنگی لە ئەستێرەکەوە وەر دەگرت و وەک بڵێی لە ئاسمان ڕوابێ و لێبووبێتەوە و کەوتبێتە خوارەوە بۆ سەر زەوی و نهێنیی خۆی بۆ ئەوانە دەگێڕایەوە کە بەشوێن نهێنیی فاتیمەدا وێڵ بوون: "لە ئەودا من و لە مندا ئەو ببینە، تەماشای من بکە و فاتیمە بەو جۆرە پێناسە بکە، تەماشای بکە و وەک چاوت مەحرەمیەتی بپارێزە. لە ڕەنگمدا پێستی و لە شێوازی پەڕەکانمدا بەندایەتییەکەی و لە شاراوەییەکەمدا ڕەوشتی و لە ئاهەنگمدا سەنگینی و لە تۆوەکانمدا بەرەکەتداریی ببینە. تەماشای من بکە و باس لە ئەو بکە، باسی بکە بە وشەکان برژێنە سەر پەڕە سپییەکان، باسی بکە با گرێکوێرەکان بکرێنەوە، دەرگای گەنجینەی نهێنییەکان بکرێتەوە و دڵەکان بزانن لەودیو پەردەی ئاشناییەوە چ ئاهەنگ و جوانییەک شاراوەیە. "

***

"فاتیمەی کچم حۆری نێو ئینسانەکانە و گەر خودا عەلی نەئافراندایە، هیچ کەس شایانی ئەوە نەبوو ببێت بە هاوسەری فاتیمە."

**حەزرەت**

***

"تۆ ببە بە جاریە بۆ عەلی، تا ئەویش ببێت بە کۆیلە بۆ تۆ."

**حەزرەت**

***

"فاتیمە پارچەیەکە لە من."

**حەزرەت**

***

"هاوسەری باش کێیە یا ڕەسول الله؟"

"ئەو ژنەیە کە مێردەکەی تەماشای کرد، دڵی بکرێتەوە."

**حەزرەت**

***

"ئەی فاتیمە! ئایا تۆ دڵخۆش نیت بەوەی شاژنی ژنانی بەهەشتی!"

**حەزرەت**

***

"دوو ئەمانەتی گەورەتان بۆ جێ دەهێڵم، هەتا ئەو ڕۆژەی بیانپارێزن، تووشی لاڕێ نابن؛ ئەوانیش کتێبەکەی خودا و ئەهلی بەیتەکەمە."

**حەزرەت**

***

"هەرکێ فاتیمەی کچمی خۆش بوێت، منی خۆش ویستووە، هەرکێ دڵی ڕابگرێت، دڵی منی ڕاگرتووە و ئەوەی دڵتەنگی بکات، منی دڵتەنگ کردووە. فاتیمە پارچەیەکە لە من، هەرکێ بیڕەنجێنێ، منی ڕەنجاندووە و هەرکێ من بڕەنجێنێ، خودای ڕەنجاندووە."

**حەزرەت**

*** 

نەبی دەستی فاتیمەی کچی گرتبوو و دەیفەرموو:

"ئەوەی ئەم کچەم دەناسێت، با باش بیناسێت

بە ئەوەشی دەناسێنم کە نایناسێت.

ئەو کچی موحەممەدە،

پارچەیەکە لە دڵی من،

گیانی منە و

ئەو ڕۆحەمە کە لە هەردوو لاوە بە گیانم دەورە دراوە، ئەوەی ئازاری ئەو بدات، ئازاری منی داوە و هەرکێش ئازاری من بدات، ئازاری خودای داوە."

**حەزرەت**

***

" کە لە کۆتایی ڕۆژێکی ماندووکەردا دەگەڕامەوە ماڵەوە، بینینی ڕوخساری فاتیمە هەرچیی خەم و ناڕەحەتیمە دەیڕەواندەوە."

**حەزرەتی عەلی**

***

نزای فاتیمه:

يا حي يا قيوم برحمتك أستغيث، أصلح لي شأني كله، ولا تكلني إلى نفسي طرفة عين.

***

"سلاو له عەلیی خاوەنی شمشێری زولیفیقار و فاتیمەی گوڵی زەهرا."

***

حیکایەتێکی ناوازەی دیکە زۆر بە ورد و درشتی دەنووسرایەوە...
حیکایەتی عەلی و فاتیمە، کە وەک داستانێکی قەدیم و میراسێکی بێوێنە دەمایەوە بۆ نەوەکانی داهاتوو.

***

ئەی زەهرا! ئەی ئەستێرە! ئەی خۆشەویست!
تۆ نەبوویتایە لە ڕازی عەشق حاڵی نەدەبووین، موحیببەتی موحەمەدیمان نەدەزانی، نەماندەزانی بێئەوی مەرگە! تۆ نەبوویتایە دڵەکان لە شەوانی بێئەستێرەدا ئاراستەیان ون دەکرد و لە سەرمادا هەڵدەلەرزین، هۆنراوەی ژنبوون بێ قافیە و سەروا دەبوو، ئاوازی دایکایەتی پەرشوبڵاو و هۆنراوەکان نیوەناچڵ دەبوون...

# گرنگ

تـەواوی ڕووداوەکان، کـە دەربـارەی کەسـیاتییە قەدیمـەکان باسـیان لـێ کـراوە، لـە سـەرچاوەی فەرمـوودەی دروسـت و مێژووییـەوە وەر گیـراون.

وێنـاکان و دەربڕینـی هەسـت وسـۆز و دەسـتەواژەکان وێنەدانـەوەی تایبەتـی دونیـای ناوەکیی نووسـەرە و بە مەبەسـتی نـەرم و ناسـک بەڕێوەچوونـی چیرۆکەکـە بـەکار هێنـراون.

هەڵبـەت کاتێکـی زۆر کەوتووەتـە نێوانـەوە و تەپوتـۆز و تەمێکـی زۆر لەسـەر زەمـەن نیشـتووە و ئەسـتەمە ڕووداوەکان کتومـت وەک خـۆی بـە ئێمـە گەیشـتبێت.

لـە کۆتاییشـدا هەمـوو کەموکورتییـەکان لـە ئێمەوەیـە و لێخۆشـبوون و بەزەییـش لـە خـوداوە.



# بەشی یەکەم

# فریشتەکەی فاتیحە بوو فاتیمە

«بە ناوی خودای میهربەخشی میهرەبان.
ستاییش بۆ خودای خاوەن جیهانیان.»
(فاتیحە، ١-٢)



# فاتیمەی گوڵی زەهراء

مەدینە...

یەکەمین پرشنگەکانی بەرەبەیان بوو...

خۆری ئاڵتوونی قومی لە یەکەمین ساتەکانی ڕۆژ دەدا...

بوون بە جۆشوخرۆشێکی شیرینەوە دەستی دەکرد بە ڕۆژێکی نوێ و چۆلەکەکان بەدەم جریوەجریوێکی شیرینەوە دەفڕین و بەنێو دارخورماکانی مەدینەدا گەنجێکی جوامێر بەسەر پشتی حوشترە سپییە چاوبەکلەکەیەوە ڕێی دەکرد.

لەژێر فێنکایی سێبەری دارخورماکانەوە ڕێی دەکرد و تاکە فیکر هۆشی داگیر کردبوو، یادی کۆتا پێغەمبەر و کچەکەی بوو...

فاتیمە... کەدڵی نەدەهات نێوی بهێنێ و هەر لەگەڵ ناوهێنانیدا تک-تک عارەق بە ناوچاویدا دەهاتە خوار.

عەلی! بەوپەڕی ڕەوشت و شکۆوە ڕێی دەکرد... پڕ لە جۆش و مەراق و موحیببەت ڕێی دەکرد...

بیری دەکردەوەوە، چۆن ڕووی بێت تەماشای چاوی کۆتا پێغەمبەر بکات! چۆن پێی بڵێت! چۆن داوای گوڵەباخەکەی لێ بکات! مووچڕکەیەک بە گشت گیانیدا هات، لەپی دەستی

عارەقی کردەوە و دڵی وەک ئەوەی کەوتبێتە ناوەڕاستی گەردەلوولێکەوە، خێرا لێیدەدا و بەو حاڵەوە ڕێی دەکرد.

ئاسان نییە بوون بە یاری ئەو فاتیمەیەی بە خوو و ڕەوشت و شکۆی ناوبانگی دەر کردووە، بەڵام هەرچی بێت، دەبێت هەوڵی خۆی بدات، چوونکە بوون بە هاوڕێگای خانمێکی لەو جۆرە، بەختیارییەکی پێناسەنەکراو بوو.

فاتیمە گەورەییەکی نەبڕاوە و دڵدانەوەیەکی هەتاهەتایی ژیان بوو بۆ ئەو کەسەی دڵی دەبردەوە... خانمێ بوو بە هەرجێیەکدا دەڕۆیشت، دەبوو بە گوڵشەن، کانیی حەیاتی گوڵستانی پێغەمبەر بوو، نەرم-نەرم دەڕژایە ژێر گوڵەکانی و ئاوی دەدان و سەوزی دەکردن و نەشونمای پێ دەبەخشین.

دڵی ئەو جوامێرەی جەنگاوەری گەورەی جیهان شمشێریان لەبەرامبەردا دادەنا، قووڵپێکی ئەوینی دا و گوڵە شاراوەکەی نێو دڵی چەکەرەیەکی دیکەی کرد و بەئەسپایی ناوی ئەو گوڵە شاراوەیەی نێو دڵی هێنایە سەر زار:

"فاتیمە؛ گوڵی زەهرا!"

مرۆڤ بوو ئیدی! هەڵگری گەورەترینی نهێنییەکان و حەشاردەری قووڵترین پەنهانەکان بوو.

عەلی لەژێر ڕکێفی هەزاران بیروبۆچوون و هەست و سۆزدا بوو، کە بەردەوام لە چەندین لای جیاوازەوە تەوژمیان بۆ دەهێنا، ڕێکردن بە کەناری ئەو دەریایەدا بوێرییەکی بێوێنەی دەویست، بەڵام عەلی بیری لە سەرچاوەی ئەو دەریایە دەکردەوە کە بەرەوڕووی دەڕۆشت، بەمەش ڕۆشتنەکەی

خێراتر و خێراتر دەکرد، نە ئاگای لە گەرما، نە ماندوویتی و نە تینوویتی بوو و لە زەینیدا گەردەلوولێک هەڵی کردبوو و لە ڕۆحیدا جیهان هەڵدەسووڕا و لە دڵیدا قیامەتێکی ناکات هەستابوو. شەرم و نادیاری و شادی لێ تێکەڵ ببوو، مرۆڤ دەکرا لە یەک ساتدا چۆن هەموو دونیای لێ بگۆڕێ و عەلی چەند بێئاگا لە خۆی هەموو ئەم هەستانەی بۆ دروست ببوو...!

***

دووەم ساڵی کۆچ هەر لە سەرەتاوە نەسیمی خۆشی و شادیی لەگەڵ خۆیدا هەڵکردبوو، هەر ڕۆژێکی نوێ کە هەڵدەبوو، مژدەیەکی نوێی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا و لەو ڕۆژانەشدا چاو و دڵی هەمووان لەسەر گوڵەباخەکەی ڕەسول بوو.

کەسانێکی لەڕادەبەدەر بە خەیاڵی ئەوەوە دەهاتن و دەچوون ببنە زاوای سەروەری پێغەمبەران و ببنە هاودەم و هاوبەشی گیان و نور و خوێنی و لەپاش ئەوەی عوتبە و عوتەیبەی دەستگیرانی کچەکانی دیکەی پشتیان لە ڕەسول کردبوو، هەمووان زۆر دەترسان خۆشەویست جارێکی دیکەش دڵی بشکێ و لە هەمان جێگەی هەستیارەوە ئازار بدرێ و بەدەم ئاهی قووڵەوە دەیانگوت:

"نەبا فاتیمە بکەوێتە دەستی قەدرنەزانێک، ڕەسولەڵلا زۆر دڵی دەشکێت."

لە لایەکی دیکەشەوە گەورەپیاوانی عەرەب، کە هەر لەمێژە لایان وا بوو، کچانی کەسە دیارەکانی کۆمەڵگا

دەبێت هاوسەرگیری لەگەڵ هاوشانی خۆیاندا بکەن و پێچەوانەی ئەوەیان بە هەموو جۆرێک ڕەت دەکردەوە و ئەم بیروبۆچوونانەیان لەدوای ئیسلامیش لەگەڵدا بوو و هەمووان هاوڕا بوون لەسەر ئەوەی فاتیمەی کچی بچووکی پێغەمبەر دەبێت هاوسەرگیری لەگەڵ یەکێک لە گەورەپیاوانی خۆیاندا بکات و لەم ڕووەشەوە پێیان وا بوو ئاسان دەتوانن پێغەمبەر قاییل بکەن، چوون خاوەنی ناو و ناوبانگ و ماڵ و سەروەتی زۆر بوون و زەینەب و ڕوقیەش هاوسەری دوو پیاوی هاوشێوەی خۆیان گەورە و ناودار بوون... بێئاگا بوون لەوەی دەوڵەمەندی و بنەچە و جوامێری بەس نییە و هەندێک وردەکاریی ناسک و ورد هەبوون، کە نە دەیانبینی، نە هەستیان پێ دەکرد و چەند کەسێکی کەم ئاگاداری بەهای قووڵی ڕۆحی فاتیمەکەی پێغەمبەر بوون، کە چەشنی ئەستێرەی سورەییا، لە هەموو ڕوویەکەوە ئەوەندە پرشنگدار بوو، دەیتوانی شەوێکی تاریک بۆ چەند ڕێبوارێکی ونبووی بیابان ڕووناک بکاتەوە.

کچەکانی دیکەی پێغەمبەریش گەلێک بێوێنە و ناوازە بوون، بەڵام ئەودیو ناوازەش هەیە، ئەوان خونچەی گەشاوەی گوڵستانی پێغەمبەر بوون و فاتیمە گوڵەباخەکەی، ئەوان کانیی نێو ماڵی ڕەسول بوون و فاتیمە دەریاکەی، ئەوان ئەستێرەی درەوشاوەی ماڵی خۆشەویست بوون و فاتیمە هەتاوەکەی و هەڵەی هەمووان لەوەدا بوو، لە ڕووی ماددی و بە چاوێکی دونیاییەوە لە بابەتەکەیان دەڕوانی و ئەم وردەکارییانە دەکەوتە ناوچەی کوێریانەوە و زۆر لەودیو توانای چاوی سەری هەموویانەوە

بوو، ئەو مەقامی بینینە جێی ئەوانە نەبوو کە یارییان بە ئاڵتوون و درهەم دەکرد و ئەوەی وای کردبوو هیچکەس شایستەی فاتیمە نەبێت، پەیوەندیی بە جوانچاکی و دەوڵەمەندییەوە نەبوو، بەڵکوو پەیوەندیدار بوو بە جوانیی ناوەکییەوە.

دەبووایە دینداری و تەقوا و ئیمان و دڵسۆزییەکەی شایستە بە ئەو بێت، دەبووایە کەسێ بێ تێکەڵ بە تاوان نەبووبێ، هاوەڵی بۆ خودا پەیدا نەکردبێت و مەرد و پاک بێت، کەسێ نەفەس و هەناسەی جوبریلی بەسەرەوە بێت، لە یەکەم دڵۆپەکانی وەحیی نۆشیبێت...

هەرچیی زەنگین و ناودار و گەورانە، یەک-یەک لە دەرگای پێغەمبەریان دابوو و وەڵامی ئازیز هەمیشە هەمان وەڵام بوو:

"چاوەڕێی فەرمانی خودابیم دەربارەی فاتیمە."

کەسێک هەبوو لەودیو ماڵ و سامان و ناوبانگ و بنەچەوە و پێغەمبەر چاوی لەسەر ئەو بوو، کەسێک بوو کە ناوەکەی لە خودی خۆشی دەشاردەوە و هەتا ڕەزامەندیی خودای لەسەر نەبووایە، نەیدەتوانی ناوی بهێنێت.

عەلی... ئەو پیاوەی داستانی جوامێریی نووسیبوویەوە... ئەو گەنجەی بە ڕۆیشتنی زەوی، ژێر پێی دەلەرزاند... ئەو جەنگاوەرەی بە ئیمان و داناییەکەی دوژمنی دەتواندەوە... ئەو کەسەی ئەوەندە ئیمانێکی سەنگین و نالەرزۆکی هەبوو، دەیوت: "گەر پەردەی غەیبیش لا ببرێت، یەقینم لەمە زیاتر ناکات." گیانی خۆی لەپێناو خۆشەویستەکەی خودادا دانابوو و باکی بە هیچ کۆسپ و بەربەستێک نەبوو.

ئەو عەلییەی کە وەک خۆی دەیگوت، گەر پەردەی غەیبیش لا بدرایە و هەرچیی شتە بەئاشکرا و بە چاوی سەر ببینرایە، زەڕەیەک لە یەقین و ئیمانی نە زیادی دەکرد، نە کەم، تا بڵێی دڵسۆز و شکۆدار و خاوەن قسە و بەڵێنی خۆی بوو و ئەم گەنجە دڵگەشاوە و ناوپاک و جوامێرە بیستەکانی تەمەنی بەڕێ دەکرد و باش دەیزانی بەرەو کوێ دەچێ و ڕووگەی دیار بوو. کەسایەتییەک بوو زیرەکی و ژیری و جوامێریی لە هەمان جەستەدا کردبوو بە هاودەم و تەختی خۆی لە دڵی هەمووانـدا بونیاد نابوو، نوری چاوی پێغەمبەر و چاوگی بوێری و مەردایەتی بوو و هەم داستانی قارەمانیی دەنووسییەوە و هەمیش تا بڵێی خاکی و سادە بوو، سەیرکردنە تیشکئاساکانی دەنایە سەر هەرشتێک قووڵ-قووڵ لێی ورد دەبوویەوە، وەک بڵێی بینووسێتەوە، یاخود بیخوێنێتەوە و هالەیەکی ڕووناکی بەدەورەوە بوو و شکۆدار و سامناک بوو. چاوە ڕەشە قەترانییەکانی دەتوت سەر بە جیهانێکی دیکەن و لەوێوە تەماشا دەکەن، قووڵ و ورد و نەرمونیان... بە بیرتیژی و ڕەوشتی جوانیشی ببوو بە جێی سەرنج و مانگی دانایییەکی بێسنوور لە ناوچاوی پانیدا دەدرەوشایەوە و هەرگیز نهێنیی دانایییەکەی نەدەدا بەدەستەوە، دەتوت لەنێو چاوە ڕەشەکانیدا مۆری چەند گەنجینەیەکی شاراوە حەشار دراوە.

عەلی شانی پان و بە قەدوقیافەت و ڕێکردنی پڕ سام و شکۆ، دڵی تەماشاکەری دەلەرزاند ڕۆیشتن و هەنگاوەکانی...

بە گشت حاڵ و ڕەفتارێکیدا دیار بوو کە بە پەروەردەیەکی تایبەتی و ورددا تێپەڕیوە و کاروباری ڕێکوپێک و بێخەوش و خاوێن بوو و هەرچی دەگوت، ڕاست و دروست و مانادار بوو. پێکەنینە قووڵ و بەشکۆکانی متمانەی بە بەرامبەر دەبەخشی و هەتا ئەو ڕۆژە ناوی لەنێو هیچ ڕووداوێکی نەخوازراودا نەهێنرابوو و بەمەش تاجی شکۆی نابوویە سەر ناوی بەرز و ناوبانگی پاکی. دوور بوو لە هاوەڵدانان و خاڵی بوو لە بێباوەڕی و عەشق و فیداکاریی ڕێی حەقیقەتی لێ دەر بچێت، هیچ ئامانجێکی دیکەی نەبوو.

لەگەڵ فاتیمەدا دوو قوماشی تایبەتی دەستکردی هەمان قوماشفرۆشی شارەزا و هەمان دوکان بوون و ڕۆحیان لە هەماهەنگی و گونجانێکی نهێنیدا بوو...

دوو دڵی لاو و گەنج بوون، کە وەک یەک دەیانڕوانی و هەمان وردەکارییان دەبینی، فاتیمە و عەلی...

یەکەمین بەختیارەکانی ژێر بارانی وەحی بوون و دڵی لە سەدای خودا هەڵلەرزیویان لەسەر هەمان ئاواز و ڕیتم لێی دەدا و ئاسۆیان بە دەنگ و نەفەسی پێناسەنەکراوی وەحی فراوان کرابوو و لەنێو هەمان بازنەی جۆشوخرۆش و عەشقدا هاودەمیی یەکدیان کردبوو و چەند ساڵێکی تەمەنیان بۆ بەفیڕۆدانی ساتێک، بەیەکەوە لە ڕێی نووردا دانابوو و تەمەنی شیرینی منداڵی و گەنجییان لەو پێناوەدا دانابوو، نە گەنجێکی دیکەی وەک عەلی مەرد و نە شۆخێکی دیکەی وەک فاتیمە چاوی بە دونیا هەڵنەهێنابوو!

ئـەو نـاوەی پێغەمبـەر لەنێـو دڵیشـیدا وەک نهێنـی حەشـاری دابـوو، لـە عەلـی زیاتـر کەسـی دیکـە نەبـوو. عەلـی، کـە یەکێـک بـوو لـەو سـێ کەسـە یەکەمینـەی پەیمانـی موسڵمانبوونی دابـوو، عەلـی نـوری چـاو و سـێیەمینی ئـەو سـێ کەسـە و لـە کاتێکـدا ڕەسـولی ئەنبیـا ئـەوی بـۆ فاتیمەکـەی دانابـوو، ئـەو بێخەبـەر بـوو لـەم نهێنییـە ئەفسـووناوییە. خۆشەویسـت بێدەنـگ بـوو و نەیدەویست نهێنییەکـەی لای هیچکەس بدرکێنێ و ئـەم حاڵەشـی سـەرنجی چـواردەوری ڕاکێشـابوو، پـاش ئـەوەی هەرچیـی خـاوەن مـاڵ و نـاو و کەسـایەتییە وەڵامـی نەخێریـان وەر گـرت، دەیانـوت: "حاڵی بووین! فاتیمەی بۆ عەلـی دانـاوە، چـوون تەنهـا ئـەو مـاوە لەنێوانمانـدا نەچووبێتـە داوای."

"گەر وایە، بۆ عەلی نایەتە پێش!"

"بڵێی لەبەر چی بێت!"

"ڕەنگە بوێریی نەبێت!"

"تۆ بڵێی بـە فیکریدا نەهاتبێ؟ بـا بچین قسـەی لەگـەڵ بکەین، بیـری بهێنینـەوە، ڕێـی نیشـان بدەیـن، هانـی بدەیـن، ئـەم کارە کاری دواخسـتن نییـە."

هاوەڵانـی عەلـی ملـی ڕێیـان گـرت و هەواڵـی عەلییـان پرسـی و سـۆراغیان کـرد و بۆیـان دەر کـەوت لـە ئاودانـی خورماکانـە و بێ ئـەوەی هیـچ کات بەفیـڕۆ بدەن، بـەرەو بێسـتانی خورمـاکان بـەڕێ کەوتـن. عەلـی لەژێـر ئاسـمانی مەنـگ و بـەدەم ئـاوازی جریـوەی چۆلەکەکانـەوە بێئـاگا لـە گشـت شـتێک خەریکـی ئاودانـی خورمـاکان بـوو و زۆر چێـژی لـە ئاوبەبەرداکردنـی

ڕەگە وشکەکان دەبینی و لەناکاو گوێی لە حیلەی چەند ئەسپێک بوو و حاڵی بوو چەند کەسێک بەرەو لای ئەو دێن و وریایانە بەنێو ئەو جۆگە ئاوانەی بۆ دارخورماکانی دروست کردبوو، هەنگاوی نا و ئاوڕی دایەوە و سێ هاوەڵی بینی بەرەو ڕووی دەهاتن، سەعدی کوڕی مەعاز و عومەر و ئەبوبەکر، شڵەژانێکیان پێوە دیار بوو و عەلی سەری سووڕ ما کە بەو جۆرە بینینی، هەرسێک سڵاویان لێ کرد و لەپاش ئەحواڵپرسی، دەستبەجێ چوونە نێو بابەتەکە و سەعد گوتی:

"ڕەسولەڵلا ئێمەی بە شایستەی فاتیمە نەبینیوە بۆ هاوسەرگیری و لە من وایە ئەم بابەتە نهێنییەکی قووڵ لەخۆی بگرێت."

عەلی بە زەردەخەنەیەکی گەرم و شکۆدارەوە تەماشای هاوڕێکەی کرد و وەڵامی دایەوە: "هەڵبەت وای بە باش زانیوە و ئەو باشتری لێ دەزانێت." کە بینییان ئەوەندە ئارام و بێئاگا وەڵامیان دەداتەوە، گوتیان: "لە ئێمە وایە چاوەڕێی تۆ بێت بچیتە پێش!" عەلی وەک بڵێی گوێی لە گرمەیەکی کاسکەر بووبێ، ڕاچڵەکی و گوتی: "شتی وا چۆن دەبێت!"

"زۆریش جوان دەبێت! ئەو ئەرکەی سپاردووە بە تۆ ئەی عەلی، دەی هەستە و هەر ئێستا بڕۆ!"

"بۆ وەستاوی! بڕۆ!"

عەلی بە هیچ جۆرێ چاوەڕێی پێشنیاری لەو جۆرە نەبوو و دەتگوت لە کێوێکی بەرزەوە تاڤگەیەک ئاو بەسەریدا ڕژاوە و بەواقوڕماوی وەستابوو و زۆریش شەرمی دەکرد

و گوێچکەکانی لە تەریقیدا سوورسوور ببوونەوە و بەدەم خۆیەوە دەیگوت:

"ئێوە دەڵێن چی! چی دەڵێن!"

"گونجاوترین دەڵێین، ئەی عەلی."

پاچ و خاکەنازەکەی دەستی دانا و چوونە ژێر سێبەری کەپرەکە و گوتی: "داوای شتێکم لێ دەکەن، کە تا ئێستا حەدم نەبووە بیریشی لێ بکەمەوە! کارێکی ئەوەندە ئاسان نییە، چۆن شتی وا دەبێت!"

"ئاسان دەبێت، بە ویستی خودا!"

"گەر ڕەتم بکاتەوە، ناتوانم تا هەتایە تەماشای ڕووی حەبیبوڵڵا بکەم."

عەلی زەردەخەنەیەکی کرد، زەردەخەنەی مرۆڤێک کە لەپێش هەمووانەوە گوێبیستی ئاوازی کزی نێو ژیان دەبێت و لەپێش هەمووانەوە وردەکارییە ناسکەکانی ژیان دەبینێت... زەردەخەنەی ئەو مرۆڤە هەستیارەی لەژێر ئەو تاکوتەرا دڵۆپە بارانانەی کەسی دی هەستی پێ ناکات، تەڕتەڕ دەبێت!

بە دەنگی گڕی عومەر هاتەوە سەر خۆی: "ڕەتت ناکاتەوە، من وای دەبینم پێغەمبەری خودا فاتیمەی لە چاوەڕوانیی تۆدا داناوە." بارودۆخی دژواری ژیان وەک چاڵی قووڵ لە بەردەم عەلیدا هەڵکەنرابوون و دەیگوت: "ئێوە دەڵێن چی، من گیانفیدای گیان و ماڵی ئەوم و لەگەڵ ئەو گەورە بووم، چۆن ڕووم بێت داواکاریی لەو جۆرە بکەم! سنووری خۆم دەزانم."

یەک-یەک ڕوونکردنەوەی پڕ نیگەرانییان بۆ ڕیز کرد:

"ئەی عەلی! قورەیش لە گشت سات و کاتێکدا لە کەمین و بۆسەی نوێدایە بۆ پێغەمبەر و تۆش ئەمە باش دەزانی ئەی عەلی، دەترسین لەو ڕێیەوە ئازاری پێغەمبەر و خانەوادەکەی بدەن."

"شتی وا چۆن دەبێت! من چۆن بچمە داوای فاتیمە!"

سەعد وەڵامی دایەوە، "بۆچی؟ لەنێو هەمووماندا تۆ لەهەمووان گونجاوتری."

"پێشەکی و لە هەمووی گرنگتر، باری داراییم ئەوەندە باش نییە، دواتریش من شەرم دەکەم داخوازیی لەو جۆرە لە ڕەسولەڵڵا بکەم!"

سەعد بە دەنگێکی ورەبەخشەوە وەڵامی دایەوە: "ئەی عەلی، پێغەمبەر زۆر تۆی خۆش دەوێت، شەرم مەکە! بچۆ داوای فاتیمەی لێ بکە."

نەیدەزانی بڵێ چی، سەری سووڕ مابوو و دەستی بە کۆتا بەهانەوە گرت و دووپاتی کردەوە: "من پارەم بەشی بەڕێوەبردنی خێزانێک پێ نییە و ئێوەش دەزانن ئەو توانایەم نییە."

وەڵامیان دایەوە: "مەترسە، بڕۆ داخوازیی بکە! لە هەموو ڕوویەکەوە هاوکارت دەبین."

بەڵام بیرکردنەوەکانی ئارامییان لێ بڕیبوو: "هەتا ئەم ڕۆژە گیانی پێغەمبەرم لە هیی خۆم ئازیزتر بینیوە و پاراستنی گیانی دانیشتووانی پیرۆزی نێو ماڵەکەیم لەئەستۆ گرتووە و هەرگیز بە جۆرێکی دیکە بیرم لێ نەکردوونەتەوە، ئێستا

چۆن ئەم داخوازییە بۆ خۆم ڕوون بکەمەوە! دواتریش..."
کەمێک وەستا و بیرکردنەوەکانی یەک-یەک هێرشیان بۆ هێنا و عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفی گەورەبازرگانی مەککەی هاتە بیر، کە بڕی سەد حوشتری چاو شینی بارکراو بە قوماشی ئاوریشم و نەخشدار و ئەڵماس و دە هەزار دیناری بە مارەیی دابوو بۆ داخوازیی فاتیمە و پێغەمبەر ڕەتی کردبوویەوە و بیری دەکردەوە ئەم بە چ ڕوویەکەوە لێی بچێتە پێش! لەنێو ئەم گێژاوی بیرکردنەوانەدا نوقم ببوو، کاتێک بە دەنگی گڕی هاوەڵەکانی هاتەوە سەر خۆی: "ئەی عەلی! گەر ڕەسولەڵڵا چاوی لەسەر ماڵ و سامان بووایە، ئەوا دەیدا بە یەکێک لە ئێمە، بەڵام دیارە ئەوە مەبەستەکەی نییە، ئیدی شەرم لە چی دەکەیت! هەستە بڕۆ!"

"پەلە بکە!"

"مەترسە، بڕۆ!"

"دەی بڕۆ!"

"عەلیی حەیدەر!"

"عەلیی جوامێر!"

"عەلیی یار!"

"عەلی گیان..."

نەیدەتوانی پشت بکاتە ئەو هەموو هاندان و سووربوونەی هاوەڵانی و دەنگی ناوەکییشی بەرەو هەمان ئاراستە پاڵی پێوە دەنا و خودای کرد بە یار و یاوەر و گوتی:

"توكلت على الله!"

گەرچی پێیەکانی ئەو شێرەی لە مەیدانی جەنگدا بواری بەرامبەری نەدەدا هەنگاوێک بنێ، لە شەرماندا دەلەرزی و بەرەو دواوە پێی هەڵدەنا، بەڵام هەوڵی دا ورە بداتە بەر خۆی و بەوپەڕی شەرمەوە ملی ڕێی گرت.

زەینی پڕ بوو لە نیشانەی پرسیار و هۆشی لە حەبیبوڵڵا و دڵی لە فاتیمە و ڕوخساری لە شەرم و بە هەنگاوی قورس و هەزار بەربەستەوە ڕێی دەکرد، بۆچییەکان و چۆنەکان لە پێی ئاڵابوون. ڕەسولەڵڵا بۆ ئەو جەنگاوەر و گەورەپیاوانەی ڕەت دەکردەوە؟ ڕێی دەکرد و لە گشت لایەکەوە پرسیاری بێوەڵام تەنگی پێ هەڵچنیبوو.

گەر دڵ مەیدانی جەستە بێت، ئەوا گشت حاڵێک کە بەسەر جەستەدا دەهات، سەرەتا لەو مەیدانەوە دەستی پێ دەکرد! عەلی لە ماوەی چەند لەحزەیەکدا دڵی بە چەندین هاوین و زستان و گوڵستان و خەزاندا تێپەڕی، تا قووڵتر و وردتر لە بابەتەکەی بڕوانییایە، گەرما و سەرما و زوقم و بۆن و ئاواز و خەمی ئیقلیمەکانی نێو دڵی زیاتر دەچەشت.

هەنگاوەکانی خێراتر و خێراتر دەکرد... خێراتر... جڵەوی هەستەکانی بەدەست خۆیەوە نەمابوو و خەریک بوو پێی هەڵدەکەوت، هەنگاوەکانی بەرەو دواوە ڕایان دەکێشا و وەک بڵێی هەنگاوێک بەرەو پێش و دانەیەک بەرەو دواوە بڕوات و لە جێی خۆی بوو.

ئاە لەو حاڵی شەرم و حیجابەی تێیدا بوو... ئای لەو حاڵەی شەرحی بۆ نەبوو... ژاوەژاوێکی زۆر لەنێو سەریدا دروست بووبوو و دەنگی هاوەڵان لە گوێیدا دەزرنگایەوە:

"ئەی هاوار بۆ وەستاوی؟ بڕۆ! پەلە بکە، بڕۆ!"

"فاتیمە گیانی گیانانی ڕەسولەڵڵایە، چۆن داوای خۆشەویستترینی خۆشەویست لە خۆشەویست بکەم خودایا!"

دڵی عەلی بووبووە مەیدانی گەردەلوول و ڕەشەباگەلێکی بەهێز، ئاسمان بەسەر زەویدا و زەوییش بەسەر دڵی عەلیدا دەیگرماند، سەربازە مەردەکەی جەنگ بۆ یەکەم جار نەیدەتوانی هێرش ببات! بۆ یەکەم جار نەیدەزانی چی بکات و چی بڵێت! چەند سەختە... داخوازی خۆی لە خۆیدا سەختە... جا داخوازیی فاتیمەکەی پێغەمبەر گیان! دڵی کزەیەکی کرد، خودایە ئەم دڵەرزینە چییە! شەرمی دەکرد و سەری سوور مابوو لەوەی چۆن بەو حاڵەوە دەتوانێت هەنگاو هەڵبنێت، شەیتان لە گشت لایەکەوە هێرشی بۆ هێنابوو دەیویست پاشگەزی بکاتەوە و گلەیی ناوەکیی عەلی بەردەوام بوو:

"نابێت! نا نا، نابێت! چۆن داخوازیی لەو جۆرە بە حەدی خۆتی دەزانی!"

"ئەمە چ بوێرییەکە! چۆن دەتوانیت بچیتە داوای گوڵەکەی ڕەسول!"

"بە کەسانی وەک عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودی فەرمووە نەخێر و دڵی نەهاتووە فاتیمە بدات بە کەس، ئێستا دەیدات بە تۆ!"

عەلی بێئاگا لە هەموو شتێک، فڕێ درابوویە نێو چەقی ئەم هەموو هەستە و لەگەڵ حوشترە گوێڕایەڵەکەیدا بەنێوان باخوباخات و حوشترەکان وماڵەکان و دەنگەکان و ڕەنگەکاندا

ڕێی دەکرد و فیکر و هۆشی ئاڵۆز و پڕ بوو لە لێپێچینەوەی قووڵی خۆی.

ژیان وەک تاڤگەیەکی بەخوڕ وا بوو لە لووتکەی کێوێکی بەرزەوە بڕژێتە خوارەوە و ژیانی ئینسانیش وێستگەی خەم و خۆشی بوو، عەلی ئەو ڕۆژانەی هاتەوە یاد کە دوای بردنەوەی جەنگی بەدر و لەو خۆشییەدا هەواڵی مەرگی ڕوقیەیان پێ گەیشتبوو، فاتیمە لەتەنیشت گۆڕی خوشکەکەیەوە دانیشتبوو و بەخوڕ دەگریا و باوکی خۆشەویستی بە لێواری جوبەکەی فرمێسکەکانی دەسڕی و ئەو کات عەلی زۆر دڵی بەم دیمەنە شکابوو و هەرگیز ئەو دیمەنەی لەیاد نەکردبوو و ئێستا بیری دەکردەوە، کێ دەتوانێ لە ڕۆحی ناسکی ئەو کچە گەنجە تێبگات کە فرمێسکەکانی بە لێواری جوبەکەی خۆشەویستی جیهانەوەن، جگە لە خۆشەویست خۆی؟ بیرکردنەوە و هەستەکانی هەنگاوبەهەنگاو قووڵتر دەبوونەوە و هەنگاوەکانی قورستر و قورستر و لێدانی دڵی خێراتر دەبوو. خودا هاوار، بۆ لای کێ دەچوو؟ بۆچی دەچوو؟ چۆن پێی دەگوت؟ بیری لەم پرسیارانە دەکردەوە و دوو ئەوەندە دەپەشۆکا.

عەلی لەنێو ئەم تەوژمی هەستانەدا ڕەوشتی جوانی فاتیمەی هاتە بەرچاو، فاتیمەی دڵ و چاو گوڵین، ئەو گوڵەباخە تایبەتەی کە ڕەگەکەی لە جێیەکی تایبەتی نێوان ئاسمان و زەوی و بینراو و غەیبدا ڕوابوو و هەرچیی ڕەنگی جیهانە لەخۆی گرتبوو. چەشنی گوڵەباخ جوانییەکەی لە تووەکەیدا حەشار درابوو و هەر وەک ئەو بۆنی خۆش و ڕەنگی جوان و ئاهەنگ و هەرچیی

جوانییە لەنێو خۆیدا جێی دەکردەوە و لە تۆوەکانیدا بەرجەستەی دەکردن. ئەم گوڵە نهێنییەکی هەبوو کە هەموو کەس پەیی پێ نەدەبرد، گوڵەباخ تەنها خۆی نیشانی ئەوانە دەدا کە ئەو نهێنییەیان دەزانی و ئەویش ئەوە بوو کە گوڵەباخی حەقیقی لە نزیکترین جێوە لە ئاسمان دەڕوا، بە ماچی هەورەکان نەشونمای دەکرد و ئەوەندەی دی جوانیان دەکرد و پەڕە پەمەییە ئاڵەکانی ئەستێرەیەکی درەوشاوەیان دەهێنایەوە یاد، تۆوەکانیشی دەتوت هەزاران ئەستێرەن و لەناوەڕاستی پەڕەکانەوە زەردەخەنەیان دەکرد. چاوی سەر هەرگیز لە نهێنیی جوانیی گوڵەباخی حەقیقی حاڵی نەدەبوو و گەر خۆر لە ئاسمان دابەزیبایە و شێوەی گوڵێکی وەر بگرتایە، بێگومان گوڵەباخ دەبوو و بەو هەزاران تۆو و ڕەنگ و ئەستێرە و بۆن و ئاهەنگ و جوانییەی لەنێویدا جێی دەبێتەوە، دڵی مرۆڤەکانی دەلەرزاند، هەر بۆیە بە فاتیمەیان دەگوت (زەهراء) گوڵەباخ، چوونکە گوڵەباخ سیمبولی جوانی و شکۆ و ناسکی بوو، فاتیمەش بەو جۆرە لە ئاسماندا ئەستێرە و لەسەر زەوی گوڵەباخێکی بێوێنە بوو.

ئای ئەو نازناوەی چەندە لێ دەوەشایەوە... زەهراء... زوهرە... زەهرە... فاتیمە...

عەلی هەنگاوەکانی خێراتر کرد، لەگەڵ حوشترە گوێڕایەڵەکەیدا بەنێوان باخوباخات و خانووە دارینەکان و هەیوان و کەپر و منداڵ و ئەسپ و عەتارخانە و قوماشفرۆش و خورمافرۆشەکاندا تێدەپەڕی و جۆشوخرۆشی زیاتر و زیاتری دەکرد و لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا، بە ڕەنگ و بۆنێکی

جیاوازەوە بیری لە فاتیمە دەکردەوە.

ئێستا ئیدی هەر هەنگاوێک کرانەوەیەکی نوێ بوو بە ڕوویدا، بەرەو بیروبۆچوونی نوێ و ئاسۆی نوێ هەنگاوی دەنا. عەلی هەمیشە فاتیمەی وەک مرواریێیەکی نێو دەریاکانی حیجاز و سەرەندیب و عەدەن پاک و ڕوون دەبینی، کە بەردەوام لە خەمی باوکیدا بوو.

فاتیمە خونچە شاراوەکەی نێو دڵی خۆشەویست... کۆتا گوڵی خەدیجە... هەر لە منداڵییەوە جیاواز بوو، پێگەیشتوو بوو، ژیر بوو، بیرتیژ بوو.

بە زیرەکیی لەڕادەبەدەر و ژیری بێوێنەی سەرنجی هەمووانی بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو، فاتیمە گوڵەباخ بوو، بە کەم ڕازی و بە ئیمان ڕازاوە...

گوڵێک بوو وریا و ژیر و بە ڕەوشتی جوان و بیرکردنەوەی عاقڵانە و بیرتیژییەکەی نەشونمای دەکرد، بڵێی لە چماڵێکدا لقوپۆپی دەر بکردایە؟ عەلی بیری دەکردەوە، کەسی بە شایستەی فاتیمە نەدەبینی، تەنانەت خودی خۆیشی! کامە مەرد و پیاوچاک دەیتوانی ئاگای لە فاتیمە بێت و بەسەوزی بیهێڵێتەوە و نەهێڵێت ڕەنگی زەرد هەڵگەڕێت؟ کامە دڵ هاوشانی دڵی جوان و زانستی زۆر و شکۆی بەرزی فاتیمە بوو؟ حاڵی کێ لەئاست شکۆی شاراوەی ئەودا بوو؟ کام دڵ خۆی لەئاست دڵی گوڵستانئاسا و بەهەشتی ئەودا دەبینی؟ دڵی قوڵپی دا و دەنگی ناوەکیی گوتی: "نا، نا! لێی ناچێ، هیچکەس لە فاتیمە ناچێت."

ڕۆژ گەرمتر و گەرمتر دەبوو و عەلی بەدەم بیرکردنەوەکانیەوە، کە لە گشت لایەکەوە هێرشیان بۆ دەهێنا، داخڵی شار بوو، بێ ئەوەی بهێڵێت زیاتر لە زنجیری ڕاڕایی و وەسوەسەی شەیتان بئاڵێت، حوشترەکەی بەستەوە و بە هەنگاوی خێرا بەردەوام بوو، کاتی نەبوو بەفیڕۆی بدات، بەپەلە و پاک خۆی شت و جلەکانی گۆڕی و بۆنی خۆشی لە خۆی دا و کەوتە ڕێ، چوون گەر خۆی دوا بخستایە، زیاتر دەکەوتە نێو وەهم و دوودڵی و ڕێگەی نەدا ئەمە ڕوو بدات و بەرەو ماڵی پێغەمبەر کەوتە ڕێ، تاقیکردنەوەیەکی سەخت بوو و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "لە ماڵەکەتدا گەورە بووم ئەی ڕەسولی خوا، چۆن گوڵەکەت لێ بخوازم!" لە لایەکی دیکەشەوە دەنگی هاوەڵان لە گوێیدا: "پێش ئەوەی بەدخوویەک بێت و بە داخوازیی فاتیمە، وەک کچەکانی دیکەی، ئازاری پێغەمبەر بدات، بڕۆ و داخوازیی بکە عەلی."

سەختترین ڕووبەڕووبوونەوەی ژیانی چاوەڕێی دەکرد، عەلی، شێرە چاونەترسەکەی مەیدانی جەنگ، ئەو ساتە تێگەیشت کە جوامێرانیش عارەق دەر دەدەن، قارەمانانیش دەترسن، شێرەکانیش دەبەزێنرێن...

زەوی دەلەرزی، ئەستێرەکان هەڵدەلەرزەین، با شەرمی دەکرد و بەنێو قژی بەردراوەی عەلیدا بەشەرمەوە دەهات و دەچوو...

ئەو چاوە ڕەشانەی تەماشای هەرکەسێکی پێ دەکرد دای دەچڵەکاند، ئەمێستا نەرم دەیڕوانی، لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا دەکەوتە ژێر لێزمەبارانی پەردەیەکی دیکەی حەیادا، ڕیتمی

لێدانی دڵی بەهێزتر بووبوو، هەناسەکانی کورت و پچڕپچڕ بوون و قاچەکانی لێک ئاڵابوون و عارەقی دەر دەکرد و هەڵدەلەرزی، عەلی... بەسەر دژوارترین و شەرمەندەترین و شاهانەترین ئاسۆدا بەڕاکردن دەچوویە خوارەوە. ئیدی ئەمە ئینسانە، حەوت وەرز و ئیقلیم لە ناخیدا دەگۆڕێت و هەردەمەی سەر لە یەک لەو وەرزانە دەدات... دیسان نەیهێشت خلۆر بێتەوە نێو دۆڵی وەهم و زوو هاتەوە سەر خۆی و ئەو نزایەی کرد کە هەمیشە لەسەر زاری بوو: "خودایە! ئەوەی لە دڵمدایە خێرداری بکەیت بۆم!" دڵی ئارام بوویەوە، گەشت بە سکونەت، وەهمەکانی لاڵ و دڵەڕاوکێکانی کەڕ بوون، بیری کردەوە دەبێت ئێستا خۆشەویست لەکوێ بێت و دوای پرس و سۆراغپرسی، پێیان ڕاگەیاند کە "لە ماڵەوەیە." عەلی بە ناوی خوداوە بەرەو ماڵی ڕەسول دەڕۆیشت و دڵی وەک ئاوی پاک ڕوون و شیرینیی لەگەڵ خۆیدا برد و دڵی لە دەستیدا و دڵی پڕ لە ڕێز و ڕێزی تێکەڵ بە موحیببەت و بە دەستێکی لەرزۆکەوە لە دەرگای ماڵی پێغەمبەری دا و چاوەڕێی کردنەوەی دەرگا بوو...

تەق... تەق... تەق...



## زەمینلەرزەی دڵ

"با نور هاوسەرگیری لە گەڵ نور بکات،
واتا فاتیمە و عەلی بدە بە یەک."

عەلی سێ جار لە دەرگای دا، یەکەمیان ڕەزامەندیی خودای پێ بەدەست هێنا و دووهەمینیان خۆشبەختیی ڕەسول و سێیەمین دڵی فاتیمەی خستە لەرزین... هەرسێ لێدانەکە وەک سێ بازنە لە دڵی عەلیدا گەورە بوون و دەنگیان دایەوە، لەسەر هەرسێ ئاوازی هۆش و ئەدەب و دڵ، ئێستا کە ڕەزامەندیی خودا و خۆشبەختیی ڕەسول و خۆشەویستیی فاتیمەی لە مشتدا بوو، بەئاسپایی هەنگاوێکی بەرەو دواوە نا و چاوەڕێ بوو دەرگای لێ بکرێتەوە، چاوەڕوانییەکی پڕ لە ئارامی و نەرمونیانی و لە ژوورەوە چاوانی ڕەسول، جیاوازتر لە ڕۆژان، دەدرەوشانەوە و بەرەکە بەرەو دەرگاکە هەنگاوی نا و هاواری کرد: "کێیە ئەوە؟"

ئازیز بەنەرمونیانییەوە وەڵامی دایەوە: "دەرگاکە بکەرەوە."

بەرەکە بەسەرسوورمانەوە زەردەخەنەیەکی کرد: "ئەوە کێیە کە پێش ئەوەی بیبینیت، دەتەوێت دەستبەجێ دەرگاکەی لێ بکەمەوە!"

خۆشەویست بە ئەوپەڕی شکۆ و نەرمییەوە وەڵامی دایەوە: "ئەو کەسەی دێت، کەسێکی بودەڵە و هیچ نییە، ئەو ئازیزی من و کوڕە مام و خۆشەویسترین کەسی سەرزەوییە لەلام."

بەرەکە هەنگاوەکانی خێراتر کرد، جوان نەبوو کەسێکی ئەوەندە خۆشەویست لەلای پێغەمبەر لەوە زیاتر لەودیو دەرگاوە چاوەڕوان بێت و هێندە بەهەڵەداوان بەرەو دەرگاکە ڕای دەکرد، قاچی هەڵکەوت، خێرا خۆی ڕاست کردەوە و بە مەراقێکی زۆرەوە دەرگای کردەوە، بەڵێ، خۆی بوو... عەلیی کوڕی ئەبوتالیب، بە سەیرکردنە مانادار و شەرمنەکانیەوە ڕووبەڕووی بەرەکە وەستابوو، بەرەکە بەزەردەخەنەوە پێشوازیی لێ کرد و بردیە حزوری خۆشەویست، عەلی قنجوقیت و بەوپەڕی شەرم و شکۆوە سڵاوی کرد:

"سلام علیک یا حبیب الله."

چاوەکانی خۆشەویست بۆ جاری دووەم درەوشانەوە و عەلی بە هەمان حاڵەوە بەردەوام بوو: "ئاشتی و بەخشندەیی و ڕۆزیی خودا بڕژێت بەسەرتدا ئەی خۆشەویستی خودا!"

"علینا و علیکم سلام، سڵاو و ئارامیی خودا بڕژێت بەسەر تۆشدا ئەی عەلی، بفەرموو دانیشە!"

عەلی هەم شەرمی دەکرد، هەم بێدەنگ بوو، هەمیش خۆشبەخت... تک-تک عارەق بە ناوچاویەوە ڕیزیان بەستبوو و بارانی بەهاریش دڵۆپ-دڵۆپ دەڕژایە نێو دڵی و خونچەی بەهار لە چاوانیدا دەدرەوشایەوە و لە دڵیدا دەنگدانەوەی هەنگاوی پیادەڕەوییەکی هەتاهەتایی دەهات. لە بەردەم خۆشەویستی

هەڵبژێردراودا ئەوەندەی مشتێکی لێ مابوویەوە و لەهەمبەر گەورەیی و شکۆی ڕەسولی ئەکرەمدا دەنگی دەر نەدەهات و زمانی گۆی نەدەکرد و وەخت بوو هەناسەی لێ دەبڕا علیی حیدەر. یەکەم جار بوو بۆ کارێکی لەو جۆرە بچێتە حزور و هەستی دەکرد عەباکەی بەری وەختە لە پشتەوە بیخنکێنێت و لە خودا زیاتر کەسی بەدی نەدەکرد پەنای بۆ ببات و پێڵووی چاوەکانی بەرەو خوار و بیلبیلەکانی لەسەر زەوییەکە گیر کردبوو، وەک بڵێی هەرچیی پەردەی شەرمی جیهانە بەسەر شانیدا درابێت، بێدەنگ دانیشتبوو و نەیدەزانی چۆن داوای گوڵخونچەکەی سەرداری پەیامبەران بکات...

سەرداری دنیای ئاگادار لە هەموو شت، وەک بڵێی ئاوازی لێدانەکانی دڵی عەلیی بەوردی پێوابێت، بە دەنگێکی ناسکتر لە شنەبای بەرەبەیان فەرمووی:

"قسە بکە ئەی عەلی!"

"...!"

"ئارەزووت چییە، پێم بڵێ!"

"..."!

وشەکان دەرگایان لەسەر خۆیان داخستبوو، چی بڵێت! چۆن بیڵێت! چۆن داوای ئەو گوڵە نازەنینە لە ڕەسول بکات، کە هەر پەڕەیەکی نهێنی و ڕازێکی لەخۆ گرتبوو، هەرچیی کرد نەیتوانی بڵێت "فاتمەم دەوێت!" لەوە زیاتر خۆی بۆ نەگیرا و ڕەنگێکی سووری ئاڵی شەرم، کە لە دڵیەوە سەرچاوەی گرتبوو، باڵی بەسەر کوڵم و گوێیدا گرت و لەگەڵ ئەوەی

زمانی حاڵی زۆر شتی وت، بەڵام زمانی سەر بێدەنگ بوو و ناچار هەڵستا و بێدەنگییەکی مانادار و چەند نیشانەیەکی ناسکی لە حزوربەخشترین ماڵی جیهاندا لەدوای خۆی جێ هێشت و ڕۆیشت...

ئەمە چ شەرم و ڕووگیرییەک بوو ئیلاهی... دەیویست ئەوەندە دوور بڕوات، تا هەتایە هیچکەس نەیبینێتەوە، نەیتوانی ئەو فاتمەیە بخوازێت کە تا ئەو دەمە چاوی حەرام لێی نەڕوانیبوو، بە چیدا بزانێت ئەم فاتیمەیە چەندین ساڵە لەبەر ئەو لە چاوی بەد دەپارێزرێت! بە چیدا بزانێت فاتیمە بۆ عەلی هەڵبژێردراوە و ئەو بە شایستەی هەڵدانەوەی چەرشەفی قەدیمی سەر ڕووی بینراوە، لەکوێوە بزانێت ئەم ژنە حۆریئاسایەی ڕۆحی جوانیناسی تەماشاکەر بەخەبەر دێنێ، بۆ ئەو ئافرێنراوە! چۆن بزانێ لە جیهانێکی دیکەوە فەرمان بۆ هەردوو لا دەر کراوە و فاتیمە لە چاوەڕوانیی عەلیدا دانراوە.

نەیتوانی یەک چرکە زیاتر دابنیشێ و بەوپەڕی شەرمەوە خۆشەویستی جێ هێشت و عەلیی حەیدەر، شای مەردان و شمشێری یەزدان، یەکەم جاری بوو لەم چەشنە شەرم و حەیایەدا نوقم بێت و لەگەڵ چوونەدەرەوەدا تەماشای کرد هاوەڵان لە چاوەڕوانیدا وەستاون و دەستبەجێ دەوریان لێ دا و بەمەراقەوە پرسییان: "چی بوو؟ چۆن گوزەرا؟"

بە تەنها یەک ڕستە وەڵامی دانەوە: "نەمتوانی! نەمتوانی تاکە وشەیەکیش بڵێم."

"زۆر ئاسابییە! یەکەم جارە بۆ بابەتێکی لەو جۆرە بچیتە حزوری ڕەسول اللە، هیچ پەشۆکانی ناوێت ئەی عەلی، دەی دووبارە بڕۆرە ژوورەوە و هەوڵ بدە، بڕۆ شەرم مەکە، کۆڵ مەدە، دووبارە هەوڵ بدە!"

عەلی، کە زانیی دەربازبوونی بۆ نییە، بۆ جاری دووەم بە ناوی خودا لە دەرگای دا، بەڵام لێدانی ئەم جارە لە مەقامی بێچارەییەوە بوو، بە ئارەزووی ئەوەی ڕەسولی ئەکرەم وەک پاسەوانی دەرگاکەی قبوڵی بکات، لە دەرگای دا، تەق، تەق، تەق...

دەرگای ماڵە باوانی فاتیمە بۆ جاری دووەم بەرەو ڕووی عەلی کرایەوە و شمشێرەکەی یەزدان چەشنی بەندەیەکی لاواز و بێچارە چووە ژوورەوە و بۆ جاری دووەم لە حزوری خۆشەویستدا دانیشت:

"بفەرموو عەلی! ئارەزوویەکت هەیە؟"

دیسان بەختی عەلی لە وشەدا بێدەنگی بوو! دیسان زمانی بەسترا و تاکە وشەیەکی بۆ نەگوترا و تووشی لەرزێکی سەیر ببوو و چاوەکانی لەسەر لچکی خوارەوەی عەباکەی سەرداری پێغەمبەران گیر کردبوو و پێغەمبەر وەک بڵێی گوێبیستی هەموو ئاواز و هەڵبەزودابەزێکی دڵی عەلی بێت، تەماشای حاڵی پڕ شەرم و شکۆ و ڕەوشتی بەرزی عەلیی دەکرد و کە بینیی هێندە شەرم دەکات و ڕووگیر بووە و نازانێت چی بکات، ویستی کەمێک هێز و ورەی بداتەوە بەر و یارمەتیی بدات و فەرمووی: "لەوە دەچێت بۆ کارێکی گرنگ هاتبیت!

شەرم مەکە! بیڵێ! ئەوەی لە دڵتایە بیڵێ! ئارەزووی چی دەکەی! هەرچیت بوویت بە ئیزنی خودا پێتی دەبەخشین." لە کاتی وتنی ئەم قسانەدا نەفەسی خۆشەویست بۆنی عەمبەر و میسکی بە ژوورەکەدا بڵاو دەکردەوە و لەرینەوەی ژێیەکانی دەنگی ئارامی و دەرمانی بە ڕۆحی بەرامبەر دەبەخشی، هەر بۆیە عەلی لە کۆتاییدا بەو هێزەی ڕەسول پێی بەخشی، هاتە گۆ: " یا ڕەسول الله!"

سەیرکردنەکانی پێغەمبەر وەک تیشک دەبارین بەسەریا و بۆنی بەهارێکی حزوربەخشی بەسەردا بڵاو ببوویەوە و ڕۆحی ئارامی و سکونەتی بەسەردا اباری و وەک بڵێی ڕۆحی کەمێک ئارام ببووبێتەوە، بەردەوام بوو: "دەزانم کە چارەی دەردەدار لای تۆیە، هەرکێ نانی نەبێ، نان و ئەوەی گیانی نەبێ گیان و ئەوەی کاری نەبێ کاری بۆ دەستەبەر دەکەیت! خودای گەورە لەسەر دەستی تۆ خستمیە سەر ڕێی ڕاست و سوێند دەخۆم بە یەزدانی مەزن کە تۆ تاکە گەنجینە و دەستکەوتی دونیا و قیامەتی منی ئەی ڕەسولی خوا! خودای گەورە بە تۆ بەهێزی کردم و گەر عەلی بە شێرەکەی خودا ناوی دەر کردبێ، لە شەرەف و گەورەیی ڕەسولی خوداوەیە."

بێدەنگییەکی شادیبەخش باڵی بەسەر ماڵەکەی ڕەسولدا گرت و بە وتەکانی عەلی، کە بە هۆی تەماشا نەرمەکانی خۆشەویستەوە سوکنایی هاتبوو، هێواش-هێواش ئەو بێدەنگییە دەشکا، بەرەکەی بەتەمەن یەکەم جار بوو پێغەمبەری ئازیز و عەلی لە حاڵ و بارودۆخێکی هێندە تایبەتدا ببینێت و واقی

وڕ مابوو، بەتایبەت عەلی، لە حاڵێکی گەلێ جیاوازدا بوو، لە کاتێکدا دانیشتووانی نێو ماڵە بەختەوەرەکەی ڕەسول لە سووچ و ڕاڕەوەکاندا کەم و زۆر گوێبیستی گفوگۆکەیان بوون، عەلی لە حزوری ئازیزدا چاوی هێشتا لەسەر زەوی، بەڵام ئەم جار بە دەنگێکی زوڵاڵ و بەباوەڕبەخۆبوون و لەژێر پەردەی ناسکی ئەدەبەوە عەرزی حاڵی خۆی کرد: "هێشتا منداڵێکی تازەپێگەیشتوو بووم کە هاتمە لای ئێوە و لە ماڵەکەی ئێوەدا گەورە بووم یا ڕەسول اللە! نە هەستم بە دووریی دایک و باوکم کردووە، نە ماڵەوە و بە ڕەنگاڵەترین ڕەنگەکانی خۆشەویستی و میهرەبانی گەورە بووم، لە ئەو نانەی دەتانخوارد نانتان دامێ و لەوەی دەتانپۆشی جلتان دامێ و پاراستتانم، چاودێرم بوون، خۆشتان ویستم، بە ڕەوشتی بەرزتان پەروەردەتان کردم و بە ڕێنوێنی و بەرەکەتی ئێوە ڕێی ڕاستمان دۆزییەوە. "

حەبیبوڵڵا بەزەردەخەنەوە تەماشای دەکرد، ژوورەکە کشومات و عەلییش ڕوونکردنەوەی گرنگی هەبوو و کۆتا ڕستەی وەک بەردێک هەڵدرابێتە نێو ئاوێکی مەنگەوە، حەڵقەحەڵقە گەورە بوو: "وەک دەزانن تەمەنی هەرزەکاریم تێپەڕاندووە و ئیدی دەمەوێت ماڵێکی ئارام و هاوسەرێکی میهرەبانم هەبێ و لەتەنیشتیدا بحەسێمەوە و دەمەوێت لە ئێوە نزیکتر ببمەوە، زۆر نزیکتر... هەر بۆیە بۆ ئەم کارە هاتوومەتە حزوری ئێوە." کەمێک بێدەنگ بوو و چەند دڵۆپێک عارەقی حەیا لە ناوچاوی پانیەوە تکەی کرد و کۆتا دڵۆپی بوێریی

بەکار هێنا و کەمێک تفی قووت دا و گوتی: "فاتیمە!... فاتیمەم لێتان دەوێت..."

بێدەنگییەکی شیرین کەوتە نێوانیانەوە و ئەو دوودڵی و بێئۆقرەییە نهێنیئامێزەی کەمێک بەر لەوە باڵی بەسەردا کێشابوون، نەما و دەنگ و ڕووناکی و بۆن و تەنانەت هەناسەهەڵمژینی نێو ژوورەکەش ئێستا زۆر جیاواز بوو، ڕەزامەندییەکی شیرین لەسەر ڕوخساری پێغەمبەر دەر کەوت و چاوە لاهوتییەکانی وەک مانگ دەدرەوشانەوە، بەرەکە هەستی بە خۆشحاڵی سەر ڕووی پێغەمبەر کرد و کۆتا پەیامبەر، وەک بڵێی لەمێژە چاوەڕێی ئەم ساتە بێت، ئارام و ئامادە بوو و بە زەردەخەنەیەکی فراوانەوە فەرمووی: "کەمێک چاوەڕێ کە!"

ئازیز بێ ئەوەی هیچ کات بەفیڕۆ بدات، چوویە ژوورەوە بۆ لای فاتیمە و بەرەکەش، کە لە یەکەم ڕۆژی لەدایکبوونی فاتیمەوە لەگەڵیدا بوو، دەستبەجێ و دوای پێغەمبەر بە جۆشوخرۆش و خۆشحاڵییەوە چووە ژوورەوە و تەماشای ناوازەترین باوکی دونیا و بێوێنەترین کچی جیهانی دەکرد... فاتیمە لەبەر باوکی سەروەری جیهانییانی هەستایە سەر پێ و پەیامبەری ئازیز بەوپەڕی موحیببەتەوە تەماشای گوڵە بەهەشتنشینەکەی دەکرد و زاری هەڵهێنا و یەک لەدوای یەک مژدە و هیوا و خۆشەویستیی ڕشتە نێو ڕۆحی فاتیمە و فەرمووی: "کچی جوانم! عەلی هاتووەتە داخوازیی تۆ و کەمێک بەر لە ئێستا ناوی تۆی هێنایە سەر زار، تۆ دەڵێی چی!" باوک و کچ بۆ

ساتێک تەماشایەکی یەکدییان کرد و دوو جوانترین جووتە چاوی دونیا بە چەند وشەیەکی نەگوتراو، لە یەک لەحزەی تێراماندا و تەنها بە چاو هەزاران وشەیان گۆڕییەوە، بەرەکە تەماشای ڕەوشت و شەرمی فاتیمەی دەکرد، وەختێ ئازیز ناوی عەلیی هێنا، چۆن کوڵمە ئاڵەکانی ئەوەندەی دی سوور بوونەوە و دەتگوت لە ئاسۆوە چەرشەفێکی پەمەیی سوورباو بەسەر ڕوخساریدا دراوە و چاوە شەوئاسا ڕەشەکانی لەژێر سێبەری برژانگە درێژەکانیدا خۆیان حەشار دا و نەیتوانی لەوە زیاتر تەماشای باوکی بکات و دەیزانی حاڵ و تەماشا و هەست و سۆز و وشەکانیشی ئاشکران، هەر بۆیە لە شەرماندا چاوەکانی لە زەوی بڕی و لای وا بوو جوانترین وەڵام بۆ ئەو ساتە گەورە و بەرزە بێدەنگییە! بەڵێ، بێدەنگی... وەک پێشینان دەڵێن، بێدەنگی لە ڕەوشتەوەیە...

بەرەکە دیسان و دیسان بیری دەکردەوە و لە ناخیدا دەیگوت: "ئای خودایە! بڵێی شەرم و حەیات بەتایبەتی بۆ ئەم ساتە نەئافراندبێ! بڵێی پەردەی ڕازی نێوان کچ و کوڕێک حەیا نەبێ و بەس؟ یان نا؟ بڵێی شەرمکردنی بەندە جۆرێک لە سوپاسگوزاری نەبێت بەرامبەر ئەو خودایەی گەشتێکی ناوازەی لەگەڵ کەسێکی دیکەدا پێ دەبەخشێت؟ یان ئەو هەویرە بێت کە عەلی و فاتیمەی وەک یەک و لەناو یەکدا نەرم و جوان شێلاوە و ئەو دەستە بێت بەنی ئادەمی بە چل هێلەکدا تێپەڕاندووە بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا ڕەوشت و حەیای لێ بتکێت! ئای کە لە نەوەی ئادەم دەوەشێتەوە حەیا و ئەدەب..."

شەرم و حەیای فاتیمە سیمبولێکی سەنگینی بوو و بۆنێکی سەرمەستکەر بە ژوورەکەدا بڵاو و بڵاوتر دەبوویەوە، دایەنەکەی پێغەمبەر سەری سوور مابوو... گەرچی لەبەر بۆنی حەبیبوڵڵا هەرگیز هیچ جۆرە بۆنێکی دیکەی بوغورد و عەتری بە ماڵەکەدا نەدەپرژاند، بەڵام ئەمەی ئەم جارەیان جیاواز بوو، ئەم جار سەرمەستکەرتر، خەست و چڕتر... بەرەکە سەری سوور مابوو، بەرەکە سەراسیمە بوو... مانای ڕەوشت و حەیا لە پێغەمبەرەوە فێر ببوو، بەڵام ئێستا لە دوا ترۆپکی بەرجەستەکراویدا لە عەلی و فاتیمەدا دەیبینی و لە ناخیدا دەیگوت: "ئەی حەیا، تۆ چەندە جلێکی پیرۆز بیت! وا هەرکەسی دەتپۆشی، دوو ئەوەندە جوان دەبێت و ئەوەی خاڵی بێت لێت، بەتەواوی لەناو دەچێت، ئای لەوانەی بە هیچت دەزانن و دەتدڕێنن و فڕێت دەدەن، خۆزگا دەیانزانی چییان لەدەست چووە! ئاە، گەر دەیانزانی..."

بەرەکە تەماشای باوک و کچی مرواریئاسای دەکرد و جیهان بەتەنیشتیدا تێدەپەڕی و ئەم لە کات بێئاگا بوو، گەنجانی دیکەی عەرەب هاتنە پێش چاوی، کە پەیوەندییەکی کاتی و نزیکییەکی بێسنووریان بە جیابوونەوەیەکی لەپڕ و دڵێکی شەکەت و ڕۆحێکی دارماو کۆتایی دەهات، بیری لەوانە دەکردەوە کە بەیەکەوەبوونیان پاکی و جوانیی لەدەست داوە و چۆن لە کۆتاییدا دەکوژانەوە و ژیانیان تێدەپەڕی و نەیاندەزانی چێژی بەیەکەوەبوونی ڕاستی و قووڵ چییە و پەیوەندییەکی کاتی و کورت و ژان و ناڵە و دڵشکانێکی دوورودرێژیان بۆ

دەمایەوە و خاڵی هاوبەشی نێوان هەمووشیان، بە هیچ هەژمارکردنی ڕەوشت و حەیا بوو! ڕەوشت، کە پەردەیەکی تەنکی ناسک بوو و درابوو بەسەر چەند جوانییەکی نازەنیندا و ئەوانەی دەیاندڕاند، مەحکومی ئەوە بوون زوو بڕزێن... بەرەکە لەو ساتەدا بەرامبەر پێشڕەوانی ئەو پاکی و جوانییە وەستابوو و پێی وا بوو شەرم و حەیا لە فاتیمە و عەلیدا بووە بە لقێکی ئیمان و گفتوگۆی ناوەکی بەردەوام بوو و دەنگی ناخی ئەم جار گوتی:

"ڕەوشت و حەیا هاوسەرگیری دەکەن."

حەیا عەلی و ڕەوشت فاتیمە بوو، چەند شیرین بوو ئەو بێدەنگییەی باڵی بەسەر ماڵەکەی ڕەسولدا گرتبوو، فاتیمە بێدەنگ و لە گەنجینەی غەیبەوە پەیتاپەیتا موحیببەت دەباری و خۆشەویستیی نێو ماڵەکە دڵۆپ-دڵۆپ زیادی دەکرد، خۆشبەختی و شادی دەباری و حەیا لە گۆشەیەکی ناسکەوە تەماشای فاتیمە و عەلیی دەکرد.

مرۆڤ بوونەوەرێکی ئاڵۆز بوو و زۆری دەربارە نەدەزانرا، بەڵام بێ دوودڵی ڕەوشت و حەیای زۆر لێ دەوەشایەوە و جوانیی بەندە و ڕازاوەیی ڕۆح بوو، هەروەها وەک هەر هەستێکی دیکەی مرۆڤ هەڵەتێگەشتنی زۆر دەربارەی حەیاش هەبوو، لەوانە، هەستی عەیبە و کەموکووڕی و تاوانباری و کەمتەرخەمی بە حەیا هەژمار دەکرا، بەڵام حەیا هیچکام لەوانە نەبوو و لەسەرووی هەموو ئەو هەستانەوە بوو و لە هەموو کەس زیاتر لە عەلی و فاتیمە دەوەشایەوە. سەیرکردنە وەک ئاوی کەوسەر

تەڕ و پاکەکانی فاتیمە هەر وەک تەماشاکانی عەلی لە چاوی خۆشەویست گیر بوو، ڕەسول بە بێدەنگی و خۆشحاڵییەوە زیاتر و زیاتر لە کچەکەی ورد دەبوویەوە و کوڵمە گوڵئاساکانی فاتیمەش پەیتاپەیتا پەڕەی نوێی دەر دەکرد و ڕوخساری دوو ئەوەندە ببوو بە گوڵستان و حاڵی ڕازیبوون و بێدەنگییەکەی دڵنیایی لێ دەخوێنرایەوە و سەری نەوی کردبوو و بێدەنگ بوو، تەواو بێدەنگ، یەک وشەشی نەگوت، بەڵام بێدەنگییەکەی ڕەزامەندییەخش بوو، هەر بۆیە خۆشەویستی جیهان فەرمووی: "ڕەزامەندیی کچ لە بێدەنگییەکەیدایە و بێدەنگییەکەشی لە دڵنیاییەوە، بۆیە فاتیمە ڕازییە."

هەندێک جار بێدەنگی زۆر لە وتن بەنرختر بوو... فاتیمە پەنای بردبوویە بەر بێدەنگی و بێدەنگییش پەنای بردبوویە بەر سەنگینی و بەم جۆرە پەیماننامەیەکی بێدەنگ، کە تەنها دڵ و چاو بۆیان هەبوو قسەی تێدا بکەن، لەنێوان کچ و باوکدا واژوو کرا و پێغەمبەری ئازیز ماچی سەری کچە گوڵخونچەکەی باخی بەهەشتی کرد و بەخۆشحاڵییەوە گەڕایەوە بۆ لای عەلی و بەرەکە شوێنی کەوت و خۆشترین بۆنی جیهانی بەسەردا بڵاو دەبوویەوە. ئای لە حەیا! ئەو پەردە تەنکەی بۆ بەردەوامیی نەوەی ئادەم پێویست بوو و ئەو دڵانەی لەپشت ئەو پەردەیەوە دەبوونە هاودەم و هاودڵی یەک، ئیدی نەدەبوونە مەحرەمی هیچ کەسێکی دیکە، پاکژترین و ڕوونترینی سەرچاوەکانی مرۆڤایەتی بوو و نەدڕاندنی پەردەی حەیا سوننەتی پێغەمبەر بوو! بەرەکەش پەیی بەو

ڕاستییە بردبوو و دەیگوت: "هەر دەبێت حەیا هەبێت! دەبێت ڕەوشت هەبێت، جا دڵخۆشی و حزورا" بەرەکە شەرمی لە شەرمی فاتیمە دەکردا لەو ساتەی فاتیمە لە شەرمدا نەیدەتوانی تەماشای باوکی بکات، بەرەکەش لە شەرمدا نەیدەتوانی تەماشای فاتیمە بکات... ڕەسول گەشتە لای عەلی و تیشکێکی بریسکەدار گشت ڕوخساری و خەندەیەک لێوی تەنیبوو و بە دەنگە شمشاڵئاساکەی فەرمووی: "ئەی عەلی! مژدەم پێیە!"

"گیانی شیرینم فیدای گیانت یا رسول الله! ئێوە خاوەنی زارێکی مژدەبەخش و کەسایەتییەکی بەرز و داناییەکی زۆرن لە کارەکانتاندا، سڵاوی خودا بڕژێت بەسەرتاندا، بفەرموون، گوێم گرتووە."

"چەند خولەکێک بەر لەوەی تۆ بێیت و داوای فاتیمەم لێ بکەیت، فریشتەیەک هات و فەرمووی، 'ئەی محەمەد! خودای باڵادەست جارێک تەماشای زەویی کرد و لەنێو بەندەکانیدا تۆی هەڵبژارد وەک نێردراوی خۆی، دواتر بۆ جاری دووەم تەماشای زەویی کرد و برا و دۆست و وەزیر و زاوایەکی بۆ هەڵبژاردی و فاتیمەی کچتی لێ مارە کرد و فریشتەکانی ئاسمانیش ڕێورەسمی پیرۆزباییان بۆ گێڕا.›"

عەلی سەرتاپای لەژێر بارانی خۆشی و شادیدا نوقم بوو و فرمێسکی شادی وەک ڕەحمەتێ لە چاوانیەوە بۆ نێو ڕیشی داباری و خۆشەویست بەردەوام بوو لە پێدانی مژدەی خۆشی، کە لە جیهانی نەزانراوەوە پێی گەشتبوو: "ئەی موحەممەد! خودا فەرمانی پێ کردووم پێت ڕابگیەنم فاتیمە لەسەر زەوییش

بدەیت بە عەلی و مژدەی ئەوەشیان پێ بدەیت کە خودا دوو کوڕی لە دونیادا هەڵبژێردراو و بوێر و خێردار و لە قیامەتتدا خاوەن شان و شکۆیان پێ دەبەخشێت." حەیا دیسان سەری لە عەلیی حەیدەر دا و تا گوێچکەی لە شەرمدا سوور بووبوویەوە و خۆشەویست خۆشترینی مژدەکانی پێ دا و فەرمووی: "ئەی عەلی! سوێن بە خودا هێشتا فریشتەکە بەرز نەبووبوویەوە بۆ ئاسمان کە تۆ لە دەرگات دا، هەر بۆیە منیش لەسەر فەرمانی خودا کچەکەم، فاتیمەت لێ مارە دەکەم."

عەلی بەندە بوو! سنووری بەندایەتیی خۆی دەزانی و تەنها توانیی بڵێت: "خودایە، ئەو سوپاسگوزارییەی بۆ ئەم نیعمەتەی پێت بەخشیوم، هەمە، بە سوپاسگوزارییەکی تێروتەسەل قبوڵ بفەرمووا" پێغەمبەری خودا لە جێی خۆی هەستا و ماچی ناوچاوی عەلی کرد و فەرمووی: "دەی بە ناوی خودا هەستە و بڵێ، 'بە ویستی خودا و هێز و دەسەڵات بەتەنها هیی خودایە و من خۆم دایە دەستی خودا.›" عەلیی حەیدەر لە تایبەترین و خۆشبەختترین ساتی ژیانیدا بوو، دوو ئەوەندەی ڕاڕایی و دڵتەنگییەکەی، خۆشحاڵ و دوو ئەوەندە مژدەپێدراو و دوو ئەوەندە سوکنایی هاتبوو، دەتوت خۆرێکی نوێ لەنێو ژوورەکەدا هەڵهاتووە و دانیشتووانی ماڵەکە بێدەنگ و فریشتەکان خۆشحاڵ و کۆتا پەیامبەر دەیفەرموو: "مژدە بێت ئەی عەلی! لەگەڵ سەنگینترینی خانمانی جیهاندا هاوسەرگیریت کردا" ساتێکی بێوێنە بوو، لە ژووری ئەودیو فاتیمە و لە ئەم ژوورەیان عەلی خۆشبەخت بوو، ساتێک بوو جێی ئەوە بوو

بلێی، دونیا وەستا و بوون نقەی لێوە نەدەهات و وجوود لاڵ و بێوشە واقی وڕ مابوو و پێغەمبەر بەردەوام بوو: "ئەی عەلی! مارەیی هاوسەرگیرییەکەت چەند دەبێت!" ئەم جارەیان هەستەکانی عەلی لە دوو لاوە چڕ بوونەوە، لە لایەک خۆشیی ئەوەی ڕەسول کچەکەی پێ داوە و لە لایەکی دیکە هەستی نەداری و هەژاری وەک شاخێ کەوت بەسەر شانیدا و وەڵامی دایەوە: "سوێند بە خودا هیچ شتێکم لە ئێوە شاراوە نییە یا رسول الله، لە دونیادا شمشێرێک و زرێپۆشێک و ئەسپێک شک دەبەم!" سەنگینترینی زەوی و ئاسمان زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی: "خۆت شمشێرەکەت پێویستە ئەی عەلی! تا لە ڕێی خودا هەوڵ بدەیت پێی بجەنگێی بەرامبەر دوژمنانی خودا، ئەسپەکەشت پێویستە ئاوی خورماکانتی پێ بدەیت و ئاوی پێ هەڵبگری بۆ خێزانەکەت و باری پێ هەڵگری، بەڵام زرێکەت لە ئێستادا پێویست نییە، ئەوەت لێ قبوڵ دەکەین."

هاوسەرگیری وەک زرێیەک بوو، خۆتی لە تاوان پێ بپارێزیت و جلێک بوو دەتکردە بەر و هاوسەرەکەت پێ دەپاراست و هەر بۆیە پێغەمبەر زەردەخەنەیەکی کرد، وەک ئەوەی بفەرمووێ: "لەمڕۆ بەدواوە زرێ و قەڵغانەکەت فاتیمەیە، کارت بە زرێپۆش نییە." شمشێریش لەو ڕۆژەدا ناموس و شەرەف و بوێری و ناوبانگی پیاو بوو، بەڵام فاتیمە هەزار زرێ و هەزاران هەزار شمشێری زولفیقاری دەهێنا...



## فڕینی فاتیمە لە ماڵ

"خانمانی پاک شایستەی پیاوی پاک و
پیاوانی پاک شایستەی خانمی پاکن."

شنەبەیاکی شیرین، هاوشێوەی دەمەوئێوارانی بەهار، بەنێو ماڵی ڕەسولدا شنەی دەهات، نەسیمێکی نیمچەشادیهێن و نیمچەخەمئامێز هەڵی کردبوو و کزیەکی مات و غەمگین تێکەڵ بە ئاهەنگی نێو هەواکە ببوو، بەرەکە دەگریا، فرمێسکەکانی هەڵگری خەمی چەند ساڵە و خۆشیی ئەو ساتە بوون. ئوموکەلسوم دەگریا و فاتیمەش هۆن-هۆن فرمێسکی دەڕشت و کزەی بێدایکی لەو ڕۆژەدا لەنێوان برژانگەکانیەوە دڵۆپ-دڵۆپ دەکەوتنە خوارەوە، ڕۆحی غەمگینی ماتەمی تەنهایی و بێئەویی دەچەشت، چەند خۆشییەکی بێدایک و بێ خەدیجە بوو! چەند شادییەکی بێ ڕوقیە و غەریبی و شکانێکی بێ زەینەب بوو! هەمووان لە هەمان بازنەی خەمدا بوون و زووزوو چاویان بەر چاوی یەک دەکەوت و تەماشایەکی فاتیمەیان دەکرد کە کاتی فڕینی لە ماڵی باوکی هاتبوو، فاتیمە، کە کۆتا یادگاری و دوایین دڵۆپی ئاوی کەوسەری نێو ماڵەکە بوو، ئەمە ئیدی پێی دەگوترا جودایی و لێکدابڕان!

"فاتیمە لە ماڵە باوان دەفڕێ!"

بە نسیبی چەند کەس دەبوو لەگەڵ تایبەتترینی ژنانی جیهاندا لەژێر بنمیچێکدا بژی! هەڵبەت سەخت و دژوار بوو دابڕان و لەوەبەدوا بۆننەکردنی گوڵەباخەکەی پێغەمبەر، بەرەکە هەستی دەکرد ئەرکی ئارامکردنەوەی دانیشتووانی ماڵەکەی کەوتووەتە سەر شان: "لە خودا بە زیاد بێت، دڵمان ئەرخەیانە بەرامبەر ئەو ماڵەی بۆی دەچێت، عەلی شێرەکەی خودایە و گەنجێکی ئەوەندە جیاواز و بەرزە، ڕەسولەڵڵا هەڵی بژاردووە، فاتیمەی گوڵی ڕەسول مەگەر تەنها لەلای عەلی لقوپۆپ و خونچەی دی دەر بکات!"

دەم دەمی بەیەکگەیشتنی ڕۆحە پاکیزە و ناسکەکان بوو، وەختی بەجێگەیاندنی بەڵێنی خوایی بوو، ئەوانەی پارێزگاری لە شکۆ و پاکیزەییان دەکرد، بێگومان گەنجینەی شاراوەیان پێشکەش دەکرا، لەوەبەدوا عەلی گەنجینەی فاتیمە و فاتیمە گەنجینەی عەلی بوو و لە زەینی هەمووانیدا هەمان ڕستە دەهات و دەچوو: "کەسانی پاکیزە لەگەڵ کەسانی پاکیزە هاوسەرگیری دەکەن."

ماڵنشینان بە هۆی ڕۆشتنی فاتیمە و فاتیمەش چوون بابە گیانی جێ دەهێشت، غەمبار بوون و چاوەکان پڕ بوون لە فرمێسکی قەتیس و لێوەکان بەدەم ویرد و نزاوە فاتیمەیان بەڕێ دەکرد، بەڵام لایەنێکی دیکەی هەموو لەحزەیەکیش خۆشی بوو، چوون هەمووان شایەتحاڵی شاییەک بوون کە مارەبڕینەکەی لە ئاسمان بەجێ گەیەندرابوو، هەر بۆیە کەشوهەوایەکی جەژنئاسا

ماڵەکەی پڕ کردبوو لە شادی و خۆشی، هەرچوار لا بۆنی بەهەشت و میسک و عەمبەر و خۆشبەختیی لێ دەهات! فاتیمە بۆنێکی ئێکجار خۆشی لێ دەهات...

بەرەکە باوەشێکی توندی بە فاتیمەدا کرد و دەیگوت: "فاتیمە گیانم! چاک بزانە هەتا ئەو ڕۆژەی دەمرم، ئاگادارت دەبم."

فاتیمە خەنی... زەردەخەنەیەک لەوەی باوکی و تەماشای کرد، تەماشایەک، چاوگی خۆشیی لەبەرامبەردا هەڵدەقوڵاند و تیشکی دەپرژاند بە ڕۆحدا، ژنەی بەتەمەن مەست و حەیران تەماشای جوانیی فاتیمەی دەکرد، چ خەمیبوو ئەو چاوەی جوانی فاتیمەی دیبوو، با هیچ جوانییەکی دیکەی نەدیبایە، قەیدی چییە! هەرکێ تەماشای فاتیمەی دەکرد، تینوویتیی دەڕەوایەوە، هەرچیی ئازارە لەبیری دەکرد، شاد و بەختیارتر دەر دەکەوت. ئوموسەلمە بە هەمان مەستییەوە تەماشای دەکرد و دەیوت: "فاتیمە! تۆ نهێنیهەڵگرێکی ڕاستگۆ و دۆستێکی بەوەفای ئێمە بوویت، ئەو کاتانەی ڕەسول الله لە ماڵ نەبوو، لەدەوری کەلامی شیرینی تۆ کۆ دەبووینەوە، ئێستا پێمان ناڵێیت بۆ تۆ چی بکەین!" فاتیمە دیسان خەنی، شەرمی کرد، کوڵمەکانی گوڵی یەمەنییان دەر کرد، بەردەوام بوو: "ئەی ئەو گوڵەی تووەکەی لە بەهەشتەوە پرژێنراوەتە سەر زەوی، پشت بە خودا عەلی قەدرزان دەبێت و ناتژاکێنێت."

عەلی و فاتیمە، دوو دڵی سەنگین و زەنگینی ڕووی زەوی، دەبوونە هاودەم و دەڕژانە نێو یەک و دەبوونە دوو دەریا.

یەکیان حزور و نور و ئەوی دی زانست و ڕەوشت، چەندین دەریاچەیان لێ دەبوویەوە و تا هەتایە زیاتر و زیاتر دەڕژانە نێو دڵی نەوەکانیانەوە.

عەلی لە بەختیاری و سوپاسگوزاریدا سەری بەردەوام لەسەر سوجدە بوو، هەرکات سەری بەرز کردەوە، تەماشا قووڵەکانی ڕەوشتیان لێ دەتکا و بە شەرم و سوپاسگوزارییەوە لە حزوری پێغەمبەر هەستا، گوڵە بێوێنەکەی ڕەسولی پێ درابوو، پێیەکانی لەسەر زەوی خۆیان نەدەگرت، عەلی ئەو ڕۆژە دووبارە لەدایک بوو و دونیا لەژێر پێیدا ئەوەندەی دەنکە لمێک بێبایەخ و بچووک بوویەوە، بەرەو دایکی ڕێی دەکرد و لەبەر خۆیەوە دەیگوت: "خودایە! ئەمە چ ئەمانەتێکە ڕادەستی من کراوە!"

"بڵێی بتوانم ببمە هاوسەرێکی شایستە بە ئەم گوڵە و نەیژاکێنم!"

عەلی ئەو شەوەی کە مانادارترینی شەوەکانی ژیانی بوو، بە سوجدە و نزا و سوپاسگوزاریی خودا بەسەر برد، تا گزنگی بەرەبەیان لە قووڵایی دڵیەوە سوپاس و ستاییشی ئەو خودایەی کرد کە فاتیمەی کردووە بە هاوسەری...



# دەمی گوڵ و هەنگوین

تروسکایی شادییەک لەنێو ماڵەکانی مەدینەدا داگیرسا، مژدەی خۆشی بەخێرایی بە شاردا بڵاو بوویەوە و هەواڵی هاوسەرگیرییەکە زار بۆ زار هات و چوو:

"عەلی و فاتیمە هاوسەرگیری دەکەن!"

"فاتیمە عەلیی بۆ هەڵبژێردراوە."

هەواڵەکە پەیتاپەیتا لە بڵاوبوونەوەدا بوو و کۆتا پێغەمبەر دەبووایە دڵی ئەو هاوەڵانەی دیکەش ڕابگرێت کە پێشتر هاتبوونە داوای فاتیمە و بیلالی بانگخوێنی بانگ کرد و بڕێک پارەی پێ دا و فەرمووی: "ئەم پارەیە بگرە بیلال، بچۆ بۆ بازاڕ و بۆ مەراسیمی مارەبڕینی فاتیمە کەمێک ڕۆنی گوڵ و هەنگوین و ئاوی گوڵ بکڕە، هەنگوینەکە بهێنە بۆ مزگەوت و لە دەفرێکی پاکدا تێکەڵی ئاوی بکە و شەربەتی هەنگوینی پێ دروست بکەن تا دوای مارەبڕینەکە بیخۆینەوە." پاشان ئەنەسی بانگ کرد و فەرمووی: "ئەی ئەنەس! بچۆ پشتیوانان و کۆچکەرانم بۆ بانگ بکە، ئەبوبەکر و عوسمان و عومەر و عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ئەبووەقاس و تەڵحە و زوبەیر و ئەوانی دیکەش هەمووی بانگهێشت بکە بۆ مەراسیمی مارەبڕینی

فاتیمە و عەلی!" ئەنەس بەپەلە لە جێی خۆی بەرز بوویەوە و یەک-یەک ماڵی نێوان دارخورماکانی شارەکە گەڕا و لە کاتێکی کەمدا هەمووان کۆ بوونەوە و خۆشەویستی خودا خۆشبەخت و ئەرخەیان چاوەڕەێی هاوەڵانی دەکرد، یەک-یەک و دوو-دوو دەر کەوتن و هەر لەگەڵ سڵاوکردن، خۆشیی سەر ڕوخساری ڕەسولیان دەبینی و بە بینینی ئەو بەو جۆرە، هەمووان چەند ئەوەندە دڵخۆش بوون، بیلال ئاوی گوڵی دەپرژاند بەسەر ئامادەبوواندا و گوڵ و هەنگوین تێکەڵ کرابوو و شەربەتی ساردی شیرین ئامادە بوو و پێغەمبەر خورما و شەربەتی بەسەر هاوەڵاندا دەگێڕا و بە زەردەخەنە قووڵە مانادارەکەیەوە دەیفەرموو: "بفەرموون! عافیەتتان بێت."

هاوەڵان هەمووان لە مەراقێکی زۆردا بوون و هێشتا نەیاندەزانی هۆکاری ئەم مەراسیم و شادییە چییە و ڕەسول چووە سەر مینبەر بۆ ڕوونکردنەوەی هۆکارەکە و دڵی عەلی خێراتر و خێراتر لێیدەدا و گەلێ بەختیار بوو بەوەی ئەو جوانی و خۆشییەی چاوەڕێی دەکرد، زۆر جوانتر و ئاسانتر بەڕێوە دەچوو. هاوەڵان نقەیان لێ بڕابوو و چاوەڕێی دەرچوونی مژدەی خۆشی بوون لە لێوەکانی پێغەمبەرەوە و خۆشەویست وەک هەمیشە سڵاوێکی گەرمی کرد و یەک-یەک تەماشای چاوی هەموانی کرد بۆ ئەوەی هەر وشەیەک دەیوت، بەر دڵیان بکەوێت و فەرمووی: "سوپاس بۆ ئەو خودایەی لەپای ئەو نیعمەتانەی دەیبەخشێ، ستاییش دەکرێت! ئەو خودایەی بەهێز و بەتوانایە و تاکە پەرستراو ئەوە! ئەو

خودایەی خاوەن موڵک و تەختە و ملی بۆ نەوی دەکرێت! ئەو خودایەی لە سزاکەی دەترسین و بە هیوای نیعمەتەکانین! ئەو خودایەی فەرمانڕەوای زەوی و ئاسمانەکانە! ئەو خودایەی بە قودرەتی خۆی خەڵکی ئافراندووە و بە حیکمەتی خۆی بێوێنە نەخشاندوونی و بە عیزەتی خۆی جێگیر و سەنگینی کردوون! ئەو خودایەی دینێکی تەواو و محەمەدی وەک پەیامبەر بۆ خەڵکەکەی ناردووە و فەرمانی پێ داوە نەتەوە و هۆزە جیاوازەکان تێکەڵ بەیەک ببن و تاوانەکان دەسڕێتەوە. دەمەوێت پێتان ڕابگەیەنم کە خودا فەرمانی پێ داوم فاتیمە لە عەلی مارە بکەم و ئێوەش شایەت بن کە فاتیمە بە مارەیی چوار سەد مسقاڵ زیو لە عەلی مارە دەکەم، فاتیمەی کچم دا بە عەلی و ئێوەش هەمووتان دەکەم بە شایەت."

هاوەڵان گەلێ دڵخۆش بوون بەم بڕیارە و بازنەیەکی شادی حەڵقەحەڵقە بەنێو مزگەوتەکەدا بڵاو بوویەوە. ئەوان ئەو مرۆڤانە بوون کە بە دڵخۆشیی براکەیان دڵخۆش دەبوون! کڵپەی ئاگری ئیرەییان تێدا دانەگیرسابوو، لەپێش خۆیان بە خۆشیی دۆستیان دڵخۆش دەبوون، هەمووان ئاهەنگی ئەم بەیەکەوەبوونەیان گێڕا و پێغەمبەری ئازیز بەردەوام بوو: "خودای گەورە بیانکات بە کلیل بە دەستی هەرچیی ڕەحمەت و خۆشیی ئەهلی بەیتە، بیانکات بە کانزای هەرچیی خشڵی گرانبەهایە، ببنە سەنتەر و مەرکەزی هەموو جۆرە زانستێک و ببنە پارێزگاریکەری ئەم ئومەتە و هەم بۆ خۆم و هەم بۆ ئێوەش داوای لێخۆشبوون لە خودا دەکەم."

زەردەخەنەی سنووردار و چاوی هەمووان بەرەو عەلی وەر گێڕدرا، عەلی، زاواکەی پێغەمبەر، نوقمی جیهانێکی قووڵی بەختیاری و شادی ببوو، ماناداترینی لەحزەکانی ژیانی دەگوزەراند و لە ماوەیەکی کاتیی زۆر کەمدا قەدەری بەتەواوەتی گۆڕابوو و ئەمەش تووشی زەمینلەرزەیەکی ڕۆحیی کردبوو، ئای لە بەخشندەیی خودا چەندە فراوانە! ژیانی تاکەکەسیی عەلی لە ساتێکی چاوەڕواننەکراودا گۆڕانێکی بنچینەیی بەسەردا هاتبوو و نوقمی جوانییەکی ناکۆتا ببوو، چەند شت ڕووی دابوو! بەنێو دەمێکی چەند نهێنیئامێزدا تێپەڕیبوو! لە ئەو ڕۆژە زۆر تایبەتەدا عەلی نوقمی دەریای نیعمەتەکانی خودا ببوو، ئەو خەوە مانادارەی بیر کەوتەوە کە چەند ڕۆژێک لەوەوبەر دیبووی، وەک بڵێی ئەم ساتە لێکدانەوەی خەوەکەی بێت! لەنێو ئەم داڵغە و خۆشییەدا هەستایە سەر پێ و پاش سوپاسی خودا و سەلاوات لە پێغەمبەرەکەی و سڵاو لە هاوەڵان، گوتی: "هەموو ئەوانەی پێغەمبەری خودا فەرمووی قبوڵە، لە ئەمڕۆ بەدواوە فاتیمەی کچی پێغەمبەر لەژێر پارێزگاریی مندایە و مارەییەکەشی زرێپۆشەکەی سنگی منە، من ڕازیم و ئێوەش شایەتی ئەم بەڵێننامەیە بن."

هاوەڵان دەوری عەلییان دا و پیرۆزبایی و نزا و هیوا تێکەڵ بەیەک بوون و بە یەک دەنگ دەیانگوت: "بارک الله فیهما!"

هەموو ئەوانەشی کە فاتیمەیان خواستبوو و بەنسیبیان نەبووبوو، ئارام و خۆشحاڵ بوون و چاوەکان دەگەشانەوە و هیچکەس زەرەیەک قینی لە دڵدا نەبوو و هەمووان خۆشحاڵ

بوون بە گوتارەکەی پێغەمبەر و پێیان وا بوو دوو کەسی زۆر شایستەی یەکن و فەرمانیش لە جێیەکی بەرز و باڵاوە هاتووە و تا بڵێی بڕیارێکی گونجاوە و دوو گەنجی گەنجینەئاسای زەوی، عەلی و فاتیمە، 'بەڵێ'یان بۆ گەشتێکی نەبڕاوە کرد.

دوو گەنج، کە بەیەکەوە لە یەکەمین دڵۆپەکانی وەحییان خواردبوویەوە، وەک دوو مرواریی نێو سەدەفێک لەنێو جوانییەکی بێوێنەدا دەبوونە هاودەمی یەک، دوو گەنج کە بۆنی جوبریلیان بەسەردا هاتبوو، دەبوونە باخەوانی باخی موحیببەتی ڕەسول...

نزا و هیواکان تێکەڵ بە شادی بوون و بەرەو ئاسمان بەرز دەبوونەوە و بانگهێشتکراوان بەرەو ماڵەکانیان بەڕێ کەوتن و بەم جۆرە مارەبڕینی فاتیمە و عەلی لە مانگی ڕەمەزاندا بەجێ گەیەندرا، لە کونج و سووچ و گۆشەکانی مزگەوتەکەوە پەیتاپەیتا بۆنی گوڵەباخ بڵاو دەبوویەوە و لەنێو دڵی ئامادەبووواندا خۆشی و شادی و ئەو دەمەی زەمان دەمی خۆشی و دەمی خۆشییش هەنگوین و گوڵ بوو ئەو ڕۆژە...



## ئاوی کەوسەر

لـه کاتژمێرەکانـی داهاتـووی شـەودا، وەختـێ بێدەنگـی باڵـی بەسـەر ماڵەکـەدا کێشـا، ئیدی وەختـی دەردەدڵ و گفتوگۆی باوک و کچانـه بـوو، تەماشـاکانی کۆتـا پێغەمبـەر، مەنـگ و مانـادار بـوون و لـه ڕەشـایی چاوەکانیـدا هـەزار مانـای حەشـار دابـوو و کەنـار چاوەکانـی تـەڕ بـوون و بەوپـەڕی میهرەبانییـەوە تەماشـای فاتیمـەی دەکرد و فاتیمـەی ناسـراو بـه "دایکی باوکی" هەسـتی بـه حوزنـی نـاو چاوەکانـی بابـەی کـرد و پـاش ئـەوەی دەسـتی بـۆن عەمبـەری باوکـی مـاچ کـرد، بـۆ یەکـەم جـار بێدەنگییەکـەی شـکاند و گوتـی: "بابـه گیـان، غەمبـار دەتانبینـم! هـۆکاری چییـه!" پێغەمبـەری ئازیـز لـەو سـاتەدا لەگـەڵ کچەکەیدا لـه حاڵێکـی هێنـد ناسـکدا بـوو، تەنهـا فریشـتەکان دەیانتوانـی دەسـت بـۆ ئـەو سـاتە ببـەن...

ئازیـز ماچێکـی ناوچـاوی بەهەشـتئاسـا فراوانـی کچەکـەی کـرد و فەرمـووی: "گیانـی مـن! تـۆش وەک باوکـت بێدایـک و یەتیـم کەوتـی، گـەر دایکـت لەگەڵمـان بووایـه، زۆر خۆشـحاڵ دەبـوو بـەم سـاتە و بـه دەسـتەکانی خـۆی بوخچـه و پێداویسـتیی بـۆ ئامـادە دەکردیـت و هەمـووان بەیەکـەوە ئـەم ڕۆژە جوانـه دەژیایـن،

بەڵام هیچمان لەدەست نایەت و تیکهەڵکێشانی شیرینی و تاڵی لە ڕاستییە نکوولێلێنەکراوەکانی ئەم ژیانەن و ویستی خودایە کە بووکێنیی تۆ بەم جۆر ەبێت و ئەوەش منی غەمبار کرد."

فاتیمە هەوڵی دا هەموو ئەو هەستی نەبوونی دایکەی چەنێکە لەنێو خۆیدا بەندی کردووە، بە ماچی دەستە بۆن عەمبەریکانی بابەی بڕەوێنێتەوە و گوتی: "خودا ویستی وا بووە بابە گیان."

فاتیمە فرمێسک لە چاوانی وەک بارانی نیسان دەباری و سەروەری جیهان، گەرچی لە حاڵی ڕۆحیی کچەکەی حاڵی بوو، بەڵام پرسیی: "بۆ دەگریت کچی جوانم!"

باڵی پڕ میهرەبانیی بەسەر جگەرگۆشەکایدا دا و لەئامێزی گرت و دەستەکانی گوشی و تەماشای چاوەکانی کرد و فەرمووی: "فاتیمەی من! پارچەیەک لە گیانم! نەکا بۆ ئەوە بگریت کە لە عەلیم مارە کردوویت؟ سوێند بە خوا هاوسەرگیریت لەگەڵ داناترین و بەڕەوشتترین و یەکەمینی موسڵمانەکانی ئومەتدا کردووە." فاتیمە فرمێسکەکانی سڕی و عەرزی حاڵی بۆ باوکی نوری چاوی کرد: "نەخێر باوکە گیان! کیژانی گەنج مارەییەکیان لەسەر هاوسەرەکانیان هەیە و ئەم مارەییە بەگشتی بە ئاڵتوون و زیو دەپێورێت و منیش داواکارییەکم هەیە بۆ مارەییەکەم."

"چییە کچم، بیڵێ!"

پێغەمبەر و جگەرگۆشەکەی لە ئامێزی تاریکی شەودا هێندە نزم دەدوان، تەنها فریشتەی سەر شانی ڕاست گوێبیستیان

بوو. فاتیمە سەری ڕێزی بەرامبەر باوکی نەوی کردبوو و دەستی باوکی بەحورمەتەوە ماچ کرد و گوتی: "گومان لەوەدا نییە کە مارەیی نرخ و پارێزگارییەکە لەلایەن خوداوە بە ئێمەی ژنان بەخشراوە و منیش وەک کچێکی گەنج داخوازم مارەییەکەم قبوڵ بفەرموون."

ئای لە فاتیمە، خاوەنی ڕەوشتێکی چەند جیاواز بوو، لە تەوقی سەری تا بنی پێی بە چەرشەفێکی پەمەیی ناسکی حەیا داپۆشراو و لەژێریدا سەنگین و بەشکۆ ڕاوەستابوو، بە وردبوونەوە لە ئەو شەرمە زۆرەی دەیکرد و ئەو حاڵەی تێیدا بوو، دیار بوو داواکارییەگی گرنگی هەیە و ئامادەش نییە دەستبەرداری ببێت. بڵێی چی بێت داواکاریی مارەییەکەی؟ بڕێکی زۆر ئاڵتوون و زیو، یاخود ئاوریشمی وڵاتانی دوور و مرواریی نەبینراو؟ حوشتری چاوشینی بارکراو بە خشڵ و زێڕ؟ یاخود یاقووتی یەمەن و ئەڵماسی هیند؟ دەستبەنی بە هیچ پارەیەک نەکڕدراو یان مستیلە و گوارە و ملوانکە و پشتێنی ئاڵتوون و متوموورووی نەخشێنراو؟ گەرچی گەر داوای ئەوەشی بکردایە، هەرچی ئاوی نیل و فوراتە بکرێت بە مارەیی بۆی، قابیلی بوو! بەڵام نا، ئەوەی ئەو دەیویست ئەوە نەبوو، ئەی چی بوو ئەوەندە پێداگر بوو لە بەدەستهێنانی؟ باوکی شکۆدار بەوردی گوێی بۆ کچەکەی ڕاگرتبوو: "ئارەزووی چی دەکەیت؟ بیڵێ کچی جوانم!"

"باوکە گیان، مارەییەکەم ڕەزامەندیی خودا و خۆشبەختیی پێغەمبەرەکەیەتی."

"داخوازیم لێخۆشبوونی ئومەتەکەی محمەدە لە ڕۆژی سەختی مەحشەردا! دەمەوێت لەو ڕۆژەدا کە ئێوە بەدەم پیاوانی ئومەتەوە ڕادەکەن، منیش بەدەم خانمە نوێژکەرەکانی ئومەتەوە ڕابکەم، دەمەوێت بتوانم شەفاعەتیان بۆ بکەم تا نەسووتێن و لە تیاچوونی ئەبەدی دوور بن، داخوازم لە ڕۆژی مەحشەردا توانای ئەوەم پێ ببەخشرێت داوای لێخۆشبوون بۆ ژنانی ئومەتەکەم بکەم!"

ئەی خودایا! ئەمە چ مارەییەکە! خۆتەرخانکردن بۆ تاکبەتاکی ئەو ئومەتەی تا ڕۆژی قیامەت چاو بە دونیا هەڵدەهێنن! ئەمە چ گەورەییەکە ئەی فاتیمە! لە سروشتیترین مافی خۆشتدا خۆت لەبیر دەکەیت! داواکارییەکەی ڕوون دەکردەوە و وشەکانی یەک-یەک لەسەر ناسکترین دەمی زەمان ڕیز دەکرد:

"ئیزنی لێخوشبوون و شەفاعەت."

"ڕەزامەندیی خودا."

"خۆشبەختیی حەبیبوڵلا."

"خۆشەویستیی خۆشەویست."

"ڕزگاریی ئومەتەکەی."

وەک بڵێی گەردوون و هەرچیی ناوی "شوێن"»ە لەو ساتەدا لەوێ حزوریان هەبووبێت، ژوورەکە لە دواترۆپکی خامۆشیدا بوو. بڵێی ئەو لەحزە کورتە بە چەند سەدە هەژمار کرابێت... بڵێی چەند عالەم و ژیانی جیاواز خۆیان ترنجادبێتە نێو ئەو ساتە تا لە ئەفسوونی ئەو لەحزەیە بێبەش نەبن. بڵێی چەند وشە ڕیز کرابێ و چەند قەڵەم ویستبێتی ئەو ساتە بنووسێ

و نەیتوانیبێت، لە زەوییەوە خشە خش و تەقە و ڕەقەی ئەو قەڵەمانە دەهات کە لە ئاسمانەوە خەریکی نووسینەوەی ئەو ساتە بوون، تەنانەت زەمانیش بەئەسپایی هەنگاوی دەنا، نەبا ئەو سکووتە بشێوێنێت. بێدەنگیی ئازیز زۆری خایاند و فاتیمە چاوەڕێی وەڵام بوو، بڵێی داواکارییەکەی قبوڵ کرابێت؟ لە ناخیدا گەردەلوولێکی جۆشوخرۆش هەڵی کردبوو و چاوەڕێی یەک وشە بوو لە زاری بابە گیانی بکەوێتە خوار، بەڵام بۆ هیچی نەدەگوت؟ بۆچی بێدەنگ بوو؟

ئازیز لە بێدەنگی و سکوتی الف، لام، میمدا بوو... لە ئامێزی نهێنیی ئافرێنەر و پەیامبەر و پەیامهێنەردا بوو، بڵێی جوبریل ئەم جار بە دیاریی بەهەشتەوە هاتبێت بۆ ئەوە ماڵەی چەندین جار بۆی هاتبوو! ئەم جار بڵێی فریشتەگەلێکی لەگەڵ نەبووبێ، یەکەم جاریان بووبێ بێنە سەر زەوی! هەریەک لەو فریشتانەش سینییەکی ئاڵتوونیی پێ نەبووبێت! لەسەر سینییەکانیش بوخچەی سەوزی گرێدراو! لەنێو بوخچەکانیشدا بۆنی سەرمەستکەر و خشڵی تا ئەو ڕۆژە نەبینراو و ئاوریشم و چەرەس و چەندین نیعمەتی دیکە! ڕەنگە خۆشەویست پرسیبێتی: "فەرمانی خودای گەورە چییە!"

«یا رسول الله! خودای حەق سڵاوی بۆت نارد و فەرمووی: من فاتیمەی کچەی خۆشەویستم دا بە عەلی و لە عەرشی عەزیم لەیەکم مارە کردن، با خۆشەویستیش لەنێو هاوەڵانیدا مارەی ببڕێت."

"ئەی ئەم سینییانە چییە ئەی جوبریل!"

"ئـەم سـینییانە جلوبەرگـی بەهەشـتیان لەسـەرە، خـودای گەورە جلی بووکێنیی فاتیمەی لە بەهەشتەوە ڕەوانە کردووە بۆ ئەوەی لە ڕۆژی هاوسەرگیرییەکەیدا بیپۆشێت، هەروەها لە یاقووت و ئەڵماسەکانی بەهەشت گوارە و ملوانکە و دەستبەنی بۆ ناردووە... شتانێکمان لە بەهەشتەوە بۆ هێناوە، تا ئێستا هیچ چاوێک نەیدیبێت، بۆ ئەوەی کە فاتیمە بە بووکی چوو بۆ لای عەلی، خۆی پێ بڕازێنێتەوە. لەسەر سینییەکانی دیکەش خواردنی بەهەشتمان هێناوە، هەر لە گۆشتی چۆلەکەی ئاسمانەوە تا حەڵوا، هەرچی نیعمەتە هێناومانە، تا میوانداریی هاوەڵانی پێ بکەیت." جوبریلی گەورەی فریشتان وەڵامی دەدایەوە.

دواتر ڕەنگ بێ پێغەمبەر سوجدەی سوپاسگوزاریی بردبێت بەرامبەر ئەو هەموو بەخشندەییەی خودا و فەرمووبێتی: "ئەی جوبریل بۆم باس بکە! مارەبڕینەکە چۆنچۆنی بەڕێوە چوو لە ئاسمانەکان؟"

گەورەترینی پێغەمبەران و گەورەترینی فریشتان بەو جۆرە باسیان لە مارەبڕینێ دەکرد کە لە ئاسمان بەڕێوە چووبوو و ژوورەکەش بەحەتمی بۆنێکی ئەفسانەیی لێ هاتووە و ڕەنگە گەورەی فریشتان باسوخواسی جۆشوخرۆشی ئاسمانەکانی بەم جۆرە پێ ڕاگەیاندبێت: "بە فەرمانی خودای گەورەم دەرگاکانی بەهەشت هەموو کرانەوە یا رسول اللە! دواتر دەرگاکانی جەهەنەم داخران و فریشتەکان لە بەردەم عەرشی ئەعزەم لەژێر داری توبادا کۆ بوونەوە، خودا فەرمانی کرد

و شنەبایەکی وەسفنەکراو لە بۆنخۆشیدا هەڵی کرد و گەڵای دارەکانی بەهەشت دەشنانەوە و بەر یەک دەکەوتن و نەغمە و سەمفۆنیایەکیان دروست کردبوو، لە باسکردن نایەت، هەموو ئەوانەی گوێبیستی بوون، هۆشیان سڕ بوو، ڕۆحیان سەرخۆش، چاویان نابینا بە هەر جوانییەکی دیکە. چۆلەکە و پەڕەسێلکەکانی بەهەشت ئاوازێکی بێوێنەیان دەچڕی، دواتر خودا فەرمانی بە فریشتان دا، هەموو بەهەشت بە دار و دەریا و میوە و کۆشکەکانیەوە بڕازێننەوە و فەرمانی بە بای بەهەشت دا بە هەرچیی بۆنی خۆشە شنەی بێت و بڵاوی بکاتەوە، دواتر فەرمانی بە حۆرییەکانی بەهەشت دا ئەو ئایەتانە بخوێنن کە بە طه، ط سین، حاء میم، عین سین قاف دەست پێ دەکات، دواتر خودای جیهانییان فەرمانی بە من دا: 'ئەی جوبریل، تۆ وەکیلی عەلی و منیش وەکیلی فاتیمە دەبم، ئەی فریشتەکانم! ئێوەش شایەت بن، من فاتیمەم دا بە عەلی، بەوەکالەت قبوڵی بکە ئەی جوبریل.' مارەبڕینی ئاسمان لەنێو جوانییەکی پەیپێنەبراو و هەزار و یەک جوانیدا بەڕێوە چوو یا رسول الله! هەر بۆیە فەرمان بە ئێوەش کرا هاوەڵانتان کۆ بکەنەوە و مارەیی سەر زەوییش بە ئەنجام بگەیەنن." جوبریل وردەکارییەکانی دیکەشی یەک-یەک دەگێڕایەوە و ڕەسول سوپاسی خودای دەکرد، دواتر داواکارییەکی لە جوبریلی فریشتەی بەهەشتئاسا جوان و بۆنخۆش کرد: "ئەمانە بگرە ئەی جوبریل! بیانبەرەوە بۆ بەهەشت، دڵنیام کە فاتیمەی کچم قسەی من ناشکێنێت، بەڵام دونیا شایانی ئەوە نییە ئەو جلانەی بۆ بپۆشێت!"

کێ دەیزانی چەند وشەی دیکە لە ئەم یەکتربینینەی ئەودیو دنیایەوە ئاڵوگۆڕی پێ کرابوو، بەڵام ئێمە لە ئەودیو دەرگای ڕازەوەوە وەستابووین و پێمان نەگەیشت. ئەشکی ڕوون لە چاوانی نەبییەوە دەڕژانە نێو ڕیشی پیرۆزی و فرمێسکەکان لەنێو بۆنی خۆشیدا خۆیان حەشار دەدا و نەدەتکانە سەر کۆشی. بێدەنگی وەک ماتەمێکی دووروودرێژ کەوتبوویە نێوانەوەو و لە کۆتاییدا زەردەخەنەیەک کەوتە سەر ئەو ڕوخسارەی هەرچیی قەڵەمی دونیایە بێدەسەڵات بوون لەئاست کێشانی جوانییەکەی، چی بوو؟ هۆکاری درەوشانەوەی ڕووی وەک مانگی چواردەی چی بوو! لەوە دەچوو هەواڵێکی نوێی پێ گەیشتبێت، نەکا لە ئاسمانەوە نامەیەکی ئاوریشیمیی پێ گەیشتبێت و بەم جۆرە مژدەی پێ دابێت: "خودای باڵادەست مارەیی فاتیمەی زوهرای قبوڵ کرد و ئیزنی شەفاعەتکردن بۆ تاوانبارانی ئومەتەکەی باوکی پێ درا." جوبریلی گەورەی فریشتان لەگەڵ دیارییەکاندا سینییەکی ئاڵتوونییشی هێنابوو کە نامەیەکی ئاوریشمیی لەسەر بوو و ئەو ساتەی نەبی کردیەوە، تێگەیشت کە مارەبڕینی فاتیمە لە عەلی هەر بەڕاستی جیاواز بووە و زۆر پێش ئەوەی لە زەوی مارە ببڕدرێن، لە ئاسمان مارە بڕدرابوون... نەبی وەڵامی خۆی لە جوبریل وەر گرتبوو و چاوە کەنارتەڕەکانی، کە خۆر خۆی تێدا حەشار دابوو، ڕوو کردە فاتیمە و زەردەخەنەیەکی ئارامی کرد و فەرمووی: "پیرۆزە کچم! داواکارییەکەت قبوڵ کرا و تۆ بەم داواکارییەت سەلماندت کە کچی پێغەمبەریت!" ڕوخساری فاتیمە نوقمی

ئەشکی خۆشبەختی بوو و سوجدەیەکی سوپاسگوزاریی برد و بە پانتایی دووریی نێوان عەرش و عەرز و سوپاسگوزاریی دەر بڕی: "**الحمد الله، هذا من فضل ربي!**"

فاتیمە لەوەبەدوا گەشتی ژیانی دەست لەنێو دەستی عەلی بەڕێ دەکرد، ئەوانەی لە دوورەوە تەماشای فاتیمەیان دەکرد، شتانێکی دیکەیان وەک مارەیی پێ ڕەوا دەبینی، ماڵێکی خۆش، کۆشکێک لە شانوشەوکەتی بوەشێتەوە، ئاوریشمی تایبەت، حوشتری بەهێز، خشڵ و زێڕی ناوازە و چەندین شتی دیکەی دونیایی سەرنجڕاکێش، کە یەک لەدوای یەک بۆ نوری چاوی نەبی ڕیز دەکرا، بەڵام ئەو فاتیمە بوو! دەیزانی هیچکام لەوانە شایانی ئەوە نین ببن بە مارەیی، ڕەنگە نهێنیی فاتیمە، بوونی فاتیمە لەوەیدا بووبێت!

نەفس کە پاڵپێوەنەرێکی شاراوەی نێو ناخی هەموو ئینسانێک بوو، تەوژمەکەی لە گەنجاندا زۆر بەگوژمتر بوو، فاتیمە دەیزانی نەفسێک کە بە ئیرەیی و خۆپەرستی و هەستی کێشمەکێشی و پاڵپێوەنان پەروەردە دەکرا، بە هیچ تێر نەدەبوو، گەر بیویستایە، دەیتوانی زۆر و زۆرتر داوا بکات، باوکی موحەممەدی سەرکردەی دەوڵەتی ئیسلامی و دایکی خەدیجەی بازرگانی گەورەی دوورگەی عەرەب و داخوازیکارەکەی عەلی، سەرکردەی سوپای موسڵمانان بوو، بەڵام داخوازیی ئەم، ڕزگاریی ئومەتی موحەممەد بوو! هەروەها لەبەر حورمەتی بابە گیانی داخوازییەکەی قبوڵ کرابوو و زۆر دڵخۆش بوو.

چەنـد جـوان بـوو بتوانیـت ویسـت و حـەزی بێسـنووری گەنجێتـی کۆنتـرۆل و ڕام بکەیـت و پێشـبڕکێ بـۆ گەیشـتن بـە خۆشبەختیی ناکۆتـا بکەیت. لـە کاتێکدا هەمووان لە کێشمەکێشی دونیاییـدا بـوون و بـەرەو تیاچـوون ڕێیـان دەکـرد، چەنـد جێـی ڕێز بوو هـەوڵ و ماندووبوونـی ئـەو مرۆڤانـەی شـەوان لەسـەر دۆشـەکی نـەرم لـە خەمـی ئومەتـدا خـەو لـە چاوانیـان دەتـۆرا! چەنـد ناسـک بـوو نهێنیـی نێـو دڵـی فاتیمـە... چەنـد جێـی ڕێـز بـوو...



## دارزەیتوون و دارهەنجیرەکان

لـە دەرەوە دەنگـی جریوەجریـوی پەڕەسـێلکەکانی یەسـریب دەهات و گشت شـار خەوتوو و عەلی سـوجدەی سوپاسگوزاریی دەبرد، لەپاش مارەبڕینەکـەوە لـە شـەرم و ئەدەبـەوە نەدەچوو بۆ ماڵی نەبی، نەیدەتوانـی بچـێ و بـە چاوێکی دیکـە تەماشـای ئـەو کچـەی پێغەمبـەر بـکات کـە وەک ئەمانـەت پێـی درابـوو. دایـک و خوشـک و براکانی عەلی لە دوو خۆشـیدا بوون؛ یەکەمیان ئەوەی کـە فاتیمـە دەبێتـە بووکـی ماڵەکەیـان و دووەمیـش لەبـەر ئـەوەی عەلـی تـا کاتـی زەماوەنـد لای ئـەوان دەمایـەوە، چـوون عەلـی هـەر لـە منداڵییـەوە لای پێغەمبـەر دەژیـا و دواتریـش بـە هـۆکاری کـۆچ و جەنگـی بـەدرەوە عەلـی زووزوو دەبووایـە سـەردانی ناوچـە جیـاوازەکان بکات و بـە هـۆکاری ئـەوەی دەبووایە گشـت سـات و کاتـێ ئـاگاداری ڕەسـول بێـت و پارێزگاریـی لـێ بـکات، زۆر کـەم دەیانبینـی و حەسـرەت و تامـەزرۆی ڕوخسـاری بـوون و ئەمـە دەرفەتێکـی زۆر بـاش بـوو و خوشـک و براکانـی خۆشـبەخت و عەلییـش خۆشـحاڵ بـوو. دایکـی لـە خۆشـبەختیی شـادبوونەوە بـە کوڕەکـەی و لـە شـادیی ئـەوەی ببـوو بـە خەسـووی کچەکـەی نەبـی، کوڕەکـەی تونـد لەئامێـز گـرت و گوتـی: "کوڕەکـەم! بـە

ئەم مژدە و خۆشییەی پێت دام، تەمەنێکی دیکەت خستە سەر تەمەنم! ئای چەند دیوان و پەخشان لە دەرگای حەق دەنووسرێ و بەندە لێی بێئاگایە!"

کوڕەی نازداری پڕ لە جۆشوخرۆش گوتی: "لەپاش مارەبڕینەکەوە ناتوانم لەدەوری ڕەسول جێ بە خۆم بگرم، وەک بڵێی پەردەیەکی شەرم و حەیا بدرێت بەسەرمدا، لە جێی خۆمدا سڕ دەبم و نە دەتوانم بجووڵێم، نە بئاخفێم."

دایکی زەردەخەنەیەکی کرد: "شەرم و حەیا بەشێکە لە ئیمان کوڕم، ئەمە حاڵێکی باشە تێیدایت، خوای گەورە ئەم هاوسەرگیرییە بکاتە مایەی بەرەکەت و موحیببەت، بڕژێ بەسەرتاندا و خۆشی و سوپاسگوزاریت هەتاهەتایی بێت گیانی من."

گفتوگۆ و دەردەدڵی دایک و کوڕ تا درەنگانی شەو درێژەی کێشا و وەختێ دایکی چوو بحەوێتەوە، کوڕە خۆی و بیرکردنەوەکانی بەتەنها مانەوە... لەنێو مشتومڕێکی قووڵدا بوو لەنێو خۆیدا، خەم و دڵەڕاوکێی نەبوو، بەڵام عەلیی حەیدەر پرسیاری زۆر لەلا گەڵاڵە ببوو.

بیری لە ئەو خەونە دەکردەوە کە ماوەیەک لەوەو بەر دیتبووی و ئەو کات سەری لێ دە رنەکردبوو و ئێستا ئیدی ماناکەی ئاشکرا بوو، لە خەونیدا زەیتوون و هەنجیری بەیەکەوە دیبوو، تێنەدەگەیشت شتی وا چۆن دەبێت و مانای خەونێکی لەم جۆرە دەبێت چی بێت؟ هەنجیر لە دیمەشق و زەیتوون لە قودس زۆر بوو، بڵێی ئەمە ئەو مانایە بێ کە چەنێکە لێی نادیار بوو؟ شەرەفی هاوسەرگیری لەگەڵ فاتیمە؟

بـوون بـە کەسـی نزیکـی چاکتریـن و جوانتریـن دروسـتکراوی تەقویمـی ڕۆژگاری خودایی و گەیشتن بە فاتیمـەی نوری دڵی؟ دڵنیـا بـوو لـەوەی مانایەکـی جـوان و هیوابەخشـی هەیـە، ئـەو خەونـەی چوون ئایـەت بە نـاوی هـەردووک دابەزیبوو، هەڵبـەت نهێنیـی نێـو هەنجیـر و زەیتـوون جـوان بـوو.

«وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ...»

"سوێند بە هەنجیر و بە زەیتوونیش..."

مـەولای مـەزن سـوێندی بـە ئاسـمانی فـراوان و زەویـی بەهەیبـەت نەخواردبـوو و بـە دەنکـە هەنجیرێکـی بچووکـی خواردبوو، کێ دەڵێت نهێنیی ئاسمان و زەوی لەنێو هەنجیرێکدا حەشـار نـەدراوە!

لەنێـو دەنکـە هەنجیرێکـدا تیشـکی لەژمارەنەهاتـووی خـۆر شـاراوە بـوو، دەورانـی دونیـا و زەردەخەنـەی مانـگ و دڵۆپـە ئاوی ئاسـمان شـاراوە بوو، لـە خۆر و ئاسمان و ئاو و خـاک هەرچیی کـەم و زۆر ڕۆڵی هەبووبێ، لـە پێگەیاندنی ئەو تۆوە بچووکـە لەنێـو خاکـدا بـە دەنکـە هەنجیـرەوە دیـار بـوو، وەک بڵێی حـەق بەنـدە بانـگ بـکات و لێی گـەڕێ تەماشـای ئەو دارە گەورەیـە بکات کە لـە نوختـە تۆوێکـەوە هاتووەتـە بوون و بڵێت: "ئـەی مرۆڤ! تۆ بچووک نیت! ڕەنگە خاڵ یان نوختەیەک بیت، بـەڵام ڕازی جیهـان لـە تـۆدا شـاراوەیە! گـەر ئـەو نیعمەتانـەی پێـم بەخشـیویت بەهـەدەری نەدەیـت، تەختـی پادشـاییت پـێ دەبەخشـم، لقوپۆپ دەر دەکەیت و دەبیتـە نەمر و بـە نەشئە و جوانیـت ڕووناکـی دەپرژێنـی بەسـەر جیهانـدا."

ئەمە چ مژدەیەکی جوان بوو!

"ئێمـە مرۆڤمـان بـە جوانترین شـێواز بـەدی هێنـاوە و ئەوانـەی ئیمـان دەهێنن و کاری بـاش ئەنجـام دەدەن، پاداشـتی نەبڕاوە و بـەردەوام چاوەڕێیانـە. "

تـۆو نهێنیی بوون بـوو... لەنێوانیشـیاندا تـۆوی هەنجیر و زەیتوون پیرۆزترین بوون، زەیتوون شیفای دڵ و هەنجیر شیفای ڕۆح بوو و هەردووک سیمبوڵی بەرەکەت و خۆشگوزەرانی بوون، ئای لە عەلی، سندوقی شیفای چەندین سـەدە چەندە لە دارهەنجیر دەچوو! لەنیو تۆوی نوختەئاسـا بچووکیدا زانیاریی پێویستی بۆ دروسـتبوونی دارێکی لقدار هەڵگرتبوو، هەیبەتی نوختـەی ژێر پیتی 'ب'، 'بسـم اللـه' هەبوو و ئاشکرا بوو کە ڕۆژێک لـە ڕۆژان ڕاسـتگۆیی و وەفـای خـۆی بۆ زانسـت و زانیـن دەسلەمێنێت.

عەلـی لەنێـو بیرکردنـەوە و جیهانێکـی قـووڵ، زۆر قووڵـدا بـوو... هاوسـەرگیری، کـە هـۆکاری بەردەوامـی و زیادبوونـی مرۆڤایەتـی بـوو، چەنـدە شـتێکی سـەیر بـوو! چەنـد چەترێکـی مانـادار و پیـرۆز بـوو! چەنـد ڕەنـگ و چەنـد شـادی و چەنـد جیاوازیـی زۆری لەخـۆ دەگـرت! چەنـد تـۆو و چەنـد میـوە و چەنـد توخمـی لـێ دەکەوتـەوە... لـە لایەکـەوە دڕنـدە و فیرعـەون و نەمـرود و قـارون و زاڵمـەکان، لـە لایەکیشـەوە زنجیـرەی پێغەمبـەران و پیاوچـاکان و ئیمامەکانی لێ دەهاتـە بـوون. مەگـەر هەمـووی لەنێـو هەمـان تـۆوەوە سـەرچاوی نەدەگرت؟ چەنـدە لـە چەقۆیەکـی هـەردوو سـەر تیژ دەچـوو، لـە لایـەک هـۆکاری خێر و چاکـە بـوو بـۆ مرۆڤایەتـی، لـە لایـەک شـەڕ و خراپـە.

هاوسەرگیری دارێکی تایبەت بوو و لە هیچی دیکە نەچووبوو کە لەنێو خاکی ژیندا دەڕوا و تۆوێک بوو هەڵدەدرایە ئامێزی ژیان تا نەشونما بکات، ئاهەنگی ناوەکی و گونجانی جووتەکانیش لەگەڵ کاتدا نیشانی دەدا تۆوەکەیان سەر بە کام دارە، تۆو هەبوو هەر پێش ئەوەی چەکەرە بکات، دەڕزا و وشکی دەکرد، هەشبوو گەشەی دەکرد و میوەی دەبەخشی و هەشبوو وەک بەهارێکی هەمیشەیی سەوز و گوڵدار دەبوو، زستان و هاوینی زۆریان بەسەردا تێدەپەڕی، گشت دارەکان و ئەوانەی بەرگەی زوقم و بەستەڵەک و گڕەیان دەگرت، زەرد نەدەبوون، چوون بەردەوامی و سەنگینی وەختی سەختی گەلێ گرنگ بوو، دارەکە بە خۆشەویستی و موحیببەت بەهێزتر دەبوو و لەوپەڕی هێزیدا میوەی چێژبەخشی دەدا و بە جوانی و پێگەیشتوویی میوەکان، هاوسەرگیریی چاک دەناسرایەوە. میوە هەبوو گەنیو و تێکچوو، هەبوو تفت و ترش و هەیانبوو ژەهراوی و بکوژ و هەشبوو شیرین و مێخۆش بوو و دەبوون بە شیفای مرۆڤایەتی، دەی کە وایە ڕۆژی هاوسەرگیری تۆوی ئەو دارە نەبوو کە میوەکەی هێشتا نادیار بوو؟ هەر بۆیە هەڵبژاردنی کەسی دروست بۆ هاوسەرگیری گەلێک گرنگ بوو، گەر هەمەئاهەنگی و گونجان لەنێوانیاندا نەبووایە، تۆو هەر زوو دەڕزا و چرۆی نەدەکرد و خۆشەویستی و بەزەیی و گونجانی نێوان ئەو دوو کەسە لەگەڵ کاتدا دەبوو بە خونچە، دەبوو بە گوڵ، دەبوو بە میوە... بڵێی هاوسەرگیرییەکەی ئەوان لە کامە جۆر بێت؟ زەردەخەنەیەکی شکۆدارانە کەوتە سەر ڕوخساری عەلی...

کە وا بێ لەنێو تۆوی هەنجیردا ڕێکخستنی جیهان و لەنێو دڵی عەلیدا نهێنیی عیلم و زانین شاراوە بوو! ئەم هاوسەرگەرییە دەبوویە داری زانست و دانایی و بوێری و نەترسی! گەڵا و گوڵی هەنجیرئاسا نیشانەی بەرەکەت و لە هەمان کاتیشدا میوەی بەهەشت دەبوو! ئەی نهێنیی نێوان زەیتوون و هەنجیر چی بوو؟

فاتیمە وەک دارزەیتوون لە زەویی وشک و ڕەقوتەقدا چرۆی دەکرد؟ زەیتوونئاسا لقی دەگەشتە سەختترین و دەستپێنەگەیشتوترین جێگە؟ زەیتوون هەم بەر بوو، هەم ڕووناکی، هەمیش قووت و خۆراک، فاتیمە هەم ڕەوشت بوو، هەم حەیا، هەم پاکی. زەیتوون هۆکاری شادیی پێغەمبەر نوح بوو، سیمبوڵی ئاشتی و ژیان و لە چیرۆکی قەدیمیی کێوی توردا زەیتوون بەئاشکرا نیشانەی زۆری و بەرەکەت بوو، کە وا بێ، لە لێکدانەوەی ئەم خەونەدا زەیتوون فاتیمە و عەلی هەنجیرەکە بوو؟ مژدەی ژیانێکی شکۆمەندانە و بەرەکەتدار بوو؟ بڵێی لێکدەرەوەی خەونی گشت سەدەکان بەم جۆرە ئەو خەونە لێک بدەنەوە؟ گوڵە هەنجیرەکانی نێو دڵی عەلی لە جۆشوخرۆشدا ڕەنگی نوێیان دەپۆشی و بەدەم جریوە و ئاوازی بولبولە عەرەبییەکانەوە دیسان سوپاسگوزاریی خودای کرد. نهێنیی عەلی لەنێو ئەم چیرۆکە قەدیمەدا ناکۆتا بوو، لەمەبەدوا لەژێر پارێزگاریی تەواوەتی پێغەمبەردا بوو هەر بۆیە ئەرخەیان بوو، لە هەر سووچێکەوە تەماشای دەکرد، لەسەر ڕێیەکی خێردار بوو و بە تاسە و خۆشییەوە دەستی

بـۆ خـودای ئاسـمان بـەرز کـردەوە و نـزا و وێـردی نێـو دڵـی ڕشـتە سـەر زاری:

"ئەی ئاگا بە نەبینراوان،

ئەی داپۆشەری عەیبان،

ئەی لابەری ناخۆشییەکان،

ئەی خاوەنی دڵان،

ئەی ڕازێنەرەوەی دڵان،

ئەی ڕۆشنکەرەوەی دڵان،

ئەی تەبیبی دڵان،

ئەی یاری دڵان،

ئەی دۆستی دڵان،

ئـەی خاڵـی لـە گشـت خـەوش و نەنگییـەکان، ئیمانـم زیـاد بکەیـت و هـەردەم بەدەممـەوە بیـت."



## فاتیمەی نوری چاوی خۆشەویست

«سێ شت ئاگادارانە هەڵبژێرە:

هاوسەرت، کارەکەت، هاوڕێکەت.»

" حەزرەتی عەلی"

هەمووان بە مەراقێکی زۆرەوە چاوەڕێی ڕۆژی زەماوەند بوون و سەرقاڵی و جۆشوخرۆشێکی لەڕادەبەدەر خانەوادەی ئەبوتاڵیبی تەنیبوو. کیژە گەنجەکانی مەدینە چاوەڕێی بینینی فاتیمە بوون بە بووکی و کوڕان چاوەڕێ بوون بزانن عەلی چ جۆرە زەماوەندێک ساز دەکات و گەوران لە مەراقی ئەوەدا بوون زەماوەند لە چ ڕۆژێکدا ساز دەکرێت. ئەم سەرقاڵی و شپرزەییە شیرینە لە هەمووان زیاتر عەلیی گرتبووەوە، عەلی، کە تا ئەو ڕۆژە تەمەنی لە گەیاندنی وەحی و سەرقاڵییەکانیدا بەسەر بردبوو و بچووکترین مەیلیشی بۆ هاوسەرگیری نەبوو، ئێستا لەپڕ کەوتبوویە ناوەڕاستی ئامادەکارییەکانی و دەیزانی ئەو گەنجینەیەی داویەتی بە کۆڵیدا قورسە. عومرێک ئەمانەتی ئەو دەکرا، گیانێکی پێ دەبەخشرا، نا لە گیان زیاتر، ئازیزترینی گیانی گیانانی پێ دەبەخشرا! چۆن هەڵنەلەرزێ لە حەیبەتدا! بەرپەرسیارێتییەکەی لە دڵخۆشییەکەی زیاتر و گەورەتر و دڵی

وەک مەیدانی جەنگ هەزار پارچە بوو، لە چەندین لاوە چەندین پرسیار و دڵەڕاوکێ هێرشیان دەبردە سەر هۆش و فیکری و لە هەمان کاتیشدا نوقمی دەریای مەراق و جۆش و شادی و سوپاسگوزاری بوو، شەوی بە هەزار پرسیار و هەزار و یەک خەم لێ دەبوویە ڕۆژ و سوپاسی بێپایانی ئەو خودایەشی دەکرد کە فاتیمەی وەک هاوڕێگا پێ بەخشیوە.

ئەمە چ ئەمانەتێک بوو دەستی دابوویە خودایە! چ دیارییەک! چ بەخششێک! بەردەوام لەژێر گەورەیی ئەو ئەمانەتەی پێی بەخشراوە هەڵدەلەرزی... وتەکانی چەند ساڵێک لەمەوبەری پێغەمبەری دەهاتەوە یاد، ئەو کات فاتیمە کیژۆڵەیەکی جوانی بچکۆلانە بوو و باوکی نوری چاوی دەستی گرتبوو و فەرمووبووی: "هەرکێ ئەم کچەم دەناسێ، با باش بیناسێ! بە ئەوانەشی دەناسێنم کە نایناسن، ئەمە کچی موحەممەدە، پارچەیەکە لە من، دڵی منە، گیانی منە، ئەو ڕۆحەمە کە لە هەردوو لاوە بە گیانم دەورە دراوە، هەرکێ ئازاری ئەو بدات، ئازاری منی داوە و هەرکێ من برەنجێنێ، خودای ڕەنجاندووە."

عەلی دووبارە هەڵلەرزی لە قورسیی گەنجینەکەی، بەڵام قەیدی نییە، ئەوەی کە لەمەبەدوا فاتیمەی باشتر دەناسی و نزیکتر دەبوو لێی و قووڵتر لێی تێدەگەشت و دەیزانی جیاوازیی ئەو و ئەوانی دی چییە، هەموو دونیای دەهێنا!

بەیەکەوە لە هەمان ماڵدا گەورە ببوون و لە هەمان دۆلکە ئاویان خواردبوویەوە و لەدوای پێغەمبەر یەکەمینەکان بوون کە شنەبای ئاسمانیی جوبریلیان بەر کەوتبوو، خاوەنی ڕەوشتێکی

ناسک و پەروەردەیەکی جیاواز بوون و دەیزانی تەنانەت لەنێو مەدرەسەی پەروەردەی پێغەمبەردا فاتیمە جیاوازتر پەروەردە کراوە و ئاگاداری ناسکی و پاکی و شەرم و شکۆی بوو، بەڵام دڵنیا بوو زۆر لەوە زیاترە و دەبێت زیاتر بیناسێت، ئینجا دەزانێت بۆ پێغەمبەرەکەی خودا ئەو قسانەی دەربارە کردووە. نهێنیی ئەو فاتیمەیە چی بوو کە تا ئەو ڕۆژە وەک گوڵەباخێکی شۆخوشەنگ و دوور لە چاوان نەشونمای کردبوو؟ بۆچی ئەوەندە لای پێغەمبەر نازدار بوو؟ عەلی ڕێی کەوتبوویە چ گەنجینەیەک؟ چی لەنێو دەروونیدا حەشار درابوو ئەم نازەنینەی بەهەشت؟ با لەژێر یەک بنمیچیشدا گەورە بووبن، زۆر حاڵ و ڕەفتاری هەبوو لە هەمووان شاراوە، هەر بۆیە هیچ ئاگاداری جیهانی ناوەکیی فاتیمە نەبوو.

عەلی هەمیشە لە هەوڵی پاراستن و ئاگاداریی وردی ڕەسولدا بوو و هەرگیز بیری لە هیچی دیکە نەکردبوویەوە و جیهانی ناوەکیی تەنها ئەوی تێدا بوو، فیکر و هۆش و دڵ و ڕۆح و ئەودیو پەنهانکانیشی هەموو هەر ئەو بوو، ئەوەی هەبوو پێغەمبەری خودا و ڕێگاکەی بوو. ببوو بە خاکی ڕێی و هەرگیز چاوی لە هیچی دی نەبوو، کاتی بیرکردنەوەی لە خۆشی نەمابوو، جا بگات بە هاوسەرگیری و هاوسەر و ماڵ و منداڵ، ئەوەندە چاوی لەسەر پەیامەکەی ڕەسول گیر کردبوو، هیچی دیکەی نەدەبینی، زیان بە موویەکی حوشترەکەی بەردەرگای ڕەسول بگەشتایە، دەستبەجێ عەلی هەڵدەستایە سەر پێ... لەگەڵ فاتیمەدا لە تەمەنێکی هێندە بچووکەوە خۆیان خستبوویە ژێر بەرپرسیارێتیی پاراستنی

پەیامەکەی ڕەسول، هیچ جۆرە سەرقاڵییەکی دیکە سەری لە ماڵی ڕۆحیان نەدابوو. هەردووکیان لەنێو هەمان ئاگری ئاگاداری و چاودێریکردنی خۆشەویستدا پیشابوون، هەردووک لە دۆڵی شەیب ئازارێکی زیاتر لە برسێتییەکەیان چەقیبوو بە ڕۆحیاندا. عەلی بۆ یەکەم جار ڕێی بە ئەو ئاسۆ و خەیاڵەی دا کە تا ئەو ڕۆژە جگە ڕەسول، کەس پێیدا گوزەری نەکردبوو بچێت بۆ لای فاتیمە! خەیاڵی فاتیمەی دەکرد؟ فاتیمە کێ بوو؟ کەسێکی چۆن بوو؟ هەڵبەت لە گرنگیپێدان و خۆشەویستیی زۆری ڕەسولەوە بۆی دەیزانی چەند بەنرخە، بەڵام نا، وەک مرۆڤێک، کەسێکی چۆن بوو؟ ئەم کچەی نەبی، کە خەڵکی زۆریان خۆش دەویست و جێی بایەخی هەمووان بوو، کێ بوو؟

عەلی ڕێی گەشتی لەنزیکەوەناسینی ئەو خونچەیەی گرت کە لە لووتکەی چیا بەرزەکان چەکەرەی کردبوو، ئەمانەتەکەی گەورە و ئەو جێیەی لە دڵیدا گرتبووی گەورەتر بوو، بڵێی بتوانێت بێ ئەوەی بیڕاکێنێ و بیپروێنێ، سەوز و گەش بیهێڵێتەوە؟ دەتوت ڕێیەکی بەرەو ڕوو کراوەتەوە، هونەرمەند و وەستا کۆنەکان ورد و جوان کۆڵیبێتیان و دەیویست بە هەنگاوی سەنگین و قورس ئەم ڕێیە ببڕێت کە قەدەر بۆی نەخشاندووە و وەک هەر گەنجێکی دیکە، کە نیازی هاوسەرگیریی هەیە، دەبووایە هەنگاوی ڕاست و دروست بنێ و لەنێو مەراق و سەرقاڵییەکی زۆردا چاوەڕێی ڕۆژی زەماوەند بوو و جۆش و خرۆشی نێو دڵی شەپۆلی دەدا...



# بەشی دووەم

## الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

میهربەخشی میهرەبانە

(فاتیحە، ٣)



## ڕۆژی یەکەمی چاوەڕوانیی عەلی

## گوڵی گیانی خۆشەویست: فاتیمە

لەنیو باخە خورماکانی یەسریبدا بازنەی موحیببەت و باسوخواس و سفرەی دورودرێژ ڕاخرابوو و کۆمەڵێک هەڵدەستان و کۆمەڵێک دادەنیشتن و دۆستایەتییەکی لە هیچ جێیەک نەبینراو هەبوو لەنێوانیاندا و سەرچاوەی ئەم هەموو خۆشەویستی و بەیەکەوەبوونەش پێغەمبەر و کچی لە گیان شیرینتر و زاوا خۆشەویستەکەی بوون. لەسەر یەکێک لەو سفرانە باس باسی فاتیمە بوو، دایەنەکەی پێغەمبەر دەستی کرد بە قسە و گوتی: "من کە ناوم بەرەکەیە و کۆیلەیەک بووم، بیابانی کاکیبەکاکی و ڕەنگ ئاڵتوونیی یەمەنم بڕیوە و کۆیلەیەکی ڕەشپێستی دیارێکی دیکەم، لە خاکێکەوە هاتووم لە دڵی ئەو کچانە بەژانتر و بێکەستر کە بە درێژایی شەوی تاریک دەلاوێنەوە، لمی برژاو و سوورەوەبوو وەک چاوی مارەکانی بیابان و ڕەنگ خۆڵەمێشیم تەی کردووە و هاتووم، لە جوگرافیا و خاکێکی ڕەشوڕووتەوە هاتووم و بەخت یاوەرم بوو و تیشکی ڕۆژ بەرەو ڕووم پێکەنی، هاتم و دەیانگوت پێ

و قەدەمم بەخێر بووە و بەرەکەتم هێناوە لە خاکی یەمەنەوە بۆ حیجاز، هەر بۆیە نازناوی 'بەرەکە'یان لێ نام و لە ماڵی عەبدولموتەڵیبدا گەشتم بە گەورترینی بەختەکان و شایەتحاڵی ساتی لەدایکبوونی عەزیزترین باوکی دونیا و ناوازەترین کچی زەمین بووم. زۆرم دیوە و زۆرم چەشتووە و لەنێو چاوەکانی فاتیمەی عەزیزی نەبیدا پەیم بە گەلێ شت بردووە، بەندەری دەریای نهێنییەکانە فاتیمە، تاکە سندوقی نهێنییەکانی ڕەسولە فاتیمە، دڵێکی هەیە ڕازەکان دەزانێ و پەیی پێ دەبا، پەیی پێ دەبا و بێدەنگ دەبێت، بێدەنگ دەبێت و قوڵپ دەدات...

مۆری قەدیمی غەیب لەنیو ڕوانینە خۆرئاسا ڕووناکەکانیدا حەشار دراوە، هەست بە کزەبا و فێنکایی شەوانی ڕۆحهەژێنی بیابان دەکەی تێیدا، خەمبەرە، شادیهێنە، هەمدەردە..."

موسڵمانە نوێیەکان زۆر مەراقی کچەکەی ڕەسولیان بوو و چەندین بیرکردنەوە بە زەینیاندا دەهات و دەچوو، ئەو فاتیمەیە کێ بوو کە تا ئەو ساتە زۆر شتیان لەسەر بیستبوو و نەیاندەناسی؟ چۆن بوو؟ حیکایەتەکەی چی بوو؟ بە هەمان مەراق و حەزی زانین لەنێو چاوانیاندا دەیانپرسی: "چ ڕازێکی تێدایە؟ کێ دەزانێت لە ڕۆژی لەدایکبوونیەوە تا ئێستا چیت لێ دیوە، نهێنییەکانی با لەلای خۆت بمێنن، بەڵام حەز دەکەین حاڵ و ڕەفتارە ئاشکراکانی بزانین."

ژنان و کچانی پشتیوانان نەفەسیان گرتبوو و چاوەڕێی تاکە وشەیەک بوون لە زاری بەرەکە بێتە دەر و بەرەکەش، کە لەنێو خەت و خاڵەکانی ڕوخساریدا چەندین حیکایەتی قەدیم

شاراوه بوو، لەوه دەچوو شتانێک بگێڕێتەوه تا ئەو ساتە کەس نەیبیستبێت و بە دەربڕینی نەرم و شکۆدارانه و پاش ئەوەی هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی، دەستی کرد بە گێڕانەوەی ساتی لەدایکبوونی فاتیمە: "کۆتا سکپڕیی خەدیجەی شاژنی مەککە بوو و لەگەڵ ئەوەی تەمەنی سەروو چل ساڵان بوو، چەشنی کیژێکی لاو جوان و شۆخوشەنگ بوو و خەدیجە لە ماوەی ئەم سکپڕییەیدا جیاواز لە هەموو ئەوانی پێشووی، پەیوەندییەکی سەیری لەگەڵ کۆرپەکەیدا هەبوو، وەک بڵێی لەگەڵیدا بدوێت، بیستبووم کە عیسای نەبی بەمەلۆتکەیی هاتبوویە گۆ و قسەی کردبوو، بەڵام ئەوەی منداڵێک لەنێو سکی دایکیدا لەگەڵ دایکی بدوێ، شتێکی مەحاڵ بوو، بەڵام خەدیجە ئەوەندە ببوو بە دۆستی کۆرپەکەی، هەرکات بەتەنها لە ژوورێکدا بووایە، قسەی بۆ ئەو دەکرد وشیرین-شیرین دەیلاوەندەوە و هەندێک جار ئازیز دەیپرسی: "لەگەڵ کێ قسە دەکەیت ئەی خەدیجە!" وەڵامی دەدایەوە: "لەگەڵ ئەو! لەگەڵ کۆرپەکەی سکمدا! من هەرکات تەنها بم، لەگەڵ ئەو دەدوێم و دەردەدڵی لەلا دەکەم." لەنێو موحیببەت و خۆشەویستی و جوانی و سوپاسگوزارییەکی نەبڕاوەی دوو دڵی جواندا ڕۆژانی سکپڕی وەک ئاو تێپەڕی و وەختی خۆی نزیک بوویەوە و هەموو خەڵکی مەککە لە مەراقێکی زۆردا بوون، بڵێی ئەم جارەیش کچ بێت؟ یان کوڕ؟ هەمووان هیوادار بوون کچ بێت و خۆشەویست کوڕی نەبێت، کات نزیک بوویەوە و ژان و ئازاری خەدیجە دەستی پێ کرد و هەواڵ بۆ مامانە بەناوبانگەکانی شار ڕەوانە کرا، بەڵام نەک نەهاتن، وەڵامێکی

قورس و شکێنەریشیان بە هەواڵبەرەکاندا ناردەوە: "شووت کرد بە کوڕە هەتیوەکەی عەبدوڵڵا و یاساکانمانت ژێر پێ خستووە، مانای ناو و ناوبانگ و خانەوادەت شکاند، دابونەریتەکانی قورەیشت شکاند و تووشی سەرشۆڕیت کردین و ئێستاش بچۆ بە مامانە دەشتنشینەکان بڵێ بێن بەدەمتەوە."

گەرچی چەندین ساڵ بەسەر هاوسەرگیرییەکەیدا تێپەڕیبوو، ڕق و قینیان بەرامبەر خەدیجە هیچ کەمی نەکردبوو و مامەڵە و گوفتارەکانیان یەک لە یەک ڕەقتر بوو و دەیانوت: "خۆتت بەفیڕۆ دا." "دەبووایە هاوسەرگیری لەگەڵ کەسانی وەک عەمری بەنومەحزوم ناودار و دەوڵەمەنددا بکردایە، بەڵام تۆ هەموویانت ڕەت کردەوە و ماڵومولک و شانوشەوکەتت دایە دەست پیاوێکی بێکەس و بێناو، ئێستا دەتەوێت بێین و ئازار و ژانت کەم بکەینەوە. "

خەدیجە ئەو شەوە گەلێ غەمبار بوو، لە لایەکەوە ژانی منداڵبوون و لە لایەکی دیکەوە جێهێشتنی لەلایەن خەڵکی و تەنهایی و قسە ڕەقەکانیان زۆر دڵی ئێشاند، دڵتەنگ بوو چوون ئەو نورەی ئەو لە خۆشەویستدا دیبووی، ئەوان نەیاندەبینی، ئەو ئینسانگەلە کە تاکە بەهایان پارە بوو و عەقڵیان لە چاویاندا بوو، گەورەیی و مەزنیی ئەویان نەدەبینی.

ژنانی گوێگر سەریان سووڕ مابوو بەرامبەر نابینایی و بێئاگایی قورەیش و دەیانگوت: "ئەوەی لە شەوی منداڵبوونیشیدا کینە و ڕقیان دانەمرکاوە، نیشانەی وشکبوونی مرۆڤایەتییە، خودا دەزانێت چەند سەخت لێی گوزەراوە ئەو شەوە..."

بەرەکە بەردەوام بوو لە گێڕانەوە: "گوڵ و گەڵای دارەکانی نێو حەوشەکە هەموو باخەکەی گرتبوویەوە و بەسەر دیوارەکاندا شۆڕ بووبوویەوە و لە نافورەی ناوەڕاستی باخچەکەوە ئاوێکی شیرین خوڕەی دەهات و تۆزقاڵێک پەژارە و بێئۆقرەیی لە ڕوخساری ئازیزدا نەدەبینرا. پێیەکانی لەسەر زەوی و دەستەکانی بەرەو ئاسمان لە نزا و پاڕانەوەی خۆیدا بوو، من چەند شپرزە بووم، ئەو دوو ئەوەندە ئارام و ئارامی و دڵنیاییەکەی ئەو منیشی ئەرخەیان دەکرد. خەدیجە بۆ ساتێک بێئاگا بوو، یاخود خەیاڵ بردیەوە و دواتر کە بەئاگا هاتەوە بۆی باس کردم، هەیهات لەو ساتەدا چەند شت ڕووی دابوو، ‹لە ژان و ئازاردا بووم و لەناکاو دەرگاکە کرایەوە و چوار ژنی شۆخوشەنگ هاتنە ژورێ، لە ژنانی بەنی هاشم دەچوون لە ناسکیدا، سەرەتا زۆر ترسام و لە ناخمدا دەمپرسی ئەم شۆخوشەنگانە کێن لەنێو ماڵەکەمدا؟ وەک بڵێی ترس و دڵڕاوکێکەیان بینیبێتم، یەکێکیان فەرمووی: "مەترسە ئەی خەدیجە! دۆستین! بۆ هاوکاریت هاتووین، ئێمە دەستەخوشکانی تۆین لە بەهەشت!"

"دەستە خوشکانی من کێن؟"

"من سارای ژنی ئیبراهیم نەبیم، خودای گەورە ڕەوانەی کردووین تا لە ساتەوەختی منداڵبووندا ژان و ئازارت کەم بکەینەوە." دواتر خانمی تەنیشتی خۆی ناساند: «منیش مەریەمی کچی عیمرانم، دایکی عیسا؛ مەترسە، ئێمەت لەگەڵین.» دواتر ئەوی دیکەیان لێم نزیک بوویەوە: «منیش

ئاسیای ژنی فیرعەون و دایکی دووەمی موسام.» من لەوپەڕی سەرسووڕماندا بووم و کۆتا جوان خۆی ناساند، «منیش کەلسومی خوشکی موسای کەلیمواللەم، ساتی منداڵبوون، تایبەتترین ساتی هەر ژنێکە و لەم ساتەدا کە هەموو ژنێ پێویستی بە چەند ژنێکی هاوخەمە لەدەوری بن، بە فەرمانی خودا هاتووین بۆ لات، دەزانین تەنهایت و پێویستت بە هاوکارییە! خەم مەخۆ! ئێمەت هەین..."

سارا هاتە لای ڕاستم و مەریەم لای چەپم و ئاسیا بەرامبەرم و کەلسومیش لە ڕاسەرم ڕەوەستا و ئارامییەکی شیرین گشت گیانی داگرتم، دەستیان گرتبووم و عەرەقەی نێوچاویان دەسڕیم و وشەی جوانیان دەچرپاند بە گوێمدا و هەوایەکی فێنک بە ژوورەکەدا گوزەری دەکرد و نە تەنهاییم ما، نە ترس و خەم و بە خۆم گوت: «ئەی خەدیجە، دەبێت ئەم کۆرپەیەی لە سکتدایە زۆر خۆشەویستی خودا بێت کە ژنانی لەم جۆرەی ناردووە بۆ مامانیت، بەختی وا ڕوو لە چەند کەس دەکات!» ئازارم نەما و لە بەرەبەیانێکی هەینیدا، وەک بڵێی ئەمانەتێکی گەورە پێشکەش بە خاوەنەکەی بکەم، فاتیمەم پێشکەش بە دونیا کرد... هەرچوار خانمی شۆخوشەنگ لە باوەشیان گرت و ڕووناکییەکی جیاواز ژوورەکەی گرت و نور چاوی دەتروکاند و چاوی بە دونیا هەڵهێنا، لە جیهانێکی باسنەکراودا بووم لەنێوان خەون و خەیاڵ و ڕاستیدا و خانمانی شکۆمەند پێیان گوتم: «ئەی خەدیجە! ئەم کۆرپەیەت، کە خاوەن نەوەی بەرەکتدار و شەرەفمەندە، لەباوەش بگرە،

دایکی وەچەیەکی گەلێک پیرۆزە، جوان ئاگاداری بە!' دەنگیان ئێستاش لە گوێمدا دەزرنگێتەوە کە دەیانوت:

«بەرەکەت و ڕێز و شکۆ بۆ خۆی و نەوەکانیشی بڕیار دراوە.»

«سڵاو لە خۆی و وەچەکانیشی.»

کاتێ چاوم کردەوە، هیچکامیان بە ڕاسەرمەوە نەمابوون و کچە بچکۆلانەکەم لەباوەش گرت و شیرم پێ دا و لەوەش سەیرتر ئەوە بوو لە منداڵەکانی پێشوو شیرم زۆر کەم بوو، بەڵام لە فاتیمەدا هێندە زۆر بوو، بە لالێویدا دەهاتە خوارەوە، ئای لەو ساتەدا چەندە بەختیار و خۆشبەخت بووم...'»

هیچکەس نقەی لێ نەدەهات و ژنانی پشتیوانان بۆ یەکەمین جار ئەم چیرۆکەیان دەبیست و چاو و گوێیان لەسەر بەرەکە گیر کردبوو و بەرەکە بەردەوام بوو: "بەڵێ، ساتی لەدایکبوونی فاتیمە بەم جۆرە بوو گیانەکان! ساتێکی لەدایکبوونی تەلیسمئاسا و نهێنیئامێز، کە تا ئێستا هیچکەس نازانێت خەون بوو، یان خەیاڵ، یاخود سەراب! تاکە شتێک زانراو بێت، ئەوەیە خەدیجە سکپڕییەکی یەجار جیاوازی هەبوو لەوانی پێشووی و لە کاتێکدا لە ئەو ڕۆژانەی مەککەدا هەرکێ کچی ببووایە، ڕوخساری ڕەش دادەگیرسا و چەندین ڕۆژ خۆی نیشانی هاوسەری نەدەدا و شەرمی لە کۆمەڵگا دەکرد، خەدیجە بە زەردەخەنەیەکی فراوان و سوپاسگوزارییەکی بێپایانەوە کۆرپەکەی دایە دەستی هاوسەری و تەماشایەکی یەکدییان کرد و چاویان وەک دڵیان خۆشیی لێ دەڕژا. تا

ئەو ڕۆژە ساتی لەدایکبوونی گەلێ منداڵم دیبوو، بەڵام لە هیچیاندا خۆشەویستی و موحیببەت و خۆشبەختیی نێوان خۆشەویست و خەدیجەم نەدیبوو لەو ساتەدا. خۆشەویست بەخۆشحاڵییەوە خونچەی گیانی لەباوەش گرت و فەرمووی: 'من تەنها ئەوەم لەسەرە بۆنی ئەم گوڵە بکەم و خودا خۆی ڕزقوڕۆزییەکەی دەنێرێت.' خەدیجە، لەبەر ئەوەی شیری کەم بوو لە منداڵەکانی پێشوویدا، پاش لەدایکبوون دەیدایە دەست دایەنێک شیری پێ بدات، بەڵام لە فاتیمەدا پێویستی نەبوو و هەر لەلای خۆی مایەوە و وەک پێشینان دەڵێن، لەگەڵ لەدایکبوونی منداڵی کچدا، ڕزقوڕۆزی بەسەر باوکیاندا دەڕژێت و لەپاش لەدایکبوونی فاتیمە، چەند ئەوەندە بەرەکەتی ماڵمان زیادی کرد و خۆشی و شادییشمان چەند ئەوەندە زیادی کردبوو، ئەمەش ئەوەندەی دی سەری لە هەمووان شێواندبوو، ئەمە چ چاوگێکی خۆشەویستی و چ دەریایەکی موحیببەت بوو وا لەدوای لە دایکبوونی چوار منداڵی 'کچ'دا زەڕەیەک کەمی نەدەکرد، لە ماڵی هەمووان بە لەدایکبوونی کچ ماتەم و شین دەبووە مۆتەکەی ئەو ماڵە و لەماڵی ڕاستگۆی ئەمین خۆر هەڵهاتبوو... خۆری فاتیمە...»



## ڕۆژی دووەمی چاوەڕوانیی عەلی

## فاتیمەی کوبرا

بەرەکە چاوە پڕ ئەزموونەکانی بڕیبوویە بۆشایی و بەردەوام بوو لە گێڕانەوە و گوێگران هەناسەیان بڕیبوو و گوێیان شلکردبوو و ژنێکی بەتەمەن وتی: «ئای چ بەختێکە لەو ساتەدا ئامادە بوویت! بڵێی ساتی لەدایکبوونی ڕەسول چۆن بووبێت!» بەرەکە زەردەخەنەیەکی کرد و چەند دڵۆپێک فرمێسک لە کەناری چاوەکانی کۆ بوونەوە و فەرمووی، «ئەویان چیرۆکێکی دورودرێژ و شەوێکی گەلێ جیاواز بوو...»

"گەر باسێکی کورتی ئەو شەوە مانادارەشتان بۆ نەکەم، حیکایەتەکە نیوەوناچڵ دەبێت، ئەو شەوە ئەستێرەکان چڕ و پڕ دەدرەوشانەوە و ڕەنگدانەوەکەیان لەنێو بیری ئاوەکاندا زۆر ڕوناکتر و پرشنگدارتر بوو، ئەو شەوە زۆر شت ڕووی دا، زۆر شت، جوانی و نورێکی بێوێنە دەوری داین و دواتریش بیستمان کە ئاگری سەد ساڵەی مەجوسییەکان کوژاوەتەوە، گۆمی سەوا وشکی کردووە، سەماوە لافاو بردوویەتی و هەرچواردە پایە ئاڵتوونییەکەی فارس بە یەک جار داڕماوە.

لە ماوەی گەورەبوونیشیدا زۆرم چەشت لە خەم و خۆشی و کە تەمەنی گەیشتە پێنج ساڵان، بە سەردان چووین بۆلای خاڵەکانی بۆ یەسریب و لە ڕێگەی گەڕانەوە ئامینەی دایکی نەخۆش کەوت و لە کاروان جیا بووینەوە و ئەو دایکە نازدار و ناسکە لە کۆتا ساتەکانی ژیانیدا منداڵەکەی لەتەنیش خۆیدا دانیشاند و لە چاوەکانی دەڕوانی و چپەی بۆ دەکرد و نزیک بوومەوە و نوشتامەوە، تەماشا دەکەم هۆنراوەیەکی بۆ دەهۆنێتەوە، هەرچیی نهێنیی جیهانە تێیدا جێی ببوویەوە! نەبا ترس و خەمی ساتی مردن منداڵەکەی دڵتەنگ بکات، بە هۆنراوە ماڵئاوایی لە کوڕەکەی دەکرد، فرمێسک هۆن-هۆن بە گۆنایدا دەهاتە خوار و بە دەنگێکی کز و لەرزۆک بە گوێیدا دەچپاند:

ئەی خۆشەویستترینم!
نەکەی دڵتەنگ بی بەوەی بەسەرمدا دێت،
لەبیرت نەچێ!
گشت زیندوویەک دەمرێ،
گشت نوێیەک کۆن دەبێ،
گشت هەبوویەک کۆچ دەکات،
منیش وا ئیدی کۆچ دەکەم،
بەڵام کۆچێکی خۆشبەختانە،
چوون ڕۆڵەیەکی وەک تۆ پاک و نازدار
جێ دەهێڵم!
دەڕۆم و دڵخۆشترینم کە منداڵێکی وەک تۆم هەبوو...

دەچم، وەلێ دڵنیام گیانە،

هەرگیز لەیاد ناچم'

هەر لە جێی خۆیدا گیانی سپارد و لە ئەبواء ناشتمان، گریاین... زۆر گریاین، لە کۆتاییدا فرمێسکەکانی موحەممەدم سڕی و پێم گوت، 'ملمان لە موو باریکترە بەرامبەر شمشێری قەدەر، گیان هیی تاکە و هەمووان هیی ئەوین و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە.'

فەرمووی: 'دەزانم... بەڵام ڕوخساری دایک ڕوویەکە هەرگیز لەیاد ناکرێت...'

بەڵێ، ڕاستی دەکرد، ڕووی دایک لەنێو ڕۆحی ئینساندا دەنەخشێت و مەحاڵە لەیاد بکرێت...

بە دەستێکمەوە حوشترەکەی ئامینە و بە دەستەکەی دیکەش دەستی موحەممەدم گرتبوو و تێکەڵ بە کاروانێکی نەناسراو بووین و بیابانی دووروودرێژمان بە ئەو خەمە گەورەیەوە بڕی و هەرگیز خەم و شکانی نێو چاوەکانی عەبدولموتەڵیبم بیر ناچێت ئەو ساتەی موحەممەدم تەسلیم کرد."

هەندێک لە چاوەکان تەڕ ببوون و بەرەکە بەردەوام بوو: "فاتیمە گیانیش وەک باوکی زۆر زوو دایکی لەدەست دا و نەک هەر فاتیمە، مەککەش لە نەبوونی خەدیجەدا هەڵدەلەرزی و هەموو سپێدەی بەرەبەیانێک فرمێسکی ڕوون و پاک بەسەر گۆنای فاتیمەی بچووکدا دەهاتە خوارەوە و دەیپرسی: ‹باوکە گیان! دایکم لەکوێیە!›

وەڵامی دەدایەوە: ‹فرمێسکەکانت بسڕە گیانی من! دایکت ئێستا لە کۆشکێکدا دەژی، پایەکانی بە مرواری و یاقووت و مەرجان ڕازێنراونەتەوە.›

دیسان بەیانی دەبوویەوە و چاوەکانی دبڕییە چاوی باوکی و وەک کۆترێکی باڵشکاو دیسان دەیپرسی: ‹باوکە گیان... دایکم... دایکم لەکوێیە؟› جارێک لەو جارانەی ڕەسول هەوڵی دەدا فاتیمە ئارام بکاتەوە، جوبریل هاتە خزمەتی و فەرمووی: ‹خودای گەورە سڵاو لە فاتیمە دەکات و فەرمانی کرد پێی بفەرموویت: دایکت لە کۆشکێکدایە دیوارەکانی لە ئاڵتوون و پایەکانی لە یاقووتی سوور دروست کراون و لەگەڵ ئاسیای ژنی فیرعەون و مەریەمی کچی عیمراندایە.›

حەزرەتی میهرەبانی هەواڵەکەی بە فاتیمە دا و فاتیمە گوتی: 'لە کۆشکەکەی خۆمان؟' نەبی وەڵامی دایەوە: ‹نەخێر! کۆشکێک بە مرواری ڕازێنراوە و بێدەنگ و ئارام و دوور لە ماندووبوون و شەکەتی.››

فاتیمە بە زۆر نارەحەتیدا تێپەڕی تا لە ژیانێکی بێ خەدیجەدا ببێت بە خەدیجە! هەرکەس توانا و پێگەیشتوویی و تێگەشتوویی فاتیمەی بینیبێت، سەری لێی دەسووڕما و گەرچی منداڵ بوو، نازناوێکی گەورەی لێ نرابوو: فاتیمەتول کوبرا! چوون دوای دایکی، گەورەترین پشتگیریی باوکی بوو.



## ڕۆژی سێیەمی چاوەڕوانیی عەلی

## فاتیمەی بەتول

یەکێک لە دانیشتووانی کۆبوونەوەکە، کە بە ڕەوشتێکی بێوێنە و شەرم و شکۆیەکی پێناسەنەکراو ناوبانگی دەر کردبوو، خاتوو زەینەبی ناسراو بە ئومورڕومان بوو، یەکێک بوو لە ژنە ناسراوەکانی مەککە و وەک کچی خۆی فاتیمەی خۆش دەویست و لە کەم کۆبوونەوەدا بەشدار دەبوو و بەدەگمەن دەبیسترا باس لە هیچ بکات و بدوێت، وەلێ کە باس باسی فاتیمە بوو، خۆی پێ نەگیرا و گوتی: «یەکێک لە نازناوەکانی فاتیمەی کچی ڕەسول 'بەتول'ە، کە بە مانای کەسێکی بێهاوشێوە و دوور لە پیسی و زۆر پاک دێت و نازناوێکە لە ئەو کەسانە دەنرێت کە زۆر گرنگی بە پاکیزەیی و کەسایەتی و شکۆیان دەدەن و فاتیمە پێناسەی ئەو نازناوەیە، پاکیزەیە و ڕوولەخوایە، هەر بۆیە ئەم نازناوەشی پێ بەخشراوە. هەر دڵێ ئاشنا بێت بە فاتیمە، دەستەوەسان دەبێت لەئاست گەورەیی خودا و هەر چاوێ فاتیمە ببینێت، ئیدی ڕووی نایەت بۆ جارێکیش تەماشای حەرام بە ئەو چاوانە بکات،

چوون هەر چاوێ حەرامی زۆر بینی، دەرگاکانی دڵی هێواش-هێواش دادەخرێن، هەر دڵێ فاتیمە بناسێت، دەزانێت دڵ و چاو دیارییەکی قەدیمی خودان بۆ بەندە و دەیانپارێزێت لە پیسی و دڵی دادەخورپێت بە کەلامی خودا، کە دەڵێت: 'خودا دەزانێت کامە چاو پیسە و لە حەرام دەڕوانێ و دەشزانێ لەنێو دڵەکاندا چی حەشار دراوە' و فاتیمە لە هەمووان زیاتر لە گەورەیی ئەو ئایەتەدا دەلەرزێت و گەر لە من بپرسن، دەڵێم فاتیمە بە پەروەردەی ناسکی ئەهلی بەهەشت پەروەردە کراوە و وەک چۆن دایکی 'طاهرە' 'پاکیزە' بوو، فاتیمەش 'بتول' 'پاکژ' و ئاوریشمی پاکیزەیی لێ پێچراوە...»



# ڕۆژی چوارەمی چاوەڕوانیی عەلی

## فاتیمەی کەوسەر

جوانترین نەخشەکانی قەدەر بە شلیلەی ئاڵتوونی دەچنرا و دایکی عەلییش ئەوەندەی کوڕەکەی خۆشبەخت بوو، دەبوو بە خەسووی کچە نازدارەکەی نەبی، کە ساتی لەدایکبوونی وەک دوێنێ لەیاد بوو! ئای ڕۆژگار چەند خێرا تێدەپەڕی... خەسووی وەختی لەدایکبوونی فاتیمەی دەگێڕایەوە: "خەدیجە کۆرپەیەکی قژڕەشی برژانگدرێژی برۆباریکی ببوو، دەتوت بە قەڵەم کێشراوە و ماڵی پێغەمبەر خۆشحاڵ و زاڵمەکانی مەککەش لە ئەوان خۆشحاڵتر بوون و هەر لەگەڵ بیستنی هەواڵی لەدایکبوونی فاتیمە، ڕێیان لە هەرکەسێک دەکەوت، مژدەیان بە یەکدی دەدا و ئەو ئێوارەیە ئێوارەخوانێکی گەورەیان ساز کرد و لەنێو دەنگی دەف و زوڕنا و شووشەی شەرابدا خۆشیی خۆیان دەر دەبڕی کە موحەممەد کوڕەکانی دەمرن و کچەکانی دەمێننەوە و بە شەرەفی ئەوەوە دەیانخواردەوە کە خەدیجە ئیدی تەمەنی تێپەڕیوە و منداڵی دیکەی نابێت و موحەممەد وەجاخکوێر دەبێت و هەتا ماوە

کـوڕ ناگرێتـە باوەشـی و دەبێـت تـا مـاوە کـچ گـەورە بـکات و بـەدەم قاقـاوە دەیانـوت: "ئێمـە کوڕمـان دەژی و کچمـان دەمـرێ، ئـەو کچـی دەژی و کـوڕی دەمرێـت و گوایـە ئـەو شـەرەفمەندترین و گەورەترینـی نێوانمانـە!" کـوڕ بـۆ ئـەوان تەنهـا هـۆکاری غـروور نـاو و خۆبەشـتزانی بـوو و بەبەردەوامـی دەنگـی هـاوار و فریـاد و زریکـەی کچانیـان دەهـات لـە بیابانەکانـەوە کـە هاواریـان دەکـرد 'ابتـاە!' 'بابـە گیـان...!› تـا هێواش-هێـواش لەژێـر خـۆڵ و لمـدا دەخنـکان و دەنگیـان تێکـەڵ بـە خامۆشـیی شـەو دەبـوو...

تەنانـەت کـە بـۆ ڕۆژی دوایـی وەیلـی کـوڕی عـاس بەسـەر پێـوە چەنـد قسـەیەکی لەگـەڵ پێغەمبـەردا کردبـوو، قوڕەیـش لۆمەیـان کردبـوو و وتبوویـان، «کارت بـە ئـەو وەجاخکوێـرەوە چییـە! بـۆ قسـەی لەگـەڵ دەکەیـت!»

پێکەنیـن و سـووکایەتیان دەکـرد و قسـەی ناشـرینیان دەکـرد، بـەڵام نەبی بـە ئارامـی و سـەبرێکی بێوێنـەوە تەماشـای دەکـردن و خـۆی نەدەهێنایـە ئاسـت بێئاگایـی و نەزانیـی ئـەوان، تـا دواتـر سـورەتی کوثـر دابـەزی و خـودا مـژدەی ئـاوی کەوسـەری بـە خۆشەویسـت دا و فەرمـووی: 'إِنَّ شَـانِئَكَ هُـوَ الْأَبْـتَرُ' 'ئـەوە ناحەزانـی تـۆن کـە وەجاخکێـرن!' ئـەم سـورەتە دڵدانەوەییەکـی گەلـێ ناخهەژێـن بـوو بـۆ ڕەسـول و بـە مانـای ئـەوە دەهـات، 'گـوێ بـە قسـەکانی ئـەوان مـەدە خۆشەویسـت، ڕوو لـە خـودا سوپاسـگوزاریی مەقامـی پێغەمبەرایەتـی بکـە و دڵ و سـینەت هـەر بـۆ ئـەو بکـەرەوە و ڕێـک و قنجوقیـت و تەسلیم بوەسـتە!' کەوسـەر دەریایـەک بـوو لێوارەکـەی بـە دەفر

و دۆلکەی ئاڵتوونی ڕازێنرابوویەوە و لە ژێرەوەیدا لە جێی چەو و بەرد، مرواری و ئەڵماس بوو، لە شیر سپیتر و لە هەنگوین شیرینتر و لە بەفر ساردتر بوو، هەرکێ یەک قومی لێ بخواردایەتەوە، تا هەتایە تینوویێتیی نەدەبینی و لەوەبەدوا تەنها بۆ چێژ لێی دەخواردەوە، نەک ڕەواندنەوەی تینوویێتی... سیمبولی بەرجەستەکراوی کەوسەریش لەسەر زەویی فاتیمە بوو، خودا وەک پێچەوانەی وەجاخکوێر و دوابڕاو و نەزۆک و کۆتاییهاتوو، کەوسەری پێ بەخشیبوو کە بە مانای زۆری و بەرەکەت و نەبڕاوەیی دەهات و مژدەیەکی گەورە بوو بۆ ئیمانداران و خەمێکی قووڵ بۆ بێباوەڕان... لە ئەو ڕۆژانەدا کە مێینە بە بەنی ئادەم هەژمار نەدەکرا، خودا بە ئایەتێک جەختی لە نرخ و بەهای کچ کردەوە، بەڵێ، فاتیمە کەوسەری دونیا بوو و بە گوژم هەڵدەقولایە نێو داهاتوو و کێ دەزانێت! ڕەنگە هەڵبژێردراوەکانی ئومەت لە نەوەکانی ئەو بن! ڕەنگە سەدان و هەزاران ساڵ تێبپەڕێت و ناوی فاتیمە دوابەدوای ناوی باوکی بێت و تا هەتایە بمێنێتەوە..."

ژنان بێ سەدا و سەوت گوێیان گرتبوو: "فاتیمە بەندەیەکە لەنێو بەندەکاندا و ژنێک لەنێو ژناندا، بەڵام بەرجەستەکاری نرخی ژنانە لەلای خودا و کەوسەریش نیشانەی بەرەکەتداری و زۆریی نەوەکانیەتی، هەرچیی جوانی و چاکییەکانە لە پێغەمبەرەوە دەگوازرێتەوە بۆ فاتیمە، فاتیمە کەوسەرە و کەوسەر فاتیمەیە، چوون فاتیمە دیواری نەفسی تێپەڕاندووە و بەرەو ئەو خاڵەی خودا بۆی دانەوە ڕێ دەکات و ڕۆشتنیشی

وەک ئـاو پـاک و ڕەوان و ڕوونــە، دەریایەکـە دەرد و خـەم و پیسیی جیهـان دەسـڕێتەوە و هیـوای دەردەدار و بێچـارە و تینـوو و ڕێبـوارە جێماوەکانـی ڕێیـە، بـە درێـژای سـەدەکان دەڕژێت و دەڕژێت و بـە هەرجێیەکدا بڕوات، مـرواری و زومـروت لـە جێی خـۆی جـێ دەهێڵێت بـە ئیزنـی خـودا."

یەکێک پرسیی: "چۆن بگەین بە کەناری بەحری کەوسەر؟"

"بـە خۆشویسـتنی خۆشـەویسـت و ڕێکـردن لەسـەر ڕێگەکـەی، کەوسـەر جێی حەوانـەوەی ئـەو بەندانەیـە کـە پێشـبڕکێ دەکـەن لـە بەندایەتیدا، هەرکـێ بەندەتـر بێت، ئـەو پێی دەگات...! ئەوانـەی خۆشەویستییان پۆشـیوە و ئامێزیـان بـۆ لێبوردەیی کردووەتـەوە و تـووڕەییەکانیـان دەخۆنـەوە و ئـارام دەگـرن و بێدەنـگ دەبـن، پێی دەگـەن... هێندەی ژمـارەی ئەسـتێرەکانی ئاسـمان دەفـر ڕیز کـراوە، بـە درێژیـی کەوسـەر و خـاوەن زانسـت و بەهـای بـاڵا وعاریفـان لێی دەخۆنـەوە."

دانیشـتووان بـە دەنگـی بانگدانـی زوڵاڵـی بیـلال ڕاچڵەکیـن و هۆشـی هەمـووان پڕ بـوو لـە هەمـان جوانـی و دڵیـان لـە گەورەیی و لێکچوونـی نێوان فاتیمـە و کەوسـەردا هەڵدەلـەرزی...



## ڕۆژی پێنجەمی چاوەڕوانیی عەلی

## فاتیمەی عذراء

ژنانی پشتیوانانی مەدینە، کە هەمیشە پرچی کچە چاوگەشەکانیان بە گوڵی خورما دەهۆنییەوە و بۆنی عەمبەر و میسکیان دروست دەکرد و بە ماڵەکانیاندا دەیانپرژاند، هەرچیی سەرقاڵییانە جێیان هێشتبوو، لە پێشبڕکێی ئەوەدا بوون بە جوانترین شێوە میوانداریی ژنانی مەککە بکەن و هەرچیی هەبوو و نەبوویانە، کردبوویانە قوربانیی وشەیەکی جوان کە لەسەر فاتیمەیان دەبیست و میوانەکان دەیانگێڕایەوە و تیشک و پرشنگی نێو چاوی ژنانی مەدینە زیادی دەکرد و ئەم جار یەکێک لە میوانەکان گوتی: "یەکێک لە نازناوەکانی دیکەی فاتیمە -عزراء-ە کە بە مانای 'پارێزراو لە ئاگر' دێت و مەریەمی دایکی عیسای نەبییش هەمان نازناوی هەبووە و مانایەکی دیکەی 'کیژێک کە لەکەی بەر نەکەوتووە.' بە کچی پاکیزە و هەروەها بە گوڵێک دەوترێت کە پەنجەی بۆ نەبرابێت، یاخود دەنکە لمێک پێی پێدا نەنرابێت، یاخود سەرچاوەیەکی ئاو کە زۆر پاک بێت.»

کچێکی گەنجی نێو دانیشتووان گوتی: «چەندە نازناوێکی جوانە! کێ دەزانێت لە وەسفی چ ڕەفتارێکدا ئەو ناوەی لێ نراوە!"

"لە وەسفی بێگەردییدا! فاتیمە لەدوای باوکی، یەکەم کەسە دەچێتە بەهەشت و پێشەنگی ئەو گەنجانەیە کە لە ڕۆژی دواییدا لەپای پاکیزەییان لەژێر سێبەری عەرشی خودادا دەحەوێنەوە."

"مژدەیەکی چەند خۆشە بۆ ئێمەی گەنج!"

"گەر بێگەردی سەدەقەی جوانی بێت، ئەوا فاتیمە ئەو سەدەقەیەی بە گەنییەکەی داوە، گەر بێگەردی پاکڕاگرتنی ڕۆح بێت، هاوکات لەگەڵ جەستەدا، ئەوا ڕۆحی فاتیمە وەک شیر سپییە و لە ڕۆژی دواییدا هەموو ئەوانەی وەک فاتیمەن، لەتەنیشت ئەودا و لەژێر سێبەری خودادا دەحەسێنەوە و سواری ئەسپی بێگەردی دەبن و بە تیژیی ڕووناکی بەسەر پردی سیراتدا تێدەپەڕن... ئای چەند بەختیارن ئەوانەی بێگەردییان وەک چاویان دەپارێزن... ئەوانە عەزراکانن، دۆستی فاتیمەن لەپای پاراستنی ئەو ئەمانەتی پاکییەی پێیان بەخشراوە لە باخە تایبەتەکانی بەهەشتدا، بە پۆشاکی بێگەردییەوە دێن و دەچن. سڵاویان لێ بێت لە بێگەردەکان... لە ئەوانەی لە ڕەوشتدا فاتیمەی کچی نەبی دەکەن بە پێشەنگیان..."

بەم جۆرە قسەکانی کۆتایی پێ هێنا و شنەبایەکی شیرین خۆی کرد بەنێو گەرمیی تاقەتپڕوکێندا و لەگەڵ فێنکیکەدا یەکێ لە ئامادەبووان بە سڵاو و خۆشەویستی دەستی پێ کرد و بە هۆنراوە کۆتایی بە وتەکانی هێنا...

«ناوی فاتیمە بوو، زەهرا بوو، عەزرا بوو
خونچەیەکی لەنێو باخی خۆشەویستی پشکەوتوو بوو،
لە مێژوودا نازناوی دایکی باوکی پێ بەخشرا،
لەسەر زەوی گوڵەباخ و لە ئاسماندا ئەستێرە بوو.»



## ڕۆژی شەشەمی چاوەڕوانیی عەلی

## فاتیمەی دایکی باوکی

"فاتیمە پارچەیەکە لە من، هەرکێ ئازاری بدات، ئازاری منی داوە و هەرکەس دڵخۆشی بکات، منی دڵخۆش کردووە.»

حەزرەتی موحەممەد

ساڵی خەم بوو، عەلی لەو ڕۆژانەدا باوکی و فاتیمە دایکی لەدەست دابوو و ساڵێک بوو لەنێو ڕۆحی هەمووانیدا خەمێکی زۆری جێ هێشت. تاکە دڵنەوایی فاتیمە لە باوکیدا بوو و بە پێیە بچووکەکانی بەردەوام بەشوێن باوکیەوە بوو. وەک پەروانە بەدەوری شەمعدا بەدەوری باوکیدا دەسووڕایەوە، بۆ ساتێکیش لێی جودا نەدەبوویەوە و هەم لە پەلەقاژێی نەهێشتنی خەمی خۆی هەمیش لە هەوڵی دڵنەواییکردنی باوکیدا بوو. تا ئەو ڕۆژەی ڕووداوێکی ترسناک ڕووی دا، ئەو ڕۆژە عەلی لە مەککە نەبوو، پێغەمبەر لەتەنیشت کەعبەدا نوێژی دەکرد و ئەبوجەهل ڕیخۆڵە و پیسیی حوشترێکی تازەمردارەوەبووی هێنا و تەماشایەکی چواردەوری کرد و گوتی: "کێ دەچێت ئەم پیسسییە بکات بەسەر موحەممەددا؟"

عوقبەی کوڕی ئەبوموعیت ئەم کارە بەدەی نایە ئەستۆی خۆی و پیسییەکەی هەڵگرت و کردی بەسەر هەردوو شانی ڕەسولدا و خۆشەویستی پاکتر لە هەمووان شانەکانی قورس بوون و نەیتوانی لە سوجدە بەرز بێتەوە و دەستەی نەزانان تەماشایان دەکرد و ئەوەندە پێکەنین و قاقایان لێدا، لار دەبوونەوە و دەکەوتن بەسەر یەکدا. هیچکام لە موسڵمانان لەو کاتەدا لەوێ نەبوو و هەواڵ با فاتیمە گەیشت و فاتیمە بە هەڵەداوان و ڕاکردن گەشتە لای باوکی و بە دەستە بچووکەکانی پیسیی سەر شانی باوکی لا برد و بەرەو ڕووی بێباوەڕان فڕێی دا، لە لایەک جلەکانی باوکی پاک کدەکردەوە و لە لایەکەوە قسەی بە بێباوەڕان دەگوت و لە لایەکەوە بۆ باوکی دەگریا و فرمێسکەکانی دەسڕی و وەختێ ڕەسولەڵلا لە سوجدە بەرز بوویەوە، دەستەکانی کردەوە و فەرمووی: "خوایە گیان، ئەم قەومە دڵڕەقە حەواڵەی تۆ دەکەم." شپرزەیی و گریانی بەکوڵی فاتیمە فرمێسکی لە چاوی ئازیز هێنا و هەر لەوێدا فەرمووی: "فاتیمەم! ئەم کچەم، دایکی باوکیەتی." "دایکی باوکیەتی... دایکی باوکیەتی..."

بێچارەیی و فرمێسکەکانی ئەو ڕۆژەی فاتیمە هەرگیز لەیادی کەس نەچوویەوە و پاش ساڵی خەم نازناوی فاتیمە وەک 'دایکی باوکی' مایەوە و هەمووان بە ئەو نازناوە بانگیان دەکرد. فاتیمە کچێک بوو وەک دایک میهرەبان بۆ باوکی و لە گشت لایەکەوە پشتگیریی دەکرد و قوربانیی بۆ دەدا. کەس نازانێت دەریای دڵی فاتیمە چەنێک فراوان بوو، بەڵام هێندە گەورە بوو، کە دایکایەتیی پێغەمبەرەکەی خودا بکات...

## ڕۆژی حەوتەمی چاوەڕوانیی عەلی

## فاتیمەی کچی نەبی

ناوازەترین چاوەڕوانیی جیهان بوو، ڕەسولەڵلا تاکە وشەیەکیشی دەربارەی زەماوەند و کاتەکەی نەگوتبوو و عەلی لەنێو مەراق و جۆشوخرۆش و ڕازێکی پەنهاندا ڕۆژی دەژمارد، هەمان دڵتەنگیی پێغەمبەری هەبوو ئەو وەختەی ماوەیەکی زۆر وەحی وەستا، حاڵی لە حاڵی تەماوی و گەرم و خنکێنەری پێش بارانێکی بەخوڕ دەچوو و لە ڕاستیدا دەکرا ئینسان لە زۆر ساتی ژیانیدا ڕووبەڕووی دڵگیرانێکی لەو جۆرە ببێتەوە.

خنکان... نادیاری... و ئارامی...

ڕۆژێک لە ئەو ڕۆژانە پێغەمبەر عەلیی بانگ کرد و فەرمووی: "ئەی عەلی! تۆ دەزانیت هۆکاری ناونانی فاتیمە بە ئەو ناوە چییە!"

"پێغەمبەری خودا باشتر دەزانێت."

"چوونکە خودا ئەو و دۆستەکانیشی لە ئاگر بەدوور گرتووە و پاراستوونی لە ئاگری جەهەنەم، بۆیە ئەو ناوەی پێ بەخشراوە."

"فاتیمە بە مانای 'دوور لە خراپە، دوور لە جەهەنەم، لە ئاگر بەدوور"، تۆ بڵێی ئەمە مانای وا بێ هەرکێ فاتیمەی خۆش بوێت و لەسەر ڕێگەکەی بڕوات، جەهەنەمی لێ حەرام کرابێت؟ مەگەر مەبەست لە خۆشویستنی کەسێک، لەئەوچوون و بوونبەئەو و ڕۆشتن بەشوێن ئەودا نییە؟ عەلی لە مەبەستی ڕەسول تێگەیشت... شار گوڵباران بوو لە بەرچاوی، شنەبای فێنکی دۆڵی عەرەب هەڵی کردە سەر ڕۆحی، عەلی هەناسەیەکی ئارامی هەڵمژی...



## ڕۆژی هەشتەمی چاوەڕوانیی عەلی

### فاتیمەی مرواریی تاقانە

«إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَنْثُورًا»

«کاتێك دەیانبینیت، وا دەزانیت مرواریین

و بەو ناوەدا بلاو بوونەتەوە.»

سورەتی الانسان ١٩

نێوان مرواری و فرمێسک و فاتیمە و ئەهلی ئاسمان هەمووی لێکچوون بوو! هەمووان پاکژ و ڕوون و پرشنگدار بوون.

فاتیمە ئەو مرواریيەی پێغەمبەر بوو کە نازناوی دوڕی یەکتای لێ نرابوو، هیچ ژنێکی سەر ئەم زەمینە کچێکی دیکەی وەک فاتیمەی نەبووە، هیچ باوکێک خاوەنی کچێکی وەک فاتیمە نەبووە و نابێت، حەفتایەمین مرواریی بەهەشت بووە پێشکەش بە دونیا کراوە، هەرچاوێ فاتیمەی ببینیایە، ئیدی سەرابی نەدەبینی و ڕاستی و خەیاڵی لەیەک جیا دەکردەوە، هەرکام لە ژنانی ئیمانداران بچووایە بۆ مزگەوت، فاتیمەی وەک مرواریی نێو سەدەفێک بە سەرپۆش و جلی سپییەوە

دەبینی لە ڕیزەکانی پشتەوەی مزگەوت یادی ناوی خودای دەکرد، هەر کە تەماشای ڕاوەستان و حاڵ و ڕەفتاریان دەکرد، دڵنیا دەبوونەوە کە درکی ڕازی ئەم کچەی نەبی ئەستەمە و مرواریی نێو سەدەفێکی قووڵترین جێی دڵی هەمووان بوو و زەردەخەنەی دەکرد و پرشنگی دەدایەوە...

تا ڕۆژی مەحشەر...



## ڕۆژی نۆیەمی چاوەڕوانیی عەلی

### فاتیمەی زەهرا

دەگوترا لە شەودا گوفتار دەبڕێ و کەلام کۆتایی دێ، بەڵام ئەم یاسایە شەوانی یەسریبی نەدەگرتەوە، لەو شارەدا شەو لە ڕۆژ ڕووناکتر بوو، ئەوێ مەملەکەتێ بوو خەو و خەون بەدەگمەن ڕوویان تێ دەکرد...

لە ئەو مەملەکەتی موحیببەتەدا هەمووان تا بەرەبەیان لەژێر ڕۆشنایی نوری ڕەسولدا بەپێوە بوون و خەو لای ئەوان پشوویەکی چەند خولەکی بوو، ئەوان کەسانێ بوون دەیانزانی بەرەکەتی تەمەن لە چیدایە، عەلی بە درێژایی ڕۆژ بەپێوە و لە گەرما و تەپوتۆز و بیابان و گەشتدا خەو لە چاوانی حەرام بوو، تەنها بۆ ماوەیەکی کورت چاوی لێک دەنا و هەڵدەستایەوە بەرەو ڕووی ژیان، هەر بۆیە هەرچیی ژنانی کۆچبەر دەربارەی گونجاویی عەلی و فاتیمە دەیانوت، لە جێی خۆی بوو...

ئەم مانگی پڕی شەهامەت و پیاوەتی...

ئەو بووکی پیرۆزی تەختی جوانی...

## ڕۆژی دەیەمی چاوەڕوانیی عەلی

### فاتیمەی خێردار

"بەندەکانی خوای میهرەبان ئەوکەسانەن کە زۆر بە
هێمنی و سەلاری بەسەر زەویدا دەڕۆن، کاتێکیش نەفامان
بە قسە و قسەلۆکی ناخۆش بەرەنگاریان دەبنەوە، لە
وەڵامیاندا دەڵێن: سڵاو (ڕەوشتبەرزیی خۆیان دەنوێنن)."
سورەتی الفرقان

"وەک چۆن پێغەمبەر پردی ڕزگاریی نێوان خودا و بەندەیە، فاتیمەش پردی خێر و چاکەی نێوان پێغەمبەر و ئیمەیە، مەگەر مرۆڤ بۆ ئەوە ڕەوانەی سەر زەوی نەکراوە، ئارەزوو و لایەنە ئاژەڵانەکانی بمرۆڤێنێت؟ چەند حەیفە لەم دیارە کۆچ بکەیت و لە چێژی مرۆڤبوون حاڵی نەبیت و تێینەگەیت و نەیچەژیت، چەند دوڕاوییە بژیت و بژیت و نەبیت بە مرۆڤ و لە کۆتاییدا تووشی پەشیمانییەکی ناکۆتا بێیت... ئاە لە خەڵەفاوی... لە ویستی خاڵی و بەتاڵ... حەزە نزمەکان... ئارەزووە حەرامەکان... ئاە لە نەفس... لە ئەو بیرە تاریکە... لە فریوخواردن...

من بۆیە فاتیمەم خۆش ویست، بە ناسینی ئەو فێری دوورکەوتنەوە بووم لە ئارەزووی نزم، توانیم بە نەفسم بڵێم بەسە...! من خێر و چاکەم خۆش ویست، چوونکە ویستم لە فاتیمە بچم..." یەکێک لە ژنانی مەککە وای گوت...

## ڕۆژی یانزەیەمی چاوەڕوانیی عەلی

## فاتیمەی حۆری

"فاتیمەی کچم حۆریی نێو ئینسانەکانە."

حەزرەتی ڕەسول

عەلیی زاوای پێغەمبەر، کە ئاسۆی پڕ ئامانجی جیاواز و پڕ لە جوانیی ناوازە بوو، ڕۆژبەڕۆژ فاتیمەی دەستگیرانی لە نزیکترەوە دەناسی، لەبەر ئەوەی کەمی دەخوارد و کەم دەنوست و کەم دەدوا، کاتێکی زۆر زیاتری هەبوو بۆ نوقمبوون لەنیو هەستەکانیدا و ئەم ساتە ناسکانەی ژیانی بە هەزار ئاهەنگ تێدەپەڕی و ژنانی مەدینەش ڕۆژبەڕۆژ زیاتر فاتیمەیان دەناسی: "ئینسان مەستی جوانی و موحتاجی کەماڵە و باری سەر شانی گەلێ قەدیمە، ئەو ئەمانەتەی شاخ و کێو و داروبەرد خۆی لێ بێبەری کرد، ئینسان بێباکانە دای بەسەر شانیدا، ئەمەش لەگەڵ ئەوەی ژیانی گەلێ سەخت و دژوار کرد، بەڵام پڕیشی کرد لە جوانی و ناسکی و مرۆڤ هەتا خەمپەروەرتر و مەستتر بێت بە جوانی و موشتاقتر بێت بە جەماڵی خودایی، ئەوەندە ڕێزلێگیراوتر دەبێت و یەزدان

یەک-یەک دەست بە سەری هەستەکانی بەندەکانیدا دەهێنێت و پاداشتیان دەداتەوە لەسەر هەستناسکییان و هەمیشەش چەند نموونەیەک لە ئەو بەندانە نیشانی بەندەکانی دەدات تا ببینن و بزانن هەستیاربوون هێندە سەخت نییە! فاتیمەش یەکێک بوو لە ئەو نموونانە و پێغەمبەر لەنێو گشت ژنانی دونیادا لە هەموویان زیاتر ئەوی بە حۆری دەچوواند! حۆری، کە بە بوونەوەرگەلێک ناسرابوون خاوەنی جوانترین بوونی ماددی و مەعنەوی بوون و بەوە ناسرابوون کە لەژێر حەفتا چین پۆشاکی بەهەشتەوە هێشتا سپێتیی پێستیان دیار بوو هێندە ڕوون و جوان و درەوشاوە بوون، فاتیمە کە لە دونیادا بە ئەوان چووێنرابێت، دەبێت لە بەهەشتدا چی و چۆن بێت! هەر بۆیە ڕەسول دەیفەرموو: "فاتیمەی کچم حۆریی نێو مرۆڤەکانە و هەرکات بیری بەهەشت بکەم، ماچی فاتیمە دەکەم!"

فاتیمە یەکێک بوو لەو خانمانەی سەر بە دونیا بوو و کەچی لە بەهەشتیشدا لەپێش حۆرییەکانەوە بوو! چوارەمینی ئاسیا و مەریەم و خەدیجە و فاتیمە بوو، ئەمانەتێکی قەدیم بوو پێشکەش بە دونیا کرابوو."

ئوموسەلمە، کە لەدەست زۆڵم و زۆری قورەیش بەرەو حەبەشە کۆچی کردبوو و هاوسەر و کورەکەی لەدەست دابوو و ئێستا بەرەو مەدینە دووەم کۆچی کردبوو، گوتی: "جارێک لە پێغەمبەرم پرسی و گوتم یا ڕەسول اللە، ژنانی سەر زەوی چاکترن یان حۆرییەکانی بەهەشت؟"

فەرمووی: "ژنانی دونیا بەرزترن."

پرسیم: «بۆچی؟»

فەرمووی: "لەبەر ئەوەی ژنانی سەر زەوی نوێژ دەکەن و بەڕۆژوو دەبن و چەندین جۆری دیکە پەرستش بەجێ دەگەیەنن."

خورپەیەکی شیرین بە دڵی گوێگراندا هات و یەکێک لە جارییە گەنجەکان پرسیی: "ئەی مرۆڤی حۆریئاسا چۆنە؟"

"ئەو کیژە گەنجەیە، کە گەنجیتیی خۆی دەپارێزێ لە ئارەزەووە ڕاکێشەرەکان، خۆی لە حەرام دەپارێزێ و لە حەرام ناخوات و لە حەرام ناڕوانێ و حەرام بە زاریدا نایەت، ئەمانە ئەو خانمانەن ڕەسول اللە دەیفەرموو لە بەهەشتدا ئەوەندە جوانن، حۆرییەکان ئیرەییان پێ دەبەن، ئەمانە ئەو خانمانەن کە بە جەستە لەسەر زەوی و بە ڕۆح و گیان لەگەڵ خوادان و فاتیمە یەکەمینی مرۆڤە حۆریئاساکان بوو."



## ڕۆژی دوانزەیەمی چاوەڕوانیی عەلی

## فاتیمەتول مرضیة
## فاتیمەی ڕازی لە خودا

«ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً»
"بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت، کە تۆ
لەو ڕازیت و ئەویش لە تۆ ڕازیە."
الفجر/٢٨

ئەوەی لە هەموو شتێک زیاتر باری سەر شانی ئینسانی قورس کردبوو، ئەو ئەمانەتە بوو کە زەوی و ئاسمان خۆیان لێ لا دا، ئاو و خۆڵ شێلرا و قوڕێکی لێ هاتە بوون و وجوودی مانادار و عەزیز کرد و ناوی لێ نرا: عەشق! ئینسان خۆی خستبوویە ژێر باری سەختی عەشق و ڕۆحی ئینسان وێڵی حوزور و خۆشبەختی بوو و هەمووان بەشوێنیدا دەگەڕان و کەمینە دەیاندۆزییەوە. یەکێ لە کۆشکی زیوین و ئەویان لە دەریای خشڵ و زێڕ و کەسێکی دی لە تونێلی حەز و ئارەزووەکانیدا ژیانی بەفیڕۆ دەدا و هەشبوو شوێن ڕازی بوون دەکەوت و دەستی بە عەشق و موحبەتەوە دەگرت.

ئەوانەی ژیانیان تەرخانی ئەو ڕازە کردبوو، قسەیان زۆر بوو و یەکێ لە ژنانی کۆچبەر گوتی: "سەرەتای دابەزینی وەحی بوو و ئەو کات عەلی منداڵێکی دە ساڵان بوو و بڕیاری دا لە ڕێی ئەم عەشقەدا ژیانی دانێ و تا دوا نەفس دڵسۆزی ڕەسول اللە بێت، بێ ئەوەی زۆری لێ بکرێت، بێ ئەوەی داوای لێ بکرێت، لەدوای خەدیجە دووەم کەس بوو دینی ئیسلامی قبوڵ کرد و ئێستاش ئەو ساتەی لەبیرە کە ئازیز فەرمووی: "ئەی خەدیجە! ئیدی ئیسراحەت لە ئێمە حەرامە!" خانمی شکۆداریش وەڵامی دابوویەوە: "هەر وا دەبێت و هەرگیز لەبیری نەکەیت خودا یاری حەق و ڕاستییە."

ئەو ڕۆژە لە سەیرکردنەکانی خەدیجەدا ئەم ڕستەیەی خوێندەوە: "گەر پارچەپارچەشمان بکەن، پشتت تێ ناکەین یا ڕسول اللە!" هەر لە ئەو ساتەوە یەکەمین تیشکەکانی وەحی پرژابوویە نێو دڵی بچووک و پاکی عەلی و لە خەدیجەی دایکی فاتیمەوە فێری خۆڕاگری ببوو.

لەو ڕۆژانەدا، کاتێ عەلی خزمەکانی ڕەسولی بۆ ماڵی خۆشەویست بانگ دەکرد بۆ بانگەشەی دینی خودا، فاتیمە بە دەست و پەنجە بچووکەکانی سفرەی دەڕازاندەوە و لەگەڵ دایکیدا ماڵەوماڵ دەگەڕا و تەماشای باوکی دەکرد کە بە هەنگاوی دڵنیا و سەنگینەوە لە هەوڵی بڵاوکردنەوەی دینەکەیدا بوو و هێز و وزەی لێ وەر دەگرت. خۆشەویستی جیهان بێوچان لە مەککەوە بۆ عوکاز و مەجاز لە هەوڵی بڵاوکردنەوەی پەیامەکەیدا بوو و پەلامار و سووکایەتییەکانی

قورەیشیش ڕۆژبەڕۆژ لە زیادبووندا بوون و هەوڵ و ماندوبوون و سەنگینیی خانەوادەکەشی هاوتەریبانە لە زیادبووندا بوو. عەلی ئەو کات مێردمناڵێک بوو و بەتەنها کەوتبوویە ناوەڕاستی جەهەنەمی ڕق و کینەی قورەیش و نە بە دەم و نە بە دڵ گلەیی لە حاڵی نەبوو و بەخۆشبەختییەوە فەرمانی خودای بەجێ دەهێنا و خەم و نەهامەتیی ژیان وەک گەڵایەکی وشک لە ئەملا بۆ ئەولا دەیهێنا و دەیبرد، بەڵام ئەو بەهێزتر و بەهێزتر خۆی نیشان دەدا. هەر لە ڕۆژانی سەرەتای ژیانیەوە نەبوونی و دژواریی ژیانی چەشتبوو و لەگەڵ فاتیمە هەردووک لە دۆڵی شیب چەندین شەویان بە برسێتی بەسەر بردبوو. کوڵمە سوورەکانی فاتیمە لە برساندا زەرد هەڵدەگەڕان و لەبەر ئەوەی دەرد و نارەحەتیی دایک و باوکی دوو ئەوەندە نەکات، بێدەنگ دەبوو و هیچی نەدەگوت. عەلی هەر لە ئەو ڕۆژانەوە مەقامێکی ڕازیبوونی نەبڕاوەی لە فاتیمەدا بینیبوو، وەختێ لە ناوەڕاستی نەبوونی و بێچارەییدا بێدەنگ و ڕازی، بێ گلەیی و گازندە تەنها لە هەوڵی ڕازیکردنی خودادا بوو و لە پشتپێبەستنێکی وشک و بێبنەمادا نەبوو بە خوداوە، بەڵکوو تێگەیشتبوو کە ڕەشبین نەبێت بەرامبەر ئەو بارودۆخ و نارەحەتییانەی ژیان بەسەریدا دێنێ و لە ئەودیو ویست و ئارەزووەوەیە. فاتیمە ڕەزامەندیی کردبوو بە حاڵێکی بەردەوام، هەر وەک چۆن ئیبراهیم لەدوای ئەوەی ڕازی بوو چەقۆ لەسەر ملی ئیسماعیلی ئازیزی دابنێت، گەیشت بە ڕازی 'خلیل اللە' و بوو بە دۆستی خودا، وەک چۆن موسا بە

گەیشتن بە هەمان ڕاز بەحری نیلی کرد بە دوو بەش، وەک چۆن مەریەم ڕازی بوو بە ئەو قەدەرەی بەسەریدا هاتووە و دانی بە خۆیدا گرت، فاتیمەش ڕازی بوو بە هەرچیی دەهات و دەبوو. رسول اللەش دەیگێڕایەوە باری تەعالا دەفەرمووێ: "هەرکێ ڕازی نییە بە قەزاوقەدەرم و ئارامی ناگرێت لەسەر بەڵا و ناخۆشی، با بۆ خودایەکی دیکە بگەڕێت جگە لە من."

وتەکانی ژنانی کۆچبەر، کە پشتیوانییان دەکرد، لە گوێی عەلیدا دەزرنگایەوە: "ئێمە لەدوای خەدیجە خۆڕاگری و بەرخۆدان لە فاتیمە فێر بووین، لە ئەوەوە فێری ڕازی تەسلیمبوون بووین. لە دەست جەهەنەمەکەی قورەیش هەڵهاتین و کۆچمان کرد و ئێوەش ماڵ و گیانتان بەرەو ڕوو والا کردین، بەڵام ئێمە بیری زەمزەم دەکەین، بە حەسرەتی شنەبایەکی مەککەوەین، دووری لە زەمزەم مەرگە بۆ ئێمە، نەبینینی کەعبە و دووری لە مانا مەعنەوییەکەی، مەگەر خودا بزانێت چەند سەختە لەسەرمان. گۆڕانی کەشوهەوا زۆربەمانی لاواز کرد و نەخۆش کەوتین و لە جێگادا کەوتین و سوپاس بۆ خودا هەستاینەوە سەر پێ، بەڵام فاتیمە... بە بینینی فاتیمە دەهاتینەوە سەر خۆ، بارۆدۆخەکە بۆ فاتیمە زۆر لە هەموومان سەختتر بوو، کەعبە بۆ فاتیمە جێگرەوەی باوەشی دایکی بوو، لە ئامێزی زەمزەمدا گەورە ببوو دووری لێی مەگەر خودا بزانێت چەند سەخت بووە! حەرەم لە نەفەس عەزیزتر بوو لای فاتینە و لێی دوور بوو، بەڵام نە گلەیی، نە گازندەت لێ نەدەبیست، لە تاڵەکانی قژیەوە هەتا نووکی نینۆکەکانی پڕ

بوو لە سوپاسگوزاری و ئەدەب بەرامبەر خودا، بە قسەی تاڵ و تفت خودای نەدەڕەنجاند، نا، هەرگیز ناکەوێتە هەڵەی لەو جۆرەوە، دەیزانی تەسلیمبوون و ڕازیبوون بوو ئاگرەکەی ئیبراهیمی کرد بە گوڵستان، بەڵای دەکرد بە هەنگوین، خۆڵەمێشی دەکرد بە گوڵ... بە ئەوپەڕی ئەدەبەوە بێدەنگ، تەماشای شلیلەی قەدەر دەکات چۆن ڕۆژەکان دەچنێت، ڕێبواری ڕێی 'خودا لە ئەو ڕازی و ئەو لە خودا ڕازی'یە، فاتیمە، هەرگیز نەمبیستووە لە هیچ نارەحەتییەکدا فرمێسک بڕژێت، تەنها ئەو ساتانە نەبێت کە بابە گیانی ئازار دەدرێت، ئا، ئەو کاتەنە دەگری... زۆر دەگری...

«خودایە سەبر و ئارامی بڕژێنی بەسەرماندا، لە ئەوانە هەژمارمان بکەیت کە لە ڕێی تۆدا دەبەخشن و پەرستش دەکەن و ئێمە و ئازیزانمان بکەیت بە میراتگری بەهەشت و لە ڕیزی ئەوانەدا بین کە لەوێ سڵاومان لێ دەکەیت...“

ئاوازی 'ئامین' بە چەند تۆنێکی ناسک بەرز بوویەوە بۆ ئاسمان و دڵان گەشتن بە ئەو بەڵێنەی چاوەڕێی بوون و بەڵێن نوقمی بێدەنگی بوو...

## ڕۆژی سیانزەیەمی چاوەڕوانیی عەلی

### فاتیمەی موحادیسە

"مەککە ئەو شارە بوو کە فریشتەکانیش بەئیرەییەوە تەماشایان دەکرد، لەوێ لەدایکبوون بۆ یەکێ حاڵی بێت، شەرەفێکی گەورە بوو. خەدیجە لە ئەو ڕۆژانەدا گەلێ سەرقاڵ بوو، لە لایەکەوە منداڵەکانی پەروەردە دەکرد، لە لایەکی دیکەوە سەرقاڵی بازرگانی بوو و کارەکانی ماڵی ڕێک دەخست و بەدەم هەژار و نەدارەوە دەڕۆشت و لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا سەمونی گەرمی دەبرژاند و بە دەستی خۆی دەیبرد بۆ ئەشکەوتی حیراء، کە ئەشکەوتێ بوو لە کێوێکی نزیک مەککە و لە کەعبەی دەڕوانی. پێغەمبەر حیراءی کردبوو بە پەناگەی خۆی و خەدیجەش لە چەند لایەکی کێوەکەوە پاسەوانی جێگیر کردبوو بۆ ئەوەی بەردەوام پارێزگاری لە ڕەسول بکەن. فاتیمە لەگەڵ ئەوەی لەو ڕۆژانەدا کچێکی بچووک بوو، بەڵام گەورەترین پشتگیریی دایکی بوو، ڕووی منداڵانە و بێتاوانی هەمیشە ڕوو لە دایکی بوو و خەو و خولیا و خۆشەویستییشی باوکی بوو. لە جێی ماڵەباجێنە و یاری،

هاوکاریی دایکی دەکرد و سفرە و خوانی بۆ نەخۆش و بێلانە و ئەو موسڵمانانە ڕادەخست کە پاش ڕاگەیاندنی دینەکەیانماڵبەدەر کرابوون و لە ماڵی ئەواندا دەژیان، لە کاتێکدا ژنان و کیژە گەنج و لاوەکانی مەککە هەر سەروەتێک دەخرایە بەردەستیان، دەیاندا بە پۆشاک و عەتر و زێڕ و زیو، فاتیمە و دایکی لە هەژار و نەدارەکاندا خەرجیان دەکرد. فاتیمە تەنانەت چاوی لە کەلوپەلی نێو کاروانەکانی دایکیشی نەبوو، هەرگیز، لە کاتێکدا هاوتەمەنەکانی بەشوێن مووروو و تەوقەوە بوون، ئەو تەنها بەلایاندا تێدەپەڕی و تەماشایەکی دەکرد. ئەم کچە دڵ و چاو پڕەی ئازیز تاکە خەمی لە ئەو کاتەدا ئەوە بوو زۆر بیری باوکی دەکرد، بیری زەردەخەنە شیرینەکەی، باوەشە پڕ موحیببەتەکەی، تەماشا پڕ خۆشەویستییەکانی دەکرد...

هەر ئەو ڕۆژەی خۆشەویست ئەمری بخوێنەی وەر گرت و بەهەڵەداوان هاتە ماڵەوە، خەدیجە و کچەکانی یەک-یەک شایەتومانیان هێنا و فاتیمە دەیزانی ئەمە نهێنییەکە و جارێ نابێ بە هیچ کەسێکی بڵێت، وەک چۆن لە ئەودیو دەرگای هەر ماڵێکەوە چەندین نهێنی حەشار درابوو، لە ئەودیو دەرگای ماڵی نەبییشەوە نهێنییەکی گەورە هەبوو و لەبەر ئەوەی هێشتا فەرمانی ئاشکراکردنی پەیامەکە نەهاتبوو، ڕەسولەڵڵا ئەو ئایەتانەی بۆی دادەبەزی سەرەتا بە خەدیجە و دواتریش بۆ کچەکانی و چەند کەسێکی دیکەی دیاریکراو ڕادەگەیاند... دین ئەو کات شاراوە بوو و تاکە ڕیزی نوێژی پشت خۆشەویست، خەدیجە و کچەکانی و عەلی بوون... بزیسکەی

یەکەمین ئایەتەکانی وەحی بەر ڕۆحی دەکەوت و کەسایەتیی سەنگینتر و بەهێزتر دەبوو.

پێغەمبەر لەدەمەوئێوارە نهێنیئامێزەکانی مەککەدا بە خشووع و ڕازونیازەوە ئەو ئایەتانەی دەخوێندەوە کە بۆی دادەبەزی و خەدیجە گوێی بۆ دەگرت و تەزوو بە گیانیدا دەهات و نوقمی دەریای ئەشکی ئەوین دەبوو و فاتیمەش مەست و حەیران، تەماشای دەکردن، چۆن لەگەڵ هەر ئایەتێکدا ڕەنگی ڕوخسار و کاردانەوەیان دەگۆڕێ، بەتایبەت لەگەڵ ئەو ئایەتانەی باسی ڕۆژی مەحشەریان دەکرد... ئەو ڕۆژەی ئاسمان وەک چادرێک دەدڕێ و دەکرێتەوە، خۆر دەکوژێتەوە و زەوی وەک لۆکە شی دەبێتەوە و کێوەکان لە جێی خۆیان دەدەن بە زەویدا و زەوییش هەرچیی ئەو نهێنییانەی چەندین سەدەیە لە ناخیدا حەشاری داوە، هەڵی دەداتە دەرەوە و چاکەیەک هێندەی تاڵە موییەک باریک و خراپەیەک ئەوەندەی دەزوویەک باریک حەق و حسابی هەیە... ئەو ئایەتانەی باسی بێوەفایی و بەدنمەکیی بەندەی دەکرد... هەندێک جاریش ئایەتی مژدەبەخش و شادیبەخش... فاتیمە لەنێو ڕەنگ و ئاهەنگ و سەداگەلێکی وەها ئاسمانیدا گەورە بوو و شایەتحاڵی ڕاز و نهێنیگەلێک بوو، جیهان چەندین سەدە بوو لە ناخی خۆیدا هەڵی گرتبوون و لەنێو دڵاندا پەنهان بوون...

ڕەسوڵەڵڵا بە درێژایی شەو ئایەتەکانی بۆ فاتیمە دەخوێندەوە و فاتیمە لەبەری دەکرد و لەسەر ڕۆح و دڵی دەینەخشاند و کەوتبوویە نێو حاڵێکی هێندە باڵا و جیاوازەوە،

فریشتەکان وەک چۆن بانگیان لە مەریەمی کچی عیمران دەکرد، بانگیان لە فاتیمەش دەکرد و دەیانوت: "ئەی فاتیمە! خودای گەورە تۆی هەڵبژاردووە لەنێو ژنانی جیهاندا و فەزڵی داویت بەسەر هەموویاندا! ئەی فاتیمە، خودا بپەرستە و ملکەچی بە و سوژدەی بۆ ببە لەگەڵ سوژدەبەراندا."

ئەو لەگەڵ فریشتان دەدوا و فریشتان لەگەڵ ئەو دەدوان، هەر بۆیە یەکێکی دی لە نازناوەکانی موحادیسەیە، کە بە مانای کەسێک دێت فریشتەکان لەگەڵی دوابن، فریشتەکان، کە پێغەمبەرانی لێ دەر بچێت لەگەڵ چەند کەسێکی دیاریکراوی وەک مەریەمی کچی عیمران و دایکی موسا و سارای ژنی ئیبراهیم و هەروەها فاتیمەشدا دوابوون..."

# ڕۆژی چواردەیەمی چاوەڕوانیی عەلی

## فاتیمەی موجاهید

ژنانی مەدینە... ئای لە ژنە شۆخوشەنگ و نەرمونیانەکانی مەدینە چەندە ڕوخۆش و نەرمگوفتار بوون، هێندە ڕەسول و کۆچبەرانیان بە کەسانێک لە خۆیان دەزانی، ببوون بە پەروانە بە چواردەوریاندا و لە کاتێکدا مێردەکانیان لە خزمەتی ئازیزدا بوون، ئەمان لە خزمەتی خۆشەویستانی ئازیزدا بوون. ئەم جار سەفیەی پووری پێغەمبەر دەستی کرد بە گێڕانەوە: "قوبەی ئاسمان هەوری ماتەمی پۆشیبوو و ڕێژەی زوڵم و زۆرداری لە مەککەدا لە دوا ترۆپکدا بوو، نەبی بۆ هەرجێیەک دەچوو، ئەبوجەهل یاخود یەکێک لە دارودەستەکەی بەشوێنیەوە بوون و فاتیمە بەردەوام بەشوێن باوکیەوە بوو و لەبەر ئەوەی کچێکی بچووک بوو، جێی بایەخی دوژمنان نەبوو، بەڵام ئەو ئاگاداری گشت پلان و تەڵەکەیەکیان بوو. ڕۆژێک فاتیمە هەنگاوبەهەنگاو لەپشت بابە گیانیەوە دەڕۆیشت و ئەبوجەهلیش لەدوایانەوە دەڕۆشت و بەلاقرتێوە قسەی ناشرینی فڕێ دەدا و دڵی بچووکی فاتیمە بەرگەی ئەو هەموو ئازارەی بابە

گیانی نەگرت و بە ئەوپەڕی بوێرییەوە ڕووبەڕووی ئەبوجەهل بوویەوە و گوتی: ‹ئەو وەسفە ناشرینانەی دەیکەیت، تەنها لەگەڵ خۆتدا یەک دەگرێتەوە!› ئەبوجەهلی سەرگەورەی زاڵم و لەخوانەترسی قوڕەیش، کە تا ئەو ساتە هیچکەس بوێریی ئەوەی نەکردبوو ڕووبەڕووی بێتەوە، کە گوێی لە وەڵامەکەی فاتیمە بوو، سوور بوویەوە و کەفی تووڕەیی بە لێویدا هاتە خوار و خۆی پێ نەگیرا و بە دەستە گەورەکانی هەتا هێزی تیا بوو شەقازللەیەکی لە ڕوومەتی وردیلە و گوڵئاسای فاتیمە دا و ڕوومەتی دەستبەجێ خوێنی تێزا و ئێمەش کە لەو حاڵەدا بینیمان، بە گریان و هاتوهاوارەوە ڕامان کرد بەرەو ڕووی. لە هەمان کاتدا ئەبولەهەبی مامی بێباوەڕی پێغەمبەریش پەیدا بوو. ئەبولەهەب، ئەو کەسەی لە هەمووان زیاتر ئازاری ڕەسولی دەدا، تەنانەت ئەویش خۆی پێ نەگیرا لەبەرامبەر ئەو دیمەنەدا و لە تووڕەییدا خوێن بۆ مێشکی نەدەچوو و دەستی فاتیمەی گرت و هاواری لە ئەبوجەهل کرد: 'دەستەکانت وشک بن عەمر! چاک بزانە ئەم شەقازللەیەت شەقازللەیە لە بەنی هاشم! تا ئەم ڕۆژە هیچکەس بوێریی نەکردووە بێئەدەبیی وامان بەرامبەر بکات، چۆن شتی وات کرد! چیت ویست لە منداڵێکی بچووک! هێزت بەسەر منداڵێکی وادا تاقی دەکەیتەوە!› عەمری ناسراو بە ئەبوجەهل بێدەنگ بوو و هیچی نەگوت، دەیزانی ئەبولەهەب چەند کەللەڕەقە و نەیدەویست بە هیچ جۆرێک تووڕەی بکات و زۆر جار هەر خۆی بە بێباوەڕانی دەگوت: 'ئەممان ئەبولەهەب تووڕە نەکەن! ئەوەندەی چووە

بەرەی موحەممەد، هیچکەس ناتوانێت بیگەڕێنێتەوە!' هەر بۆیە بێدەنگ وەستابوو، نەیدەزانی چی بڵێت و ئەبولەهەب دیسان هاواری کرد: ‹هەر ئێستا لە ئەسپەکەت دابەزە، دەبێت تۆ چیت لە ئەو کردووە، ئەویش لە تۆی بکاتەوە!› ئەبوجەهل بێچارە لە ئەسپەکەی دابەزی و ئەم جار ئەبولەهەب ڕووی کردە فاتیمە و گوتی: ‹دەی! چۆن لێی دایت، بە هەمان شێوە لێی بدەرەوە! بە ناوی مەککەوە، بە ناوی بەنو هاشمەوە شەقازللەیەکی بەهێزی لێ بدە.›

فاتیمە سەرەتا لەبەر ئەوەی بەرامبەر پیاوێکی بەتەمەن وەستابوو، شەرمی کرد، ئاخر ئەو دەرسی ڕەوشت و ئەدەبی لەلای بابە گیانی خوێندبوو، چۆن شتی وا دەکات! بەڵام هێندەی نەبرد ئەبولەهەب تەماشای کرد و گوتی: ‹دەی! لەوە زیاتر مەحتەلم مەکە، گەر تۆ شەقازللەی لێ نەدەیت، من زۆر خراپتری پێ دەکەم و هەرچیی گەورە و خانەدانی بەنی هاشمە لێرە کۆی دەکەمەوە و دەرسی دادەدەم.› فاتیمە نەیویست بارودۆخەکە لەوە زیاتر ئاڵۆز ببێت و تا هێزی تیا بوو شەقازللەیەکی مزری لە ڕوومەتی تووڕە و شینبووەوەی ئەبوجەهل دا و ئەبوجەهل تاسا، وەک بڵێی فاتیمە ئەو شەقازللەیەی لە بێباوەڕی دابێت و لە ئەو ڕۆژە بەدواوە هەرگیز توخنی فاتیمە نەکەوت.

ڕۆژ هات و چوو، فاتیمە گەورە بوو و خۆشەویستی و موحیببەت و ڕێزی بۆ باوکیشی بەردەوام بوو، بە درێژایی شەو لەتەنیشت باوکیدا بوو و تەماشای هەستان و دانیشتن

و حاڵ و ڕەفتار و کردار و پەرستشەکانی دەکرد و یەک-یەک لەنێو ڕۆحیدا بوونی بابە گیانی دەنەخشاند...

خۆشەویست بە درێژایی شەو هەمان نزای دەکرد و بە دەنگێکی کز و بەدەم گریانەوە دەلالایەوە و فاتیمەش سەری دادەنەواند، تەماشای لێوی دەکرد و گوێی شل دەکرد: ‹ئومەتەکەم... ئومەتەکەم!›

هۆن-هۆن ئەشکی دەڕشت لەگەڵ باوکیدا و تا بەرەبەیان دووبارەی دەکردەوە: ‹ئامین...! اللهم امین...›

پێغەمبەر بە درێژایی شەو بۆ ئومەتەکەی دەگریا و تاکە خەمی ڕەزامەندیی خودا و ڕزگاریی ئومەتەکەی بوو، بەڵام حەیف و خەسار کە ئومەتەکەی بێئاگا بوون و قەومەکەی نەزان... لە یەکێک لە ئەو ڕۆژانەدا کۆمەڵێک گەنج ڕێیان بە خۆشەویست گرتبوو و لەگەڵ ئەوەی چەندین قسەی ناخۆشیان پێ گوتبوو، پیسی و شەخەڵیشیان بەسەردا فڕێ دابوو و کە بە ئەو جۆرە گەڕابوویەوەماڵەوە، فاتیمە لەگەڵ پاککردنەوەی جلەکانی باوکیدا هەنسکی دەدا و باوکی خۆشەویستی دڵی دەدایەوە: ‹مەگری کچەکەم...! ئاساییە، قەیدی نییە، بە ئاو پاک دەبێتەوە...›

ئازیز لە لایەکەوە کچەکەی بە ڕۆحێکی جەنگاوەری و بەرخۆدانانە پەروەردە دەکرد و لە لایەکی دیکەوە دڵی ناسک و کچانەی پڕ دەکرد لە ئارامی و هەستی پارێزراوی و دڵی دەدایەوە و دەیفەرموو: "مەگری گیانی بابە، خودای باڵادەست باوکت دەپارێزێت، باوکت خودای بەسە بۆ پارێزگاری لە

خۆی و پەیامەکەی."

فاتیمە بە ڕوخسارێکی تەڕەوە باوەشی دەکرد بە باوکیدا و سوکنایی دەهات بە دڵیدا.

فاتیمە هێندە لەگەڵ باوکیدا بوو، شایەتحاڵی ئەمە و چەندین ڕووداوی ناخۆشی دیکە بوو و یەکێک لە ئەو جارانەی دیکە کە لەگەڵ باوکیدا بوو و هەر ئەوەندەی پێیان نایە نێو حەرەم، بێباوەڕان چواردەوریان گرت و هەڵیان دایە:

‹تۆیت دەڵێیت من پێغەمبەرم؟›

‹بۆت نییە قسە بە بتەکانمان بڵێیت.›

‹هیچ کەس ناتوانێت لە دەستمان دەرباز بکات.› ئەمانەیان گوت و سەرگەورەکەیان هاتە پێشەوە و یەخەی ئازیزی گرت و ڕای وەشاند، فاتیمە هەناسەی لێ بڕابوو و خەمی ئەوەی بوو شتێک لە باوکە گیانی بکەن و ئازاری بدەن و ڕەسولەڵڵا بە ئەوپەری بوێرییەوە وەڵامی دایەوە: ‹بەڵێ! من هەموو ئەوانەم گوتووە!›

لەگەڵ ئەم وەڵامەیدا هەمووان پەلاماریان دا و عەباکەی پشتیان لە ملی ئالاند و هەناسەیان لێ بڕی و فاتیمە وەک پەپوولەی باڵشکاو دەگریا و هاواری دەکرد و داوای یارمەتیی دەکرد و ئەوانیش هەتا دەهات، دڕندانەتر پەلاماریان دەدا، تا ئەو ساتەی ئەبوبەکر بەهەڵەدەوان گەشتە جێ و قەرەباڵغییەکەی بڵاوە پێ کرد و هاواری کرد: ‹نیازتانە کەسێک بکوژن کە دەڵێن الله خودامە؟› هەر ئەوەندەی لێی دوور کەوتنەوە، ئازیز توند باوەشی بە فاتیمەدا کرد و هەوڵی دا قورسایی

و خەمی نێو دڵی بڕەوێنێتەوە، دیسان دڵنیای دەکردەوە کە خودا دەیپارێزێت، هەر ئەمانە نا، بەڵکوو فاتیمە هەموو ئەو جارانەش لەوێ بوو کە ئەبوجەهل عەباکەی ڕەسولی دەگرت و ڕای دەوەشاند و هەڕەشەی لێ دەکرد... فاتیمە... ئای لە فاتیمە، چەندی بینی و چەندی چەشت...»



## ڕۆژی پانزەیەمی چاوەڕوانیی عەلی

### فاتیمەی سەییدە

مانگ هەر ڕۆژەی شێوەیەکی وەر دەگرت و و ڕۆحی عەلییش وەک مانگی چواردەی ئاسمان لە هیلالەوە دەبوو بە پڕ، چەندە هەستێکی جیاواز و جوان بوو ئەو وەختانەی لە گشت لایەک و هەموو کەسێکەوە باسی کچەکەی ڕەسولی دەبیست، کە وەک خۆرێک لە جیهانیدا هەڵهاتبوو، وەک بڵێی تەماشای پەلکەزێڕینەیەک بکات کە چەندین چاو و چەندین زیهن و بۆچوون پێیان وا بوو ناوازە و تاکە و هەرساتێک ڕەنگی نوێ بپۆشێت. لە گەشتی گەیشتن بە فاتیمەدا تاکە پێت و تاکە وشەیەکیش بایەخ و گرنگیی خۆی هەبوو، لە گەشتی گەشتن بە فاتیمەدا کات بێدەنگ و سات تەنها تەماشاکەر بوو...

فاتیمە لەسەر زاری ژنانی مەککە و لەنێو دڵی ژنانی مەدینەدا بوو ئیدی: "حەبیبوڵڵا تەنانەت دڵی نایەت ناویشی بهێنێت، هیی ئەم گوڵەباخەی...» چاوەکانی فاتیمە جووتی ئەڵماسی ڕەشن، بە شەودا وەک مانگی ئاسمان دەبریسکێنەوە. کە تیشکی مۆم بەر ڕووی دەکەوێت، ئێواران ڕوخساری وەک

مانگی چوارده دەدرەوشێتەوە و عائیشە لەژێر ئەو ڕووناکییەدا کراس دەچنێ و بەرەکە تەسبیح دەهۆنێتەوە. تەماشاکردنەکانی چەشنی باوکی، ڕێکردنی هەر ئەو، زەردەخەنەکانی چەشنی ئەو، ڕەفتاری میسلی ئەو، خەدیجە بەردەوام پێی دەگوت 'ئەو کچەم کە زۆر لە باوکی دەچێت'، هەموو هەوڵی دڵخۆشیی باوکیەتی و هەرکات باوکی بەختیار دەبینێ، دەچێتە شادییەک لە ئەودیو سنووری دونیاوە. تێر نابێت لە تەماشاکردن و گوێگرتن بۆ باوکی. خۆشەویستیی فاتیمە بۆ ئازیز لە هەندێ کاتدا لە باوک و کچ زیاتر خۆشەویستیی شوێنکەوتوویەکە بۆ پێغەمبەرەکەی، موحیببەتێکە لە ئیمانەوە قووڵپی داوە، ڕاستی ئەوەیە ئیماندار دەبێت وەک فاتیمە پێغەمبەری خۆش بوێت و لە ئەو بچێت... هەرکات ڕەسولی ڕەحمەت دەچێتە ژوورێک، فاتیمە هەڵدەستێتە سەر پێ و بەڕێزەوە دەستی ماچ دەکات و سەیرتر لەوە ئەوەیە هەرکات فاتیمەش دێتە ژوورەوە، ڕەسولەڵڵا لەبەری هەڵدەستێت و چاوەکانی ماچ دەکات و لە جێی خۆی دای دەنیشێنێت! مرۆڤایەتی بە ئەو نرخ و ڕێزەی ڕەسول لە فاتیمەی دەگرت فێر بوون چۆن کچەکانیان خۆش بوێت، فاتیمەش لەبەرامبەر ئەو هەموو ڕێز و خۆشەویستییەی پێغەمبەری جیهانییان هەیەتی بۆی، نە زەڕەیەک غروور دەیگرێت، نە فیز و ناز. فاتیمە نازنامەی ژنی بەڕەوشت و بەسنوور و میهرەبان و بەسۆزە و سەرداری ژنانی سەر ڕووی زەوییە، هەر بۆیە پێی دەڵێین 'سیدە النساء' 'سەرداری خانمان'»...

## ڕۆژی شانزەیەمی چاوەڕوانیی عەلی

## فاتیمەی ڕاستگۆ

ڕۆژبەڕۆژ هاژەی نێو دڵی زاواکەی پێغەمبەر زیادی دەکرد و لەگەڵ هەڵهاتنی هەر خۆرێکی نوێدا ڕوویەکی دیکەی فاتیمەی دەناسی و هەر ڕوویەکی لەوی دیکە عەزیزتر و بەنرختر و گوێگرتن لە هەر وەسف و سەنا و جوانییەکی شیفا بوو بۆ ڕۆح.

"دەریای ڕاستگۆییە فاتیمە، هەر لە منداڵییەوە هەرگیز پەنای بۆ درۆ نەبردووە، دڵی ئەو جێی چڕبوونەوەی ئەو نورەیە کە لە باوکیەوە دەر دەچێت، هەمیشە لە خەمی ئەو ڕۆژەدایە کە دەچێتەوە حزوری خودا و دەزانێت لە ڕۆژی دواییدا شەرمەزاربوون و خەجاڵەتبوونی بەر دەرگای ئیلاهی سزا گەورەکەیە، نەک جەهەنەم...!

لەسەر ڕاستەڕێ دەڕوات و لە بچووکترین هەڵەش خۆی لا دەدات، بەڵام ئەمە ئینسانە، هەندێ جار بەبەزانی دەکەوێتە هەڵەوە و هەرکات پێی دەترازێت، دەستبەجێ تەوبە دەکات و هەمیشە نزای 'طرفە العین'ی لەسەر زارە:

"یا حي یا قیوم، برحمتک أستغیث، أصلح لي شأني کله، ولا تکلني إلی نفسي طرفة عین"

"ئەی حی و ئەی قەیوم، گشت کارەکانم ڕێک بخەیت و بۆ ساتی چاوتروکانێکیش نەمدەیتە دەست خۆم."

ژیانی ڕاستگۆ لە دونیادا تەنگ و لە کۆتاییدا ئاسانە و کێ دەزانێت، لەوانەیە فاتیمەش لە داهاتوودا زۆر بگری، زۆر بپیشێت، زۆر بچەژێت...

شەو درەنگ بوو و وەختی بڵاوەپێکردنی قەرەباڵغییەکە هاتبوو و ئومولئەیمەنی دایەن لەبەر خۆیەوە گوتی: "دەمی شەوە و چەرخی فەلەک لە دەوران ناوەستێ و هیچکەس نازانێت بەیانی چی لەگەڵ خۆی دێنێت. خێر و خۆشیمان بۆ بهێنی ڕۆژی نوێ، دڵمان مەئێشێنە و دڵت نائێشێنین... ڕاستگۆیی فاتیمە و سەنگینییەکەی بگەیەنە بە مرۆڤە جوانەکانی داهاتوو."

## ڕۆژی حەڤەیەمی چاوەڕوانیی عەلی

## فاتیمەی طاهرة (پاکوتەمیز)

بەدەم شنەبای شیرینی شەوانی مەدینەوە، کە لە پەلی دارخورماکانەوە شنەیان دەهات و لەژێر تیشکی مانگدا، کە تیشکەکانی دەدا لە لووتکەی ئوحود و لەوێوە دەشکایەوە سەر باخچەکانی مەدینە، حیکایەت و گێڕانەوەی ژیانی فاتیمە بەردەوام بوو و ژنان تاکە وشەیەکیان لە گێڕانەوەکان لەدەست خۆیان نەدەدا. چاوەکان ئەم جار لەسەر ڕوبەیە بوو، ئەو کچە هەتیوەی پێغەمبەر لە سایەی خۆیدا گەورەی کردبوو: "تۆ شەو و ڕۆژ لە ماڵێکدا لەگەڵ فاتیمەدا ژیاویت، پێمان بڵێ فاتیمە لەناو ماڵدا چۆنە."

"پاکوخاوێن بوو، زۆر پاکوخاوێن، جارێک هۆکاری هێندە گرنگیپێدانیم بە پاکوخاوێنی لە بەرەکە پرسی و بەم جۆرە وەڵامی دامەوە: ‹لەبەر ئەوەی لە بنەچەی پاکانە، کچی باوکێکی لە ئاسمان و زەوی هەڵبژێردراو و دایکێکی بە خاوێنی ناودارە و دەزانێت پاکوخاوێنی سیفەتێکی دەرەکی و ڕازێنەرەوەی جیهانی دەرەکی نییە و پاکڕاگرتنی ڕەوشت و ڕەفتاریش گرنگە

و مرۆڤی گەورە هەم دەرەوەی، هەم ناخی بەپاکی ڕادەگرێت، هەر بۆیە وەک خەدیجەی دایکی نازناوی تاهیرەی لێ نرابوو.›

‹چما ئێمەش چۆن ئەو نازناوە وەر بگرین؟›

بەرەکە وەڵامی دایەوە: ‹ئەوەڵین شت سەیرکردنەکانە، ئینسان دەبێ سەیرکردنەکانی پاک ڕابگرێ، تەماشاکردنی ناشرینی و حەرام بەنی ئادەم پەرێشان دەکات. ئینسان نابێت ڕێگە بدات چاوی پیس بێت، چوون چاو تەماشای پیسی دەکات و دڵ باجەکەی دەدات! مەردوم کە زوبان و گوێ و چاوی بەرەو حەرام کردەوە، ڕۆشنایی دڵی دەکوژێتەوە، فیکری پەرشوبڵاو دەبێت و ڕۆحی نەخۆش دەکەوێت و هەست و سۆزەکانی دەپرژێن و دەڕژێن... دەبێت تا دەتوانیت ئیمان و حەیا و ئەدەب بکەیتە قەڵا و پەنای بۆ ببەیت، فاتیمە قەڵایەکی لەو جۆرەی بونیاد نابوو...›

‹خاتوو فاتیمە کچی پێغەمبەرە، بۆیە توانیویەتی هێندە پاک بێت، ئێمە چۆن ئەوەمان پێ دەکرێت!›

بەرەکە زەردەخەنەیەکی کرد و وەڵامی دایەوە: ‹ئەی خۆ خەدیجە کچی پێغەمبەر نەبوو! لە سەردەمی لاوێتیدا ئەسپسوارێکی بەتوانا بوو و زۆر جار بەشداریی پێشبڕکێی ئەسپسواریی دەکرد و لە یەکێک لە دەمەوئێوارەکانی مەککەی پڕ ڕازدا سواری ئەسپەکەی دەبێت بۆ بەشداریکردن لە پێشبڕکێیەک، کە دەستپێک و کۆتاییەکەی تەنیشت کەعبەیە، کیژان بە سواری ئەسپەکانیانەوە لەژێر ڕۆشنایی تیشکی مانگی چواردەدا غار دەدەن و خەدیجە لەپێش هەمووانەوەیە

و شـاعیرێکی نـاوداری ئـەو سـەردەمە، کـە دەیبینێـت، هۆنـراوە بەسـەر قـەد و بـاڵا و پرچ و شانوشـکۆیدا دەهۆنێتـەوە و خەدیجـە پارەیەکی زۆر دەدات و ئەو هۆنراوەیـە گەشـتبێت بـە هەرجێیەک، کـۆی دەکاتـەوە و ناهێڵێـت مەحرەمیـەت و نەبینراوەکانـی ببنـە داسـتانی سـەر زاری خەڵکـی!»

کـە وا بێـت، کچـی پێغەمبەربـوون هەسـتێک بـوو لەنێـو دڵـی ئینسـان خۆیـەوە هەڵدەقـوڵا و دەکـرا کچـی پێغەمبەریـش نەبیـت و وەک ئـەوان مامەڵـە بکەیـت! بەنـدە هێنـدەی تەربیەتـدان و پاکڕاگرتنـی کەسـایەتی و نـاو و نەفسـی بەنـرخ بـوو لـە چـاوی خـودادا...»



## ڕۆژی هەژدەیەمی چاوەڕوانیی عەلی

## فاتیمەی زاهیدە (لەخواترس)

"غەیبەت نیشانەی ئینسانی بێدەسەڵاتە."

حەزرەتی عەلی

یەکێک بوو لە ئێوارە فێنکەکانی مەدینە و لەتەنیشت خانووە دارینەکانی تەنیشت دارخورما چڕەکانەوە دەنگی دوو کچی گەنج دەبیسترا، یەکیان ڕوبەیە بوو کە لەگەڵ فاتیمەدا گەورە ببوو، ئەوی دیکەش نەدای هاوڕێی نزیکی بوو، ڕوبەیە تازە هاوسەرگیریی کردبوو و لەگەڵ هاوسەریدا بژێویی ژیانیان لەسەر خورماکۆکردنەوەبوو و نەداش بە نیازی هاوسەرگیری چووبوویە سەر ڕێیەک و دڵی شکابوو. دوو هاوڕێ، هەرکاتێ بەیەکەوە بوون، باسوخواسیان بە جۆرێک لە جۆرەکان دەگەیشتەوە بە هاوسەرگیری. لە ناوەڕاستی گفتوگۆیەکی شیریندا بوون و نە ئاگایان لە پرشنگدانەوەی ئەستێرەکانی باوەشی ئاسمان بوو، نە مانگی پڕ، کە تیشکی بەسەردا دەباراندن، بێئاگا لە هیچ شتێک کە لە چواردەوریاندا ڕووی دەدا

و بەدەم قسەوباسەوە دەمی ئەو گوێنییانەیان دەدووررییەوە کە پڕیان کردبوو لە خورمای وشککراو و لە جێیەکدا نەدا دڵی پڕ بوو و گوتی: "ئەو کوڕەی خۆشی دەویستم و تا دوێنێ بەڵێنی هاوسەرگیریی پێ دەدام، لەناکاو و بێیاکانە جێی هێشتم و ڕۆشت، دەڵێن کچێکی لە من جوانتری دۆزیوەتەوە! هیچ متمانەم بە پیاوان نەماوە و وا، بڕوات عەبایەکی خوری دەدەم بە شانما و وەک شوانەکان حوشترداری دەکەم." هەردووک دایانە قاقای پێکەنین و وەختێ چاویان بەر چاوی یەک کەوت، ڕوبەیە لەژێر پێکەنینەکانی نەداوە ئازار و کزەیەکی قووڵی هەست پێ کرد: "تۆ پیاوە ڕاستەکەت هەڵنەبژاردووە! پیاوێک وەفاداری خودا بێت، هەرگیز کاری وا ناکات." نەدا کە زانیی ڕوبەیە هەستی بە بزیسکەی ئاگری نێو دڵی کردووە، دەستی کرد بە دەردەدڵ: "ماندوو بووم... ماندوو... قوفڵێکم داوە لە دڵم و ئیدی ئەستەمە کلیلەکەی بدەمە دەستی کەس..."

"دڵ ماڵی موحیببەتە! بێ خۆشەویستی بەرگە ناگرێت و دەبێتە ماڵێکی تاریکستان."

"خۆت حاڵم دەبینی! مەگەر هەر خودی خۆشەویستی نەبوو منی ئاوا پەرێشان کردا!"

"نا، هەرگیز! خۆشەویستی هەڵەیە، تۆی پەرێشان کردووە! دڵ زۆر بەنرخە و نابێت دەرگای بۆ هەموو کەس واڵا بکەیت، دڵ جێی تاکی حەق و بەدیهێنەرە و دەبێت ئەوانەی ئەویان خۆش دەوێت، بیانکەیت بە جێنشینی ئەوێ، هەرکێ لە ئەو دوور بێت، دڵت دەشکێنێ و خوێنی لێ دەتکێنێ."

"دەبێت زاهیدە بیت!"
"چۆن یانی؟"
"یانی نابێ بە چێژ و خۆشیی کاتی فریو بخۆیت، ئەوانەی دەزانن ئارەزووەکانیان دوا بخەن، دەبنە زاهید ئەی نەدا، زاهیدبوون واتا تاکە حاکمڕەوای دڵ خودا بێت و بێ لە ئەو دڵ تەسلیمی کەس نەکرێت."
"مەگەر ئینسانی لەو جۆرە بوونی هەیە؟"
"بێگومان هەیە! تەماشای خاتوو فاتیمە بکە، یەکێک لە نازناوەکانی زاهیدەیە."
"زاهیدە بە مانای چی دێت! دەبێت مانایەکی زۆر قووڵی هەبێت."
"بەرزترین مەرتەبەی بەندایەتییە! نهێنی و ڕازی بەندەبوون لەوێدا حەشار دراوە."
"بە مانای ڕوونەدانە بە ئارەزووەکانی نەفس، نەفس هەر ئەوەندەی ڕووت دایە، وەک منداڵێکی لاسار داوا دەکات و داوا دەکات، ئەوانەی ناز نادەن بە نەفسیان، هەم لە دونیا و هەم قیامەت دەگەن بە ئارامی، هەر وەک فاتیمە خاتوون، بە کەم دەژی، کەم دەخوا، کەم دەڵێت، کەم دەنوێت." بێدەنگییەکی کورت کەوتە نێوانیانەوە و شنەبای ئارام و شیرینی دارخورماکانی مەدینە قژی هەردووکیانی دەهێنا و دەبرد و بۆنی خورمای بە هەواکەدا بڵاو دەکردەوە و نەدا سەری لە گێژەوە دەهات و پرسیی: "شتی وا چۆن دەبێت! مەگەر ئینسان بۆ ئارەزوو و چێژی دونیا ناژی؟ مەگەر ئینسان

بۆ ئەوە ڕەوانەی جیهان نەکراوە زیاتر پێبکەنیێ و زیاتر ڕابوێریێ و زیاتر بژیێ!" ڕوبەیە تا ئەو ڕۆژە لە ماڵی نەبی چی فێر بووبوو، کۆی کردەوە و وەڵامی نەدای پیێ دایەوە: "دەبێت چێژ و ئارەزووەکان بە سنوور و لە بازنەی حەڵاڵدا بهێڵرێنەوە، خۆشی و خەم ڕاستییەکی نکوولّیلێنەکراون لە ژیاندا، چێژبینینی زۆر خۆشە، وەلیێ وەک هەنگوینی ژەهراوییە. ئەو ساتە سەرقاڵ و نوقمت دەکات لە خۆیدا، وەلیێ عومرێک داخی پەشیمانیت پیێ دەکێشیت. کۆتایی نایەت حەز و ئارەزووی ئینسان... هەمووان بەشوێن خواردن و خەوتن و حەوانەوە و گەڕان و پارە و پێکەنینەوەن و هیچکام لەوانەش نابنە یاری کەس، بشبن بە یار، یاری بێوەفان و لە نیوەی ڕیێ جێت دەهێڵن... هەر سانیەیەک کە لە ژیانمان دەڕوات، پیر دەبین، ماندوو دەبین، دەژاکێین، دەپرووکێین... ئەی نەدا ئامەدە بە، کۆچ دەکەین بۆ دونیایەکی دی و دەبێت هەرچیمان هەبووە و کردووە لێرە، بیدەین بە کۆڵماندا و چاوەڕیێ بکەین بزانین لەویێ دەمانکاتە خاوەنی خۆشبەختیی نەبڕاوە، یاخود تیاچوونی هەتاهەتایی...

دەبێت هەندێک شت دوا بخەین... بۆ ئەودیوی دابنێین... ئەم دونیایە گەر ویستیشی لێی بێت، ناتوانێت لەئاست چڕی و خەستیی هەست و داواکارییەکانی مرۆڤدا بێت، هەڵە لە دونیاشەوە نییە، دڵ بە هەستی کاتی ڕازی نابێت، بەشوێن مەنزڵگە و خاوەنی حەقیقیدا دەگەڕێت و گەر نەیدۆزێتەوە، هەموو دونیای لەبەر پێدا ڕاخەیت، خۆشبەخت نابێت... جار

هەیە زەردەخەنەیەکی گەرم، گفتێکی جوان، دوو چاوی ئاسکئاسا، یاخود بالآیەکی بەرزی شۆخوشەنگ، پرچێکی ئالۆزکاو یاخود ئاوریشم و زێڕ و سەروەت دڵی ئینسان دەبات، دەیبات، وەلێ هیچیان بۆشاییە گەورە شاراوەکەی نێو دڵ پڕ ناکاتەوە، ئینسان بەردەوام دڵی خۆی دەداتەوە، خۆی سەرقاڵ دەکات، بەشوێن خوێدا دەگەڕێت و لە کۆتاییدا دەگات بەوەی ڕێگا ناگات بە هیچکوێ و دەبێتە مەیخۆری مەیخانەکان... بۆ ئەوەی نەگات بەو جێیە، دەبێت جوانی جوانان بدۆزێتەوە..."

"مەگەر دەتوانێ!"

"ئەرێ، ئەرێ، دەتوانێت... هەرکێش بتوانێت، دەچێتە مەرتەبەیەک، سەروو ئینسانی ئاسایی."

"چۆن بگەینە ئەو مەرتەبەیە!"

"بە چەند جارێک بۆنکردنی گوڵ مەسەلەن... بە چێژوەرگرتن لە ئەو پارووەی دەیخۆین... بە نەبوون بە زیندانیی خاڵێک، بە نەخنکان لەنێو دڵۆپێک خۆشی یان خەمدا... بە مەستنەبوونی یەک نیگا... بە وننەبوون لەنێو یەک زەردەخەنەدا... بەوەی هەرچیی جوانە جوان بێ لات، چوون ئەو بەدیی هێناوە، بەوەی هەرچیمان خۆش ویست، لەپێناوی ئەوەدا خۆشمان بوێت کە خۆشەویستیمان بۆ ئەو زیاد بکات. ئیدی ئەو کات درکی گوڵەکانی نێو دڵ ناچن بە دڵدا و وەک خاتوو فاتیمە دەبین بە زاهید، لە ئەو دەچین... دەبین بە ئەو... بێهیوا مەبە، دەرگای دڵ دامەخە، بەهەشتەکەی ناو ناخت بدۆزەرەوە، خۆشی و حوزوری ڕاستی لەوێدایە."

"من زۆر دوورم لەوەی باسی دەکەیت، بۆ ئەوەی ببیت بە نزیکی خاتوو فاتیمە، دەبێت وەک ئەو بیت، تۆ تەماشایەکی حاڵی من بکە!"

"ئینسان هەر ئەوەندەی تەوبەی کرد و گەڕایەوە، قەڵەمی لێخۆشبوون دەهێنرێت بەسەر تاوانەکانیدا! مەگەر یەکێک لە ناوەکانی خودا 'ستار العیوب' 'داپۆشەری نەنگییەکان' نییە! پێغەمبەرەکەی خوداش هەر لەسەر هەمان ڕێیە و داپۆشەری عارییەکانی خەڵکییە، کچەکەشی هەر بەو جۆرەیە، بێخەم بە."

کیژی گەنج وەک بڵێی لە کەنار خەونێکی ئارامدا بێت، ڕۆحی پرشنگی ئارامیی دەدایەوە، خەونێک کە نەیدەویست هەرگیز لێی بەئاگا بێت، دەتوت پەڕی گوڵە پاش ئەوەی بارانێکی نەرمی بەسەردا دەبارێ و تەڕ و پاراوی دەکات و ژیانی دەگەڕێنێتەوە بەر.

کات درەنگی کردبوو و پەلی دارخورماکان بەنازەوە دەشنانەوە و ئەستێرەکان یەک-یەک دادەگیرسان و حیکایەتی عەشقەکان و فریودانەکان و پەشیمانییەکان لە هەموو جێیەک و گشت سەردەمێکدا وەک یەک بوون و شا بیت، پادشا بیت، یاخود گەدا، هەرکەس بەدەم دەرد و ناڵە و برینەکانی خۆیەوە دەتلایە و چەرخی دەورانیش بەدەوری هەموویاندا... کات وەک ئاو تێدەپەڕی و دەمێک بوو باسی گوڵەکەی خۆشەویست دەکرا و زۆری دیکەش مابوو باس بکرێت...

## ڕۆژی نۆزدەیەمی چاوەڕوانیی عەلی

## فاتیمەی زەهرا

لەنێو دڵی عەلیدا هۆنراوەی فاتیمە بەستەی دەدا و گەرچی نە چاو فاتیمەی دەدی و نە گوێ ئاوازی دەنگی ناسکی دەژنەفت، وەلێ لە گشت جێیەک باس باسی فاتیمە بوو... ئەوان دەیانگێڕایەوە و عەلی زیاتر دەیناسی، ڕۆژبەڕۆژ ئارەزووی ناسینی ئەم خانمە لەلایەن ژنانی مەدینەوە زیادی دەکرد و هەر ئەوەندەی شەو دادەهات و کاروباری ئەو ڕۆژە کۆتایی دەهات، هەمووان لە هەیوانەکەی ئوموئەیوب کۆ دەبوونەوە و ژنانی مەککەیان دەخستە ژێر بارانی پرسیار. ئەستێرەکانی ئاسمان بەشداریی ئەم شەوچەرانەیان دەکرد و ئەمشەو باس باسی جوانی و شۆخوشەنگیی فاتیمە بوو: "ڕووناکیی ڕووی لە مانگ دەچێت، بۆیە پێی دەڵێین زەهرا، چوون زەهرا بە مانای مانگی پڕ دێت، وەک چۆن حەزرەتی یوسف جوانخاسی پیاوانە، فاتیمەش شۆخوشەنگترینی ژنانە، جاری وا هەیە ئینسان شەرم دەکات تەماشای چاوانی بکات، چوون چاوەکانی کارێک دەکەن کە تەنها هەستی پێ دەکرێت و

دەر نابڕدرێت، دەبینرێت، بەڵام نیشان نادرێت... لە ڕوخساریدا پاکیی حەبیبوڵـلا و نەرمونیانیـی خەدیجـە و سـەبر و ئارامیـی زەینـەب و خۆشەویسـتیی کەلسـوم و ڕاسـتگۆیی ڕوقیـە کـۆ بووەتـەوە. برژانگرکانی پەردەی نوری ئیلاهییـە و بـە حورمەتـی ناسـکیی ڕووی، بێگیـان ڕۆحـی بـە بـەردا دێتـەوە."

چـەن ژنێـک لـە پشـتیوانان خۆیـان بـۆ نەگیـرا و فرمێسـک لـە چاوانیان هاتە خوارێ: "ئای خودایە، ئێمە چ قەومێکی بەختیارین! هەڵبژێـردراوی جیهـان بووەتـە میوانمـان و نازدارتریـنی ژنانـی جیهـان کۆچـی کـردووە بۆ شـارەکەمان، خودایـە، ئەمە چ بەختێکە! چ بەخشـندەییەک! لایـق بـە ئـەو مەرتەبەیـە بیـن یـا ڕەب..."

ئەوانـەی کردبوویـان بـە خـوو، گشـت دانیشـتنێکیان بـە هۆنراوەیـەک کۆتایی پێ دەهێنا، ئـەم جـار بەستەیەکیان بەسـەر جوانیـی فاتیمـەدا چـڕی:

«ئاوازی دەنگی وەک ئاوی قووڵایی بیرەکان
فێنک و سـەنگین.
بە بیرکردنەوە لێی دەڕەوێنەوە دەر دەکان و
جوان دەبێت جیهان.
لێزمەبارانی موحیببەت،
دەبارێنێ لەنێو دڵان،
بە زستانا، لە ناوەڕاستی زوقم و سەرمایا
چەکەرە دەکات خونچە و گوڵەباخان.»



# ڕۆژی بیستەمی چاوەڕوانیی عەلی

## فاتیمەی زانا

### حیکایەتی قەفتانێك

ئەو زاتەی عەرز و عەرش و وشکانی و ئاوی ئافراندبوو و مۆری خۆی لەنێو نهێنی و ڕازەکانی جیهاندا جێ هێشتبوو، فاتیمەشی لەنێو دڵی عەلیدا مۆر کردبوو... چاوەڕێ بوو عەلی و... نەیدەزنی ئەم چاوەڕوانییە چەنی دیکە دەخایانێت، بەڵام لەنێو تەسلیمییەکی قووڵ و مەراقێکی چڕدا بوو. تۆ بڵێی هۆکاری ئەم بێدەنگییەی نەبی چی بێت؟ بڵێی خوانەخواستە شتێکی نەشیاوی وتبێ یان کردبێ! یاخود کەمتەرخەمییەکی نیشان دابێ! عەلی بەدەم ئەم بیرکردنەوانەوە بیری لە منداڵیی فاتیمە و ئەو جوانییانە دەکردەوە کە لە ماڵی پێغەمبەردا دیبووی. ساڵی هەشتەمی پێغەمبەرایەتیی بوو، بێباوەڕانی مەککە بە خۆیان و ماڵ و منداڵیانەوە سەنگەریان لە پێغەمبەر و موسڵمانان بەستبوو و بە چەندین جۆر و تەڵەکە ئازاریان دەدان و عەلییش بە دڵ و بە گیان لە خەمی پاراستنی خۆشەویست و خانەوەدەکەیدا بوو. لە یەکێک لە ئەو ڕۆژانەدا کە عەلی

پاسەوانیی ڕەسولی دەکرد و بەرامبەر کەعبە دانیشتبوو، نزای دەکرد، چەند ژنێکی خانەدان هاتنە حزوری و گوتیان: "ئەی مەحمەد! گەرچی لە هۆزی جوداین، بەڵام هەرچی بێت، لە هەمان شاردا دادەنیشین، هەر بۆیە داواکارییەکمان لێت هەیە."

"بفەرموون."

"ئەم ئێوارەیە ژنان و کچانی مەککە کۆبوونەوەیەکمان هەیە بە مەبەستی بەهێزبوونی پەیوەندییەکانی نێوانمان، حەز دەکەین فاتیمەی کچیشت بەشدار بێت، لەسەر ئیزنی ئێوە شەرەفمەند دەبین بە هاتنی و بەم جۆرە پەیوەندیی نێوانیشمان تۆخ دەبێتەوە، جا ئیزن دەفەرموون؟"

فەخری عالەم، کە هیچ داواکارییەکی جوانی ڕەت نەدەکردەوە، فەرمووی: "قسە لەگەڵ فاتیمە دەکەم و دەینێرم بۆلاتان."

وەختێ فاتیمە هاتە خزمەتی ئازیز، فەرمووی: "فاتیمە گیانم، خۆت دەزانیت کە فەرمانمان پێ کراوە وەفاکار بین بەرامبەر جەفاکار و ئاشنا بین بەرامبەر ئەوانەی وەک غەریب لێمان دەڕوانن و چاک بین بەرامبەر خراپ."

فاتیمە بە هەزار دڵ و گوێ گوێی بۆ بابە گیانی گرتبوو و دڵنیا بوو بۆ کارێکی گرنگ بانگی کردووە: "نوری چاوم! ژنانی عەرەب هاتن بۆ لام و داوایان کرد بچیت بۆ ئێوارەخوانێک کە بۆ ئێوارە ڕێک خراوە، من ڕەتم نەکردەوە و کەوتووەتەوە سەر ڕەزامەندیی خۆت، چی دەڵێیت؟"

فاتیمە چاوەڕێی داواکارییەکی لەم جۆرەی نەدەکرد و بە ئەوپەڕی شەرم و حەیاوە وەڵامی دایەوە: "بابە گیان، نوری

چاوم! گشت وشەیەکت بەرز و گشت وتەیەکت پیرۆزە، هەڵبەت دەچم بەدەم ئەو بەڵێنەی داوتە، بەڵام جلوبەرگی شاییستە بە جۆرە کۆبوونەوەیەکی لەو جۆرەم نییە! ئێستا ئەوێ کچانی ئەبولەهەب و ئەبوجەهل و عوقبەی لێیە و بە ئاوریشمی ئاڵووالا و خشڵ و زێڕ خۆیان دەڕازێننەوە، من چۆن بە ئەم جلە سادانەوە بچم! دڵنیام هیند و هاوڕێکانی قسەی ناخۆش و شکێنەر دەکەن و ئازارم دەدەن، بەڵام مەبەست لە ئەم قسانەم ئەوە نییە داواکەت ڕەت بکەمەوە، گەر دەتەوێت، هەر دەچم."

چاوی خۆشەویستی جیهان پڕ بوو لە ئەشک: "خەمی ئەوەت نەبێ کچم! بینینی ئەوان کورتمەودایە و تەنها جیهانی دەرەکی دەبینن و بێئاگان لە جیهانی مانا، پۆشاکی ڕازاوەی بەری ئێمە تەقوایە و تاجی زێڕینی سەرمان عیلم و ڕەزامەندییە، مادەم هەموو جوانییەک دەکەوێتە ژێر هێرشی پاییز و وشکی دەکات، گرنگیدان بە بووکێتی و ڕازەویی بەهار بۆچی؟ لەبیری نەکەیت کچم، گەر ئەوان پۆشاکیان جوان بێ، تۆش خاوەن خشڵی مەعنەوییت، هەتا ئەو ڕۆژەی بەرگی زانست و تەقوا بپۆشین، گرنگیدان بە دەرەوە بێئەنجامە."

باوک و کچ لەنێو ئەم گفتوگۆیەدا بوون وەختێ جوبریل هاتە حوزور و فەرمووی: "یا ڕەسولەڵا! فاتیمە دەچێت بۆ ئەم کۆبوونەوەیە و لەوێدا چەند نهێنییەکی پەنهان ئاشکرا دەبێت." لەگەڵ بیستنی ئەمەدا، ڕەسولەڵلا فەرمووی: "کچی جوانم! ئێستا جوبریل هات و فەرمانی پێ دام بەشداری لە ئەو کۆبوونەوەیەدا بکەیت."

فاتیمە سەری دانەواند و سێبەری برژانگەکانی کەوتە سەر کوڵمەکانی و لە شەرمدا سوور بوویەوە و هیچ قسەیەکی بۆ گوتن نەما و گوتی: "گیانم قوربانی گیانت بابە گیان، گەرچی کۆبوونەوەی بێئامانج و قسەوقسەڵۆک کاری ئێمە نییە، بەڵام مادەم ئیزنتان فەرمووە و خوداش فەرمانی داوە، بەشداریی ئەم ئێوارەخوانە دەکەم."

ئێوارەی هەمان ڕۆژ بە مەبەستی بەشداریکردن لە ئێوارەخوانەکە فاتیمە لە ماڵ چووەیە دەرەوە.

ژنانی عەرەب دەستەدەستە دەگەیشتن و بە جلە باقوبریقاوی و خشڵ و متوموورووەکانیانەوە خۆیان دەنواند و جارجار تەماشایەکیشیان دەکرد بزانن فاتیمە هاتووە یان نا و بە پێکەنین و گاڵتەجاڕییەوە دەیانگوت: "بزانین کچەکەی موحەممەد چۆن دێتە نێوانمان." "بزانین هەستی چۆن دەبێت کە ئێمە بەم شانوشکۆیەوە دەبینێ و تەماشای جلە سادە و بێئەرزشەکانی خۆی دەکات و نازانێت چی بکات بەرامبەر شانوشەوکەت و جلوبەرگی شاهانەی ئێمە." هەمووان قاقایان لێدەدا و لەناکاو هەموو چاوەکان بەرەو دەرگاکە سووڕان؛ فاتیمە هاتە ژوورەوە و هەمووان واقیان وڕ مابوو بەدیاریەوە، لەپێش هەموو شتێک، تاجەکەی سەری سەرنجی هەمووانی ڕاکێشا، قەفتانێکی شاهانەی بێوێنە و ناسک بە شانیەوە و لە چاوەکان زیاتر فیکر و هۆشیان مەست ببوو، لە جێی خۆیان ڕەق ببوون و زمانیان لاڵ ببوو بەرامبەر جوانی و شۆخوشەنگیی فاتیمە و هەمووان لەبەر خۆیانەوە دەیانوت:

"ئەمە کێیە!" "کچی کامە سوڵتانە! چ جوانییەکە!" فاتیمە وەک شاژن بەناویاندا ڕێی دەکرد و یەک-یەک بەکزی دەیانگوت: "بەخێر بێیت! ئاوەدانت کردەوە ئەی فاتیمە." وەک ژنانی میسر کە لە حەیبەتی یوسفدا دەستیان بڕی، ژنانی مەککەش لەئاست جوانیی فاتیمەدا دڵیان پارچەپارچە بوو، یەک-یەک لێی نزیک بوونەوە و چواردەوریان گرت و لە ئیرەییدا پرسییان: "ئەمە چ قەفتانێکە ئەی فاتیمە!"

"لە هیچ جێیەک قوماشی لەو جۆرەمان نەدیوە، لەکوێت کڕیوە؟"

"ئەی ئەو بۆنە! ئەو بۆنە سەرمەستکەرەت لەکوێ کڕیوە!"

یەکێ لە ئەو ژنانەی کە وەخت بوو لەژێر بزیسکەی ئاگرینی ئیرەییدا شەقی دەبرد، وتی: "ئەی فاتیمە! بەڵێن بێت گەر پارچەیەک لە قوماشی ئەم قەفتانەم پێ بدەیت، موسڵمان دەبم." لە کاتێکدا نیەتی تەنها پارچەکردنی قەفتانەکە و شێواندنی بوو، یەکێکی دی لەولاوە هەڵی دایە: "گەر پارچەیەک بدەی بە من، منیش موسڵمان دەبم!" فاتیمە یەکی پارچەیەکی دانێ و بردیانە لای قوماشفرۆشە یەهودییەکەی بازاڕ و پاش ئەمدیوودیوکردن و دەستلێدانی، چاوی ئابڵەق بوو و سوێندی دەخوارد: "ئەم قوماشە سەر بە ئەم جیهانە نییە! نا، سەر بە ئێرە نییە! لەکوێ دۆزیوتانەتەوە؟"

پاشان قوماشفرۆشەکانی دیکەی لێ کۆ کردەوە و هەمووان هەمان قسەیان دووبارە دەکردەوە: "ئەم قوماشە بە دەستی بەنی ئادەم نەچنراوە! تەماشای ڕەنگەکانی بکەن!" بەهەڵەداوان

گەڕانەوە و دەبینن ئەو دوو پارچەیەی لە قەفتانەکەیان کردووەتەوە، وەک خۆی لێ هاتووەتەوە و هەمووان لەئاست ئەو ڕووداوە و جوانیی فاتیمەدا موسڵمان بوون، ئەوانە نەبێت کە بزیسکەی شەیتانئاسا لەنێو دڵیاندا بوو، دەیانگوت: "کچەکەی موحەممەد جادووی لێ کردووین!"

هەموو ئەمانە لە کاتێکدا کە فاتیمە بە هەمان ئەو کراسە سادەیەوە ڕۆشتبوو کە ڕۆژانە لەبەری دەکرد و ئەوەی بینیبوویان قودرەتی ئیلاهی و حاڵی مەعنەویی فاتیمە و بزیسکەیەک بوو لە جوانییەکانی بەهەشت! زۆرینەی ئافرەتانی کۆبوونەوەکەی بەرەو ئیمان بردبوو و ئەوانەش کە بەرگەی جوانیی فاتیمە و توانایی خواداکەی موحەممەدیان نەگرتبوو، کۆبوونەوەکەیان جێ هێشت. فاتیمە ڕووی لەوانە کرد کە ئیمانیان هێناوە و فەرمووی: "ئەی خانزادەکانی قورەیش! ئەو پەیامەی باوکم هێناویەتی، دەبێتە هۆی خۆشبەختیی دونیا و قیامەت و گەر ئێوەش دەتانەوێت لە ئێمە نزیک بن و لە ئێمە بن، نوری ئیمان لە دڵەکانتانا دابگیرسێنن و کەلیمەی شەهادەت بهێنن و ئیسلام قبوڵ بکەن." لەپاش ئەمە هەمووان شایەتومانیان هێنا و فاتیمەش خۆشبەختانە گەڕایەوە ماڵەوە...

## ڕۆژی بیستویەکەمی چاوەڕوانیی عەلی

## فاتیمەی موجاهیدە

حیکایەتخوانی ئەو شەوەش بەرەکە بوو و دەیگێڕایەوە: "ساڵی سیازدەهەمی پێغەمبەرایەتی بوو و لە دارونەدوەوە بڕیارێکی ترسناک دەر چوو؛ چل پیاوی بەهێزی چل هۆز پەیمانیان دا خۆشەویست بکوژن و بڕیار وا بوو کە شەو داهات گەمارۆی ماڵەکەی بدەن و بیکوژن. پلانی ئەوان ئەوە بوو، بەڵام هیی خودا زۆر جیاواز بوو. ئێمە بێئاگا بووین لە ئەم پلانە، بەڵام پێغەمبەر دەمەونیوەڕۆ بە مەبەستی سەردانکردنی ئەبوبەکر لە ماڵ دەر چوو و لە ئارامی و سوکناییەکی جیاوازدا بوو، دیار بوو لە ئاسمانەوە هەواڵی گرنگی پێ گەیشتووە و دواتر کە ئێوارە داهات، عەلیی بانگ کرد: ‹لەلایەن خوداوە فەرمانم پێ گەیشتووە و ئەمشەو مەککە جێ دەهێڵم، تۆ ئەمشەو لە جێگاکەی مندا بخەوە، ئەم بەتانییە سەوزەم بدە بە خۆتدا و هیچ مەترسە، بە ئیزنی خودا هیچکەس ناتوانێت زیانت پێ بگەیەنێت.›

‹گیانم فیدای گیانت یا رسول الله.›

ڕەسولەڵڵا چەند ئەمانەتێکی دایە دەستی: ‹ئەمانە چەند ئەمانەتێکی قورەیشن لای من، کە من ڕۆشتم بیدەرەوە دەستی خاوەنەکانیان و هەرکات هەواڵیشم نارد، خانەوەدەکەم بهێنە و وەرن بۆ لام.›

عەلی ئەمانەتەکانی وەر گرت و هەرچیی پێی وترابوو، بێ لەحزەیەک بیرکردنەوە جێبەجێی کرد.

دڕندەکانی قورەیش یەک-یەک و دوو-دوو دەوری ماڵەکەیان دا و هەموومان لە ژوورەوە زۆر دەترساین، عەلی خۆی دایە دەستی خودا و لە جێگەکەی نەبیدا ڕاکشا، ڕەسولەڵڵاش ماڵئاوایی لە خانەوەدەکەی کرد و نیوەی شەو لە ماڵ دەر چوو و لەگەڵ دەرچوونیدا مشتێک خۆڵی کرد بە هەوادا و هەمووان کەوتنە خەوێکی قووڵەوە و هەمان نزا لەسەر زاری بوو:

‹وَجَعَلْنَا مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ›

‹لەمپەرێکمان لەپێشیانەوە داناوە و لەمپەرێک لە پشتیانەوە؛ تارماییشمان هاویشتە سەر گلێنەیان کە نابینن.›

(سورەتی یس)

ئەو شەوە کەسمان خەومان لێ نەکەوت و شەوێکی تا بڵێی دووردورودرێژ و تاقەتپڕوکێن بوو، لەگەڵ یەکەم گزنگەکانی خۆرهەڵاتن لە جێگەکانمان بەرز بووینەوە و بێباوەڕانیش لە دەرەوە بەئاگا هاتن و دەنگی دەرهێنانی چل شمێر لە کێلانەکانیان خورپەی بە دڵدا هێناین. بەهەڵپە خۆیان کرد بە ژووردا و پیاوانێکی پەست و توورە بوون و بۆنی خوێنیان

لێ دەهات و پەلاماری بەتانییەکەی ڕەسولیان دا و هەمووان سەریان سوورِ ما لەوەی بینییان و عەمر هاوار کرد بەسەر عەلیدا: ‹بۆچی لە ئەم جێگەیەدایت!›

یەکێک لە پیاوەکان لە ئەولاوە هەڵی دایە: ‹ئەمان، ئەوە عەلیی کوڕی ئەبوتالیبە، باوکی ڕێزێکی زۆر لە بتەکانمان دەگرێت، پەنجەی بۆ نەبەن.›

چل دڕندەی بێبەزەیی و چل شمشێر لەسەر سەری وەستان: ‹لەکوێیە؟›

‹خێرا قسە بکە، لەکوێیە؟›

‹هەر دەیکوژین ئەمڕۆ، پێمان بڵێ لەکوێیە؟›

عەلی دووبارە و دەبارە وەڵامی دەدانەوە: ‹نازانم!› عەمر کە زانیی لە عەلی هیچی دەست ناکەوێت، بەرەو ڕووی فاتیمە ڕۆشت و شانە ناسکەکانی ڕاتەکاند و بەوپەڕی تووڕییەوە پرسیی، ‹باوکت لەکوێیە؟›

‹نازانم!›

‹با، دەزانیت، دڵنیام دەزانیت، لەکوێیە؟›

فاتیمە هاواری کرد بەسەر عەمری ناسراو بە ئەبوجەهلدا: ‹چیتان لە باوکم دەوێت؟› ئەبوجەهل ئەوەندەی تر شێت بوو و دەستە گەورە و بێبەزەییەکانی بۆ جاری دووەم لە فاتیمە بەرز کردەوە و شەقازللەیەکی هێندە بەهێزی لێ دا، سەرپۆشەکەی کەوتە سەر شانی و گوارە ناسکەکەی گوێی کەوتە خوارەوە. فاتیمە زۆر عەزێتی بوو... زۆر... بەڵام یەک ئۆفی نەکرد، سەری خۆی دەدا و نهێنییەکەی نەدەدا! ژاوەژاو و دەنگەدەنگی هەمووان

تێکەڵی بەیەک بوون و گوتیان: ‹ئەمشەو موحەممەد ڕۆشتووە و هەرکێ بیدۆزێتەوە، سەد حوشتری بەدیاری پێ دەدرێت.› سواری بەتوانا و تیروەشێنی کارامە و شوێنپێهەڵگرە زرنگەکان شوێنی کەوتن و فرمێسک لە چاوانی من نەدەبڕا، بەڵام فاتیمە و عەلی وەک ئاسن بەهێز و سەنگین وەستابوون و دەپاڕانەوە.

بێباوەڕان ماوەی سێ ڕۆژ و سێ شەو دەشت و کێو و بیابان بەشوێنیدا گەڕان، بێئاگا لەوەی پارێزەری ئەو ڕەحمان بوو و دەمێک بوو مەککەی جێ هێشتبوو. گەرچی ئاسان نەبوو دوورکەوتنەوە لە شارە قەدیمەکەی خودا، بەڵام خەڵکی شار لە کۆتاییدا ئەو پێغەمبەرەی لە ئامێزی شارەکەیاندا گەورە ببوو، بە دەرکردنیان دا، گەرچی هیچ شارێک ئەوەندەی مەککە شیرین نەبوو لای حەبیب... بەڵام بەناچاری جێی هێشت...

لەبەر خۆمەوە بەهەنسکەوە دەمگوت: ‹ئاە مەککە! منداڵە ڕەسەنەکانت، کە لە ئامێزی گەرمتدا گەورەت کردبوون، بستێ خاکیان بە شاهی ئەنبیا ڕەوا نەبینی...›

کە دواتر ئێمەش کۆچمان کرد و بەیەک شاد بووینەوە، ڕەسولی گەورە بۆی گێڕاینەوە کە ئەو شەوە، پاش ئەوەی لە مەککە دەر چووبوو، سەرەتا چووبوویە سەر کێوی سەبیر و کێو کەوتبوویە گۆ: 'یا رسول الله! تکایە لەسەر پشتی من دابەزن، دەترسم لە کۆشی مندا بریندارت بکەن و خودا سزام بدات!'

لەو ساتەدا کێوی صور هاواری لێ کردبوو: ‹یا رسول الله! إلي...! بەرەو لای من وەرن!›

هەر لەبەر ئەم ڕازەیە لای ئەهلی دڵ، کە دەچنە سەر کێوی سێبیر، هەست بە ترس دەکەن و لە صور هەست بە دڵنیایی... ڕەسولەڵڵا بە هاوەڵیی جوبریل ئەوشەوە لە کێوی صور مابوویەوە و کە چواردەور ئارام ببوویەوە، بەردەوام ببوو لە ڕێگا. خۆشەویست لە هەر چواردەورەوە بە مەترسی دەورە درابوو، بیابان هەر وەک نێو حیکایەتە قەدیمەکان ترسناک و خنکێنەر و تۆقێنەر بوو، ئینسانی قووت دەدا و هەتاهەتایە جەستەکەشی نەدەدۆزرایەوە. ئەرز و ئاسمان زەردی دەکردەوە و خۆر وەک تۆپێکی ئاگرین بەسەر سەریانەوە دەسووتا و دەنکە لمەکان دەچزان بە جەستەدا و پێغەمبەری نازدار بە ئەو ڕێیە نەشیاوەدا ڕێی دەکرد... فاتیمە لە ئەو ساتەوەی باوکی ڕۆشتبوو تاکوو ئەو ساتەی هەواڵی لێ بیست، بەڕۆژوو بوو، دەمی بۆ هیچ نەبرد و بەدەم هەنسکەوە دەیگوت: ‹ئەی باوکی شیفای گیانم، تۆ لەلای ئەوانەی خۆشیان دەوێیت، لە گیان و خوێن بەنرختری، خۆشەویستیت ئاوە... خۆشەویستیت نانە... خۆشەویستێکی لە ژیان عزیزتر و حەسرەتی دووریت هەر لە ئێستاوە هەناسەی لێ بڕیوم. بێ تۆ، بێ هەناسە و چرپەم، ئەو زاڵمانەی بە ئەم حاڵەیان بردی دەدەمە دەست ناوی ' قهار ' ی خودا و تۆش دەدەمە دەست دەسەڵاتی ناوی «قادر»ی خودا. گەر دەبینی بێ تۆ چۆن هەڵدەلەرزم، چۆن باخ و گوڵستانی نێو دڵم وشک بووە... جگە لە ڕەحمی ڕەحمان، پەناگەیەک شک نابەم.› هەتا ئەو ساتەی ئەسمای کچی ئەبوبەکر هەواڵی سەلامەتیی سەروەری دا بە فاتیمە، ئۆقرەی نەبوو و جڕوجانەوەرەکانی

مەککە بێئاگا بوون لەوەی ئەم ئینسانە عەزیزترینی کەونە، بەو جۆرە ئازاریان دەدا... دڵانێک بوون نوری ڕەسولیان دیبوو و هێشتا لە بەرد ڕەقتر بوون و فاتیمەیان لە دووریی باوکیدا وەک گوڵێکی بێئاو سیس و لاواز کردبوو...

عەلی ئەمانەتەکانی دایە دەست خاوەنەکانیان، کە چەندین ساڵ بوو دەیاندایە دەست ڕاستگۆی ئەمین بۆیان بپارێزێت و تەنانەت هاوسەری ئەبوجەهل خشڵ و زێڕەکانی دابوویە دەست و وتبووی: ‹ئەی موحەممەد! عەمری هاوسەرم پیاوێکی زاڵمە و دەترسم لە ساتێکی تووڕەبووندا هەموو ئەمانەم لەژێر دەست دەر بهێنێت، با لای تۆ بن پارێزراو دەبن، کە ڕۆژی خۆی هات، لێت وەر دەگرمەوە.›

ڕۆژی خۆی هاتبوو و... عەلی ئەمانەتەکانی یەک-یەک دایە دەست خاوەنەکانیان و لە کۆتاییدا لەتەنیشت کەعبەوە هاواری کرد: ‹ئەی خەڵکی مەککە! هیچکەس ماوە ئەمانەتەکەی وەر نەگرتبێتەوە؟ هیچکەس هەیە ڕەسولەڵلا لە بابەتێکدا پەیمانێکی پێ دابێت؟› چاوەڕێی کرد و کەس هیچی نەگوت و تێگەیشت هەمووی حەقی خۆی وەر گرتووە.

ئیدی لەوەبەدوا مەککە لەوە دەر چووبوو موسڵمانان بتوانن تێیدا بژین و ڕەسولەڵلا لە یەسریبەوە بە ئەبو وەقیدی لەیسیدا بڕێک زێڕ و نامەیەکی بۆ عەلی ڕەوانە کردبوو، تێیدا دەیفەرموو: ‹ئەی عەلی، هەرکات لە تەسلیمکردنەوەی ئەمانەتەکان تەواو بوویت، خانەوادەکەم کۆ بکەوە و بیانهێنە بۆ ئێرە.› عەلی دەستبەجێ دوور لە چاوان دەستی کرد بە ئامادەکارییەکان و

ئێمەش خۆمان کۆ کردەوە و فاتیمە و ئومکەلسوم بۆ دواجار چوونە گۆڕستانی حەجون و ماڵئاواییان لە دایکیان کرد و منیش لەوێ لەگەڵیاندا بووم... فاتیمە لەو ڕۆژە بەدواوە ناچار بوو بە حەسرەتی خاکی سەر گۆڕەکەی دایکیەوە بژی، گریا... زۆر گریا... هەنسکی دا... ماچی خۆڵەکەی کرد... باوەشی کرد بە گۆڕەکەیدا و ماڵئاوایی لێ کرد، چوون لە ساتی کۆچکردنی خەدیجەدا فاتیمە بەدەم هەنسکەوە پەیمانی دابوو باوکی تەنها نەکات: ‹خەم مەخۆ دایکە گیان! خۆم ئاگاداری باوکم دەبم.› ئیدی لەوەبەدوا فاتیمە بەردەوامیی بە شۆخوشەنگی و شکۆمەندیی خەدیجە دەدا، ئیدی فاتیمە دەبوو بە وێنەی بەرجەستەکراوی ئەو کەڵەژنە، ئیدی خەدیجە لە ڕێی فاتیمەوە هەناسەی دەدا...

دواتر بەنهێنی چوون ماڵئاواییان لە زەینەبی خۆشکیان کرد، کە مێردەکەی بێباوەڕ بوو و دەبووایە لە مەککە بمێنێتەوە و دواتر بە هەنگاوی قورس و شکاو ملی ئەو ڕێیەی گرت، کە دیوێکی کێوی نور و ئەوی دی ئوحود بوو، ئەو ڕێیە تەنها ڕێیەک نەبوو، بەڵکوو پردی سیراتی بەندایەتی بوو، ڕێی سەختی سەبر و ئارامی بوو. فاتیمە دەبووایە بڕوات و پێی هەڵنەکەوێت، نەلەرزێت، نەکەوێت، بەردەوام بێت... ناچار بوو ئەو بارە قورسەی کەوتووتە سەر شانە ناسکەکانی وەک گەنجینەیەک هەڵی بگرێت، وەختی چۆکدادان و کۆڵدان نەبوو، سەری بەرز و نیگاکانی تیژ، وەک بابە گیانی بە هەمان ڕێگەدا دەڕۆیشت و دەبوو بە نموونەی ئەو ژنەی خودا وێنەکەی لەسەر زەمان کێشابوو...»



## ڕۆژی بیستودووەمی چاوەڕوانیی عەلی

### فاتیمەی ئەدیب

عەلی کاروانێکی پێکهێنا، کە لە فاتیمە و ئومولکەلسومی کچی ڕەسول و فاتیمەی کچی ئەسەد و فاتیمەی کچی زوبەیر و فاتیمەی کچی حەمزە و ئەیمەنی کوڕم پێک هاتبوو و بەیەکەوە و بە ناوی پڕ تەلیسمی بسمیلا دەستمان بە کۆچ کرد بەرەو لای خۆشەویست و عەلی پاڕایەوە: "ئەی خودای بالادەست، بە حورمەتی ناوی ئەعزەمت کارمان ئاسان بکەیت."

"ئەی خاوەنی عەرش و عەرز، بە حورمەتی ئەو خۆشەویستەت کە ناوی موحەممەدە، چاوی دوژمنانمان لەسەر لا بدەیت." سەرەتا ئەبووەقیتی لەیسی، کە پێغەمبەر ناردبووی، حوشترەکانی تاو دەدا و هێندە خێرا دەڕۆشتین، بەسەر پشتی حوشترەکاناوە بەرز دەبووینەوە و دەماندایەوە بە پشتیاندا و لە تەپوتۆزدا هیچمان نەدەدی، عەلی ناڕەحەت بوو و فەرمووی: "ئەی ئەبو وەقید! ئەم ڕۆشتنە زۆر سەختە بۆ خانمان! ئەوان لە جنسی حەوان! ناسکن."

"دەزانم، بەڵام دەترسم شوێنپێمان هەڵبگرن و پێمان بگەنەوە."

"ئارام بە... ئارام بە... پێویست بە ئەو پەلەپەلە ناکات... ڕەسولەڵلا پێش ئەوەی بڕوات، پێی فەرمووم: 'ئەی عەلی، لە ئەم ساتەوە ناتوانن هیچت بەسەر بێنن." هەموومان هەناسەیەکی ئارامبمان هەڵمژی و لەدوای ئەوەوە عەلی پێشڕەویی کاروانەکەی کرد و نەرم و لەسەرخۆ و هێواش ڕێمان دەکرد و بەدەم خۆیەوە دەیگوت:

"لەبیری نەکەیت!
تۆ خودات هەیە!
کۆتایی بە هەموو گومانە خراپەکانت بهێنە،
لە هەر کارێکدا و هەر هەنگاوێکدا کە هەڵی دێنی،
خودای جیهان و ئینسانت بەسە لەپشتت بێت."

حوشترکان بەنازەوە پێیان هەڵدەنا و بیابانی سەختیان دەبڕی و تیشکی ڕۆژ لەسەر دوو حۆریی جیهان دەدرەوشایەوە؛ فاتیمە و ئوموکەلسوم. بیابانی هەڵماوی ئامێزی خۆی بۆ ڕێبوارانی کۆچ کردبوویەوە...

بەرەو یەسریب ڕێمان دەکرد و لەناکاو هەستمان بە تەپەتەپی ناڵ و حیلەحیلی چەند ئەسپێک کرد لە پشتمانەوە، ئاوڕمان دایەوە و دەبینین حەوت لە بەتواناترین تیرهاوێژەکانی قورەیشن، دەوریان لێ داین و چواردەوریان گرتین و عەلی حوشترەکانی ڕاگرت و شمشێرەکەی دەر کرد و ڕووبەڕوویان وەستا، یەکێکیان هاواری لێ کرد: "هێواش عەلی! هێواش! وات دەزانی دەتوانی خانمانی خانەوادەی موحەممەد ببەیت و

ڕابکەیت لە دەستمان! هەر ئێستا ئاڕاستەی کاروان پێچەوانە بکەنەوە و بگەڕێنەوە."

عەلی زۆر بوێرانە و بەجەرگانە وەڵامی دایەوە: "ئادەی وەرن بمگەڕێننەوە!" هەمان دەنگ بە تۆنە گڕ و بێزارکەرەکەی دیسان هاواری کرد: "بگەڕێرەوە وتم! ئەی لە دینی باوک هەڵگەڕاوە!"

"ئەی ئەگەر نەگەڕێمەوە!"

"یا عاقڵانە پێشمان دەکەون و دەگەڕێنەوە، یاخود سەرت دەبڕین و لەگەڵ خۆمان دەیبەینەوە."

قاقایەکی قێزەونیان لێدا و بۆ ئەوەی خانمەکان زیاتر بترسێنن، نزیکتر بوونەوە، هەمووان لە حەیبەتاندا سەرمان دانەواند و پەنامان برد بۆ خودا، فاتیمە پڕی کرد بە چەرشەفەکەی سەریدا لە ترسی ئەوەی بکەوێت، ئای ئەو دەستانە وشک بن کە بۆ فاتیمە درێژ کران... ئەو دڵانە گڕ بگرن کە ڕێگرییان دەکرد لەوەی فاتیمە بە بابە گیانی شاد بێتەوە. هێدی-هێدی نزیک دەبوونەوە و ئەم جار عەلی وەک هەورەبروسکە بەردەمی لێ گرتن و یەکێ لە دڕندەکان، کە ناوی جەناح بوو، شمشێرەکەی دەر کرد و پەلاماری عەلیی دا و عەلی کە زۆر شارەزای فێڵ و تەڵەکەی جەنگ بوو و بەپەلە خۆی نوشتانەوە و خۆی لە شمشێرەکە دەرباز کرد و کە بۆی دەر کەوت واز ناهێنن و پەلاماری ئەسپ و حوشترەکان دەدەن تا فڕێمان بدەنە خوارەوە، تا هێزی تیا بوو شمشێرێکی دا لە ملی جەناح و خەڵتانی خوێنی کرد و لە جێی خۆیدا مرد. ئەوانی دی کە ئەمەیان بینی، تۆقین و بەپەلە ئەسپەکانیان تاو دا و غاریان دەدا و کە بینییان عەلی

کۆڵ نادات و بەشوێنیانەوەیە، پاڕانەوە: "کوڕەکەی ئەبوتاڵیب! بە خاتری باوکت یەخەمان بەر بدە!" عەلی هاواری کرد، "ئەوە من دەچم بۆ لای ڕەسول الله و ئەوەی خوێنی خۆی لێ زیادە، با شوێنم بکەوێت!" بەو جۆرە بێباوەڕان لەنێو تەوپوتۆزی غاری ئەسپەکاندا دیار نەمان و لە بەرچاو ون بوون. گەرچی هەر بە یەکەم هەوڵ دووری خستبوونەوە، بەڵام ترسی ئەوەی هەبوو کە ئەم جار بە کۆمەڵەیەکی گەورە و قەرەباڵغترەوە بێن، بەڵام عەلی لەپێناو گەیاندنی ئەمەناتەکەی ڕەسول، گیانی خۆی دادەنا، تاکە دڕکێک بچووایە بە پێی هەرکام لە خانەوەداکەیدا، دەچوو بە دڵی عەلییشدا، بەم جۆرە کۆتا کۆچبەرەکان بەرەو مەدینە دەستیان کردەوە بە ڕۆشتن و کێوەکانی مەککە لە دوایانەوە دەلاوانەوە: "بۆ کوێ دەچی فاتیمەی زەهرا!"

"بۆ کوێ دەچی مروارییە تاقانەکەی ڕەسول! خۆشەویست ڕۆیشت و خۆرمان ئاوا بوو و ئێستا تۆش دەڕۆیت و بەیەکجاری کۆستمان دەخەیت!"

"مەڕۆ کچەکەی خۆشەویست... وەها دەڕۆیت، هەرچی ئەستێرەیە بەشوێنتدا هاتوون و ئاسمانی مەککە بێئەستێرە بووە."

پەرەسێلکەکان سەریان شۆڕ کردبوو و کێوەکان دەلاوانەوە و زەوی لە خەفەتدا دەلەرزی و کەعبە ئەشکی خوێنینی دەڕشت و فاتیمە لە کەعبەوە دەچوو بۆلای نەبی، لە حەسرەتەوە بەرەو ویساڵ و تەنها عاشقان ڕێی سەختی بیابانیان پێ تەی دەکرا... تەنها عاشقان هێندە شاعیرانە و ناسکانە کۆچیان دەکرد..."

## ڕۆژی بیستوسێیەمی چاوەڕوانیی عەلی

## فاتیمەی خۆشەویست

"هێواش-هێواش لە مەنزڵ نزیک دەبووینەوە و هەرکات ماندوو و شەکەت دەبووین، پشووی کورتمان وەر دەگرت و منیش ئەوەندەی عەلی شانم نابوویە ژێر ئەمانەتەکەی ڕەسول و وەک چۆن لە کۆندا ئامینەم ناشت و کوڕە شیرینەکەیم ڕادەستی باپیری کرد، ئەمێستاش ئەمانەتەکانی خەدیجەم لەئامێز گرتبوو و دەمبردن بۆ لای باوکیان. جەستەی ماندوو و پیر و پەککەوتەم لە ڕۆژانی گەنجیم بەجستوجۆتر بوو، شنەبایەکی فێنک، کە نەماندەزانی لەکوێوە دێت، جارجار فێنکی دەکردینەوە و وەک بڵێی چۆلەکەکانی بیابانیش جیاواز لە جاران بجریوێنن، لە جۆشوخرۆشێکی جیاوازدا بوون. تیشکی ئاڵتوونیی خۆر دەیدا لە حوشترەکان و خێراتر و خێراتر دەڕۆشتن، زەردەخەنەیەکی شیرین کەوتبوویە سەر زاری فاتیمە، وەک چۆن یەعقوبی نەبی لە دووریی چەند فەرسەخەوە بۆنی یوسفی بۆ هاتبوو، فاتیمەش هەر لەو دوورەوە بۆنی بابە گیانی بۆ دەهات و ئەم گەشتە چەند شەو و ڕۆژییە خەریک بوو کۆتایی دەهات. ڕۆشتین و پشوومان دا و ڕێمان کرد

و دووبارە پشوومان دا و لە کۆتاییدا گەیشتین بە کاروانەکەی ڕەسول، کە لە گوندی قوبەی نزیک مەدینە چاوەڕێی دەکردین. لە کۆتاییدا سەوزایی و گوڵوگوڵزار جێی لم و زەردی و وشکیی بیابانی گرتەوە و پێمان نایە سەر زەویی مەدینە، لەوەبەدوا لە جێی لوورەلوور و دەنگی ترسناکی شەوانی بیابان، ئیدی گوێمان لە پەڕەسێلکەکانی یەسریب بوو. بۆنی میسک و عەمبەر ئاسای ڕەسول دەهات بەسەرماندا و پێمان نایە نێو خاکێک، کە ڕەنگ بوو تێیدا بمرین! ڕەسولەڵڵا پێشوازیی لێ کردین و عاشق بە مەعشوقی شاد بووەوە و فاتیمە بەحەسرەتەوە باوکی لەئامێز گرت و دەتوت ئێستا باڵەکانی جوبریل بەر سنگی کەوتووە، هێندە ئارامیبەخش و حوزووربەخش بوو و تێر دەستەکانی ماچ کرد و ئەشکی شادی وەک دوو ڕووبار بە چاوانیدا دەهاتە خوار و پاش ئەوەی لەژێر بۆنی لاهووتی و بەرامبەر ڕوخساری نوریندا حەواینەوە، جا مژدەی ئاتەیێکی پێ داین کە کەمێک بەر لەو ساتە بۆی دابەزیبوو:

‹الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ›

ئەوانەی کە یادی خوا دەکەن بەپێوە و بەدانیشتنەوە، بەڕاکشانەوە وە بیر دەکەنەوە لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی، (ئەڵێن) ئەی پەروەردگارمان، ئەمە (جیهان)ت دروست نەکردووە بەبێهودە، پاک و بێگەردی بۆ تۆ، دەسا تۆش بمانپارێزە لە سزای ئاگری دۆزەخ. ال عمران/١٩١

## ڕۆژی بیستوچوارەمی چاوەڕوانیی عەلی

## فاتیمەی بوشرا ‹مژدەبەخش›

شـەوەکان و شـیعرەکان و دڵۆپـە بارانـەکان بۆنـی مـژدەی ویسـاڵیان لـێ دەهـات و فاتیمـە لـە چاوەڕوانیـی ئـەوەی ببێتـە هاوسـەری عەلـی، وەک ئـەو یەکـەم ڕۆژەی گەیشـتنە یەسـریب دەخەنـی و لـەلای خەڵکـی مەدینـە فاتیمـە هاوواتـا بـوو لەگـەڵ مـژدەی شـادی، چـوون بـە گەیشـتنی ئـەو بـۆ نـاو کاروانەکـەی ڕەسـول، بـە ڕەسـولەڵڵا شـاد ببـوون...

بەرەکـە بـەردەوام بـوو لـە گێڕانـەوە: "ژنـان لەبـەر ئـەوەی بـەردەوام بەسـواری ڕێیـان دەکـرد، هێنـدەی پیـاوان لـە گەشـتکردندا مانـدوو نەدەبوون و بەتایبـەت عەلـی، لەبـەر ئـەوەی بەرپرسـیارێتییەکی گـەورەی کەوتبوویـە سـەر شـان، زۆر شـەکەت ببـوو و ئەمانەتـی ڕادەسـتی ڕەسـولەڵڵا کـرد، بـەڵام بـە هـۆی گەرمـی و تەپوتـۆزی بیابـان و بێخـەوی و گەردەلوولـی لمەکانـەوە، چاوەکانـی زۆر ئازاریـان دەدا و ئاوسـابوون و نەیدەتوانـی لەسـەر پێیەکانـی بـڕوات و نەیویسـت ڕەسـول بـەم حاڵـەوە بیبینێـت و ماوەیـەک نەچوویـە حوزوری ڕەسـول. وەختێ

ڕه‌سوله‌للا هۆکاری دیارنه‌بوونی عه‌لیی بۆ ده‌ر که‌وت، ڕۆیشت بۆ لای و چاوه میهره‌بانه‌که‌نی پڕ بوون بۆ عه‌لیی کوڕه مامی، که له‌تاو ئازاری چاو و پێیدا جێی به خۆی نه‌ده‌گرت، به ئه‌وپه‌ڕی میهره‌بانییه‌وه باوه‌شی پێدا کرد و پێیه‌کانی بۆ شێلا و له‌و ساته‌دا مژده‌ی ئاسمانی دابه‌زی:

‹ومن الناس من يشرى نفسه إبتغاء مرضات الله›

‹له‌ناو خه‌ڵکی مرۆڤی وایش هه‌یه، له‌به‌ر ڕه‌زای خوای گه‌وره گیانی خۆی ده‌به‌خشێ.› بقرة/٢٠٧

ده‌سته شیفابه‌خشه‌کانی ڕه‌سول شیفای به‌خشی به عه‌لی و له ماوه‌یه‌کی که‌مدا باش بوو و که‌وته‌وه سه‌ر پێ. له‌و سات و به‌نده‌دا یه‌که‌م مزگه‌وتی موسڵمانان له قوبه دروست کرا و پاش ئه‌وه‌ی کۆتا قافڵه، که خانه‌وه‌ده‌ی ڕه‌سول بوو، گه‌یشتین، به‌یه‌که‌وه به‌ره‌و یه‌سریب کۆچمان کرد و جۆشوخرۆش و خۆشی تێکه‌ڵ به‌یه‌ک بوون و خه‌ڵکی مه‌دینه، که چه‌ندین ڕۆژ بوو چاو له‌سه‌ر ڕێ چاوه‌ڕێی گه‌یشتنی ڕه‌سول و ئیمانداران بوون، ده‌مه‌ونیوه‌ڕۆیه‌ک به هه‌واڵی گه‌یشتنی قافڵه‌که ڕاچڵه‌کین و یه‌هودییه‌ک به شاره‌که‌دا ڕای ده‌کرد و دووپاتی ده‌کرده‌وه: 'موحه‌ممه‌د گه‌یشت.' 'موحه‌ممه‌د گه‌یشت!' و پشتیوانان به‌جۆشوخرۆشه‌وه و به‌ده‌م سرودی ته‌ڵه‌ع البدرو عه‌له‌ینا به‌خێرهاتنیان کرد:

طلع البدر علينا

من ثنيات الوداع

وجب الشكر علينا

ما دعـــا لله داع

ئەستەمە هیچ وشە و قەڵەمێک بتوابێت باسی ئەو ساتە بکات، تۆفانێکی نەبینراوی خۆشەویستی و قەرەباڵغییەکی زۆر بەرەو ڕووی دەڕۆیشتن و گەنج و پیر و منداڵ و نەخۆش و بارگران و بێکەسان و نەداران و زەنگینەکانیش هەمووان بەرەوپیری دەهاتن، دەستەدەستە بەدەم سرود و هۆنراوە و دەفەوە بەرەوپیری دەهاتن... ڕەحمەتێکی جیاواز داباری بەسەر یەسریبدا، ئاوازێکی نەبیستراو بڵاو بوویەوە بە ئاسماناکەیدا، ئینسان و فریشتەگەل لە هەمان کاتدا و بە هەمان نەغمە و ئاواز هەمان هۆنراوەیان دەچڕی. هیچکەس نەیدەزانی کێ نووسیویەتی، کێ چڕیویەتی، کێ ئاوازی بۆ داناوە و هەمووان بەیەکەوە دەیانگوتەوە:

طلع البدر علينا<br>
من ثنيات الوداع<br>
وجب الشكر علينا<br>
ما دعـــا لله داع

ئەو ڕۆژە زانیمان شەرت نییە ئینسان هەر لە دڵتەنگیدا بگری، دەکرێت لە ترۆپکی شادیدا فرمێسک بڕژێت، لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا کە ڕەسولەڵڵا دەینا، خەڵکی یەسریب زیاتر فێنکایی دەهات بە دڵیاندا. کۆچبەران لە مەقامی نازدا بوون، لە مەقامی عەشقدا، ماڵ و حاڵ و سەروەت و سامانیان جێ هێشتبوو و هەموویان کردبوو بە قوربانی 'با بڕۆین'ێک!

پشتیوانان لە ڕەسول کۆ بوبوونەوە هەرکەس لەلای خۆیەوە بانگهێشتی دەکرد:

‹بفەرموون بۆ ماڵی ئێمە!›
‹گیانمان فیدای ڕێبازەکەت، یا ڕەسولی خوا.›
‹ببە بە میوانی ئێمە و شەرەف ببەخشە بە خانەکەمان.›
‹بەخێر بێیت یا حبیب الله.›
‹خۆشمان دەوێیت یا خیر خلق الله.›

زەردەخەنەیەکی وەک خۆر فراوان لەسەر ڕووی ڕەسول بوو: ‹سوێند بە خودا منیش ئێوەم خۆش دەوێت.›

پێغەمبەری میهرەبانی نەیدەویست دڵی کەس بشکێنێت، نەیدەویست تیشکی نێو چاوی کەس بکوژێنێتەوە، فەرمووی: ‹حوشترەکە ئازاد بکەن، بزانین بۆ کوێ دەچێت، ئەو بەپێی فەرمان دەجووڵێت.›

هەموو ئەو خەڵکەی کە لە خۆشییاندا خەریک بوو دڵیان دەفڕی، بەجۆشەوە پێشوازییان لە ئەو پێغەمبەرە دەکرد کە چەندین سەدە بوو کەون چاوەڕێی هاتنی بوو و چاوەڕێ بوون بزانن حوشترەکەی بەرەو ماڵی کامە بەختیار دەچێت...»

## ڕۆژی بیستوپێنجەمینی چاوەڕوانیی عەلی

## فاتیمەی شادیهێن!

خەڵکی وەک دێوانە بەسەر ڕێگەکاندا ڕژابوون و بە گریان و پێکەنین و سرودوتنەوە شوێن هەڵبژێردراوی جیهان کەوتبوون و قەسوەی حوشتری ڕەسول بە هەنگاوی نەرم و سەنگین ڕێی دەکرد، تاکوو لە کۆتاییدا لە زەوییەکی فراوانی تەنیشتماڵی ئەبو ئەیوبی ئەنساریدا لەسەر هەرچوار پێ چۆکی دادا، ئای لە حاڵی ئەبو ئەیوب و هاوسەری لەو ساتەدا! دەگریان، سوپاسی خودایان دەکرد، دەگریان... ڕەسول لە حوشترەکەی دابەزی و دواتریش فاتیمە و ئەوانی دی، ئوموئەیوب لە سوپاسگوزاریدا هەڵدەلەرزی، ماڵە سادە و خاکییەکەی ڕەسول لەویادا دروست دەکرا، لە پەلکی خورما و بەرد و دار...

ئای لە میوانداریکردنی خەڵکی مەدینە، لە کەلوپەل و ماڵ و وشکە و خواردن و لە دەرزییەک تا تاڵی ئاوریشم هەرچییان هەبوو بەشیان کرد لەگەڵ ئەو کۆچبەرانەی لە "گیان و ئیمان" زیاتر هیچیان پێ نەبوو... دەیانبەخشی و

زیادی دەکرد، دەیانبەخشی و دەهاتەوە جێی... دەیانبەخشی و کەم زۆر دەبوو... دەیانبەخشی و ئەوەی نەیانبوو، دەیانبوو... دەیانبەخشی و موحیببەت و خۆشەویستی و برایەتی و نێوانیان زیادی دەکرد و یەسریب ئیدی ماڵی خۆشبەختی بوو...

## ڕۆژی بیستوپێنجەمینی چاوەڕوانیی عەلی

## زمانی بێدەنگی پڕا...

بە نزیکی ٢٥ ڕۆژ بوو گەشتی گەیشتن بە فاتیمە دەستی پێ کردبوو، پەلکەزێڕینەیەکی ڕەنگاوڕەنگ ئاسمانی ژیانی عەلیی ڕازندبوویەوە، سوپاسگوزارییەکەی بەردەوام و بەرخۆدانەکەی ئارام بوو، بەڵام بڵێی ڕۆژی ویساڵ کەی بێت! لێی دیار نەبوو...

شەو و ڕۆژەکان تێدەپەڕین و باسی کاتی زەماوەند لەئارادا نەبوو و ئەمەش چاوەڕوانییەکەی دوو ئەوەندە قورس کردبوو. چ بەختێ بوو بوون بە هاودەمی سەروەری عالەم! بوون بە نزیکترین کەسی کچەکەی... کەی دەگەیشت بە ئەو ئارەزووە گەورەیە! دەیویست بپرسێ و لە شەرمدا نەیدەتوانی و دەیویست نەپرسێ و لە مەراقدا نەیدەتوانی! پێی وا بوو ڕەسولەڵڵا چاوەڕێی فەرمانی خودایە لەبارەی ڕۆژی زەماوەندەوە پێی بگات، هەر بۆیە ئەوەندەی دی دەست و پێی بەسترابوو و نەیدەتوانی هیچ بکات. لە لایەکی دیکەشەوە پیاوانی پشتیوانان میوانداریی کۆچبەرانیان دەکرد و داوایان لێ

دەکردن باسی ئەو شێرە بکەن کە ماندوونەناسانە پێغەمبەر دەپارێزێ و ئەمێستا بێ دوودڵی کچەکەی خۆی پێ دەدات. موسعەب دەستی بە قسە کرد: "عەلی بەردەوام لە خزمەتی ڕەسولدایە بە گیان و ئیمان و ماڵ و موڵکیەوە و گەر پەردەی نێوان دونیا و قیامەت لا ببرێت و فریشتە و جن و بەهەشت و جەهەنەم نیشان بدرێن، زەرەیەک لە ئیمانی عەلی نە کەم دەکات، نە زیاد. دەتوانێت بە وشەی کەم زۆر دەر ببڕێت و پێی وایە زمان تەرازووی سەنگینیی مرۆڤە و ئەوەندەی لغاوەکەی شل کرا، ئیدی بەرەڵا دەبێت و بە ڕاست و چەپدا ئازاری چواردەور دەدات و دەڵێت زۆر خوێن هەیە زمان دەیڕێژێت، نەک شمشێر!"

یەک لە پشتیوانان وەڵامی دایەوە، "ئای کە وتەیەکی جوانە! بەڵای زمان گەلێ سەختە!" موسعەب بەردەوام بوو: "یەکێک لە یاسا و گوتەکانی دیکەی عەلی ئەوەیە کە دەڵێت، 'بۆ ئەوەی ئازاردەرەکەت شەرمەزار بکەیت، نەرمونیان بە لەگەڵیدا، تووڕەیی نزمی و بێدەنگی بەرزییە بۆ ئینسان. مرۆڤی ئیماندار ڕوخساری پڕ خەندە و دڵی پڕ خەمە.›"

هەمووان بەسەرسوورمانەوە گوێیان گرتبوو: "ئای لەم وتە بەرزانە!"

کۆچبەرێکی گەنج هاتە دەنگ: "دەریای زانستی عەلی فراوانە و دەفەرمووێت، 'گەورەترین دوژمنی مرۆڤ تووڕەیی و حەزەکانیەتی و مرۆڤی بەخیل هەرگیز ئارامی ناچەژێ و زۆر دەوڵەمەند هەیە لە هەژار هەژارترە و زۆر سەرگەورە هەیە

لە نزمترینەکان نزمترە و زۆر هەژار هەیە لە زەنگینترینەکان زەنگینترە. برسێتی گەلێ لە سەردانەواندن باشترە'« بەم جۆرە دانیشتووانی یەسریب بەدەوری کۆچبەراندا کۆ دەبوونەوە و خۆشەویست و خۆشەویستانی خۆشەویستیان زیاتر دەناسی و بایەخی قسە لەلایان گران و وانەکانی نێو وەحی لە هەموو شت لایان پیرۆزتر بوو.



## عەلی بانگ دەکرێتە حزور

**«فاتیمە! کچم تۆ ببە بە جارییە بۆ عەلی،**
**تا ئەویش ببێت بە کۆیلە بۆ تۆ!»**
**حەزرەتی ڕەسول**

خورماکان ڕۆژبەڕۆژ ڕەنگیان تۆختر دەبوو و زیاتر پێدەگەیشتن و شیرینتر دەبوون و هێشتا کات و ساتی زەماوەند دیار نەبوو. چاوەڕوانی و ناڕوونی لە هەموو شتێک سەختتر و وەختێ چاوەڕوانکراو حۆرییەک بوو لە بەرگی مرۆڤدا، تاقیکردنەوەکە گەلێ سەختتر بوو...

وەرزی کۆکردنەوە و مشتاقکردن و وشککردنەوەی خورما و چاوەڕوانیی گەڕانەوە و بەڕێکردنی کاروان و گەڕانەوە و ڕۆشتن بەرەو سەفەر و پێشوازیکردن و ماڵئاواییکردن لە وەفدەکان بوو. لەنێو هەموو ئەمانەشدا پێغەمبەر سەنتەر بوو و عەلی سەرقاڵی ڕەسول و سات و وتە و هاتوچۆکانی بوو. تاکە وشەیەکی لەمەڕ زەماوەند لێ نەدەبیسترا و ئەو ناڕوونییە دووروودرێژەش خەریک بوو شەکەتی دەکرد. لە هەمان کاتدا بنەماڵەی ئەبوتالیبیش لە چاوەڕوانیدا بوون و فاتیمەی دایکی عەلی و خوشکەکانی و براکانی هەمووان چاوەڕێی مژدەی

زەماوەند بوون و لەبەر ڕێزی زۆریان بۆ ڕەسول، هیچیان نەدەگوت، بەڵام عەقیلی برا گەورەی عەلی، کە لەدوای مردنی ئەبوتالیبی باوکیان بەرپرسیار بوو لە خوشک و براکانی، لەوە زیاتر خۆی بۆ نەگیرا و ڕۆژێک بە عەلیی گوت: "ئەی عەلیی حەیدەرم! لە بیرم نییە هیچ ڕۆژێک ئەوەندەی ئەو ڕۆژەی فاتیمەت لێ مارە کرا خۆشبەخت بووبم، بەڵام خۆزگە دەمزانی زەماوەندەکەتان کەییە! خۆزگە ئەو ڕۆژەم دەدی، ئیدی بشمردمایە بەختیار دەمردم." عەلی سەری سووڕ ما لە قسەکانی براکەی و عەقیل بەردەوام بوو: "تا کەی چاوەڕێ دەکەیت! ئەم چاوەڕوانییە کەی کۆتایی دێت؟ با دایکیشم ببەین و بچین بپرسین، بئافخێین، ڕەنگە کەمترخەمیمان لە شتێکدا کردبێ! یاخود کارێک هەبێ و ئەنجاممان نەدابێت!" عەلی وەڵامی ئەم قسە چاوەڕواننەکراوەی دایەوە: "ڕاست دەڵێیت، بەڵام شەرم دەکەم پرسیاری لەو جۆرە لە ڕەسول بکەم و کارێکیش نییە بە دایکم چارەسەر بکرێت." بێدەنگییەکی دووردرێژ باڵی بەسەردا کێشان و عەقیل بە هەمان جۆشوخرۆش و تاسەوە گوتی: "هەستە! هەستە، شەرم مەکە و برۆ بۆ لای ڕەسول، بچۆ خۆت لێی بپرسە، لە ئێمە زیاتری خۆش دەوێیت، دڵنیا بە دڵت ناشکێنێت." عەلی، گەرچی دەریایەک لە تاسە و شەوق لە دڵیدا جۆشی دەدا، وەڵامی دایەوە: "با چاوەڕێ بکەین، شەرم دەکەم بۆ ئەو پرسیارە بچمە حزوری ڕەسول."

عەقیل ڕەتی کردەوە: "نابێت! هەستە دەی، بەیەکەوە دەچین مادەم وایە! با بزانین ئەم کارە بەرەو کوێ دەچێت."

عەلی، گەرچی زۆر شەرمی دەکرد، قسەی براکەی پێ نەشکا و هەستایە سەر پێ و لەو ساتەدا دایکیان هات و بارودۆخەکەیان بۆ ئەویش باس کرد و بێ ئەوەی کات بەفیڕۆ بدەن، سێبەسێ لە ماڵ دەر چوون.

تیشکی ئاڵتوونیی ئێوارە بەسەر یەسریبدا ڕژابوو، تیشکی فتیلە و چرای تاکوتەرا داگیرساوی ماڵەکان بەرچاو دەکەوتن. لە کاتێکدا خەڵکی بەرەو ماڵەکانیان دەڕۆشتنەوە، ئەوان بەتەنیشت فرۆشیاری عەترەکان و ژنانی گیافرۆش و منداڵاندا بەرەو ماڵی خۆشەویست دەڕۆیشتن. لە کۆتاییدا گەیشتنە بەردەرگای ڕەسول و کەمێکی مابوو عەلی لە شەرمدا بگەڕێتەوە، بەڵام عەقیل دەستبەجێ پێشی کەوت و لە دەرگای دا، پاش کەمێک چاوەڕوانی، بەرەکە دەرگای لێ کردنەوە و گوتی: "خێر بێ ئینشاللە بەم کاتە!"

عەقیل وەڵامی دایەوە: "دەمانەوێت ڕەسولەڵلا ببینین بە مەبەستی زانینی وەختی زەماوەند."

بەرەکەی بەتەمەن وەڵامی دانەوە: "کوڕی خۆم، ئێستا کاتێکی گونجاو نییە بۆ ئەو کارە، ئەو بابەتانە کاری ئێمەی خانمانە. کەمێک کاتم بدەنێ، پێغەمبەر ئەمشەو لە ژوورەکەی عائیشەیە و خانمان هەموویان لەوێ کۆ دەکەمەوە و بابەتەکە لەگەڵ ڕەسولدا دەکەمەوە و ئاگادارتان دەکەمەوە لە وەڵامەکەی، گونجاو نییە ئێوە بە ئەم کارە هەستن!"

لەنێو چرچەکانی ڕوخساری بەرەکەدا هێندە ئەزموون و

دونیادیدەیی دەبینرا، دەستبەجێ عەلی سوکنایی هات و لەسەر قسەی ئوموئەیمەنی ناسراو بە بەرەکە گەڕانەوە و دواتر ئوموئەیمەن پێش ئەوەی بچێتە حزووری ڕەسول، بابەتەکەی لەگەڵ هاوسەرانیدا تاوتوێ کرد و ئوموسەلمەیان کرد بە نوێنەر و پاش ئیزنوەرگرتن، چوونە ژوورەکەی عائیشە و یەک-یەک سڵاویان لە ئازیز کرد و ئوموسەلەمە بەوپەڕی نەزاکەت و شکۆوە باباتەکەی کردەوە: "یا رسول الله! گەر خاتوو خەدیجەی شاژنمان لە ژیاندا بووایە، ئەم کارە نەدەکەوتە ئەستۆی ئێمە و وەک گشت کارێکی دیکە دەستوبرد خۆی چارەسەری دەکرد، بەڵام دەڵێی چی حوکمی قەدەرە و ملمان لە دەزوو باریکترە لە ئاستیدا." لەگەڵ بیستنی ناوی خەدیجەدا، ڕەسول چاوەکانی پڕ بوون و فەرمووی: "گەر ئەو لە ژیاندا بایە..." دڵۆپێک ئەشک بە گۆنایدا هاتە خوار و خەمێکی چڕ ژوورەکەی گرتەوە و ئوموسەلەمە بەردەوام بوو: "جەنابی حەق لە بەهەشتدا بە یەکدیمان شاد بکاتەوە... ئێستا فاتیمەی جگەرگۆشەی ئەمانەتی ئێمەیە و دەمانەوێت بزانینن کەی بە گونجاو دەزانن بۆ زەماوەندەکەی! عەلی باسەکەی لەگەڵ ئوموئەیمەندا کردووەتەوە و ئەویش گوتوویەتی من دەپرسم و وەڵامتان دەدەمەوە، جا چی دەڵێت دەربارەی بەیەکگەیشتنی ئەم دوو مرواریيە؟"

ڕەسول وەڵامی دایەوە: "عەلی هیچکات باسی لەو جۆرەی لەگەڵ مندا نەکردووەتەوە!"

"یـا رسـول اللـه! خۆتـان دەزانـن عەلـی چەنـد بەڕەوشـتە! زۆر شـەرم لـە جەنابتـان دەکات و ڕووی نایـەت پرسـیاری لـەو جۆرەتـان لـێ بـکات."

"دەی کەواتە عەلیم بۆ بانگ بکەن."

بڕیـار درا عەلـی بێتـە حزور و خـۆی بابەتەکە لەگەڵ ڕەسـول تاوتـوێ بکات و هاوسـەرانی پێغەمبـەر بـە هیـوای شـەوێکی شـاد ماڵئاواییـان لـە ڕەسـول کـرد...



# بەشی سێیەم

## مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ

خاوەن ڕۆژی لێپرسینەوەیە

الفاتحه/٤

## تەها: موحەممەدی موستافا

«گوایە نیەتم نووسینی جەماڵی تۆیە!
تواناکانم سنووردارن! ببەخشە ئەی دوڕی زەمانە...»
نەجاتی

مانگی جۆزەردانی ساڵی ٦٢٤ بوو. لەگەڵ نەفەسی هەوای فێنکی بەرەبەیاندا ئوموئەیمەن هەواڵی بۆ عەلی نارد: "ڕەسولەڵلا چاوەڕێتە، بەپەلە وەرە حزوری."

عەلی بەپەلە خۆی و ئەدەب وحەیای کۆ کردەوە و بەرەو ماڵی خۆشەویست بەڕێ کەوت. کە گەیشتە جێ، دیسان نەیدەتوانی تەماشای ڕەسول بکات! دیسان ئەو حاڵەی بەسەردا هاتبوو، کە هیچی لەگەڵدا پێ نەدەگوترا و ڕەسولەڵلا هەستی بەم حاڵەی عەلی کرد و فەرمووی: "ئەی عەلی! ئارەزوو دەکەیت زەماوەندەکەتان بکەن؟" عەلی بەشەرمەوە وەڵامی دایەوە: "بەڵێ یا رسول الله! چاوەڕێی فەرمانی ئێوەم!"

ئەم وەڵامە خۆشەویستی خۆشحاڵ کرد: "زۆر چاکە! ئینشاالله ئارەزووەکەت بەجێ دەگەیەنین، ماڵێک بگرە و ئامادەکارییەکانی ئێوارەخوانێک دەست پێ بکە بۆ ڕۆژی زەماوەند."

عەلی ئەو لەحزەیە تێگەیشت خۆشەویست بۆچی لە چاوەڕوانیدا هێشتوویەتیەوە. پێغەمبەری خۆشەویستی هەستی کردبوو بڕیاری هاوسەرگیرییەکە لەپڕ و بەپەلە بووە و چاوەڕێی کردبوو عەلی زیاتر ئامادەی ئەو پرۆسەیە بێت و دونیای ڕۆحی عەلی و فاتیمەش ئامادەی ئەو گۆڕانکارییە بکات و هەردووک سەنگین و پێگەیشتوو و تێگەیشتووتر بن و بگەنە جێیەک ئارەزووی بەیەکگەیشتنی یەکدی بکەن. وەختێ ئارەزوویەک لە ڕۆحدا گەورە دەبوو، دەگەیشت بە کەماڵ و زمان داوای بەجێگەیاندنی ئەو ئارەزووەی دەکرد. لەپێناو کەماڵی ڕۆحی هەردووکیاندا بوو ئەم چاوەڕوانییە، مرۆڤ لە هەر بوارێکی دیکەدا پێنەگەیشتوو و کاڵ بێت، شەرتە بۆ هاوسەرگیری ڕۆحی بپیشێت و پێبگات. عەلی سەرکەوتووانە گەیشتبوو بە ئەو قۆناغە و تێگەیشتبوو کە مەرجی سەرەکیی هاوسەرگیری عەشق و شەوقە! لەگەڵ زیادبوونی ئارەزوو و حەسرەتدا، هەویری موحیببەت هەڵدێت و دەبێتە سەرەتای هاوسەرگیرییەکی خۆش و نەرم. ئەو چاوەڕوانییە بوو بە هۆی ئەوەی عەلی زیاتر هاوسەری بناسێت و هەر لە ئێستاوە بیری بکات و زیاتر مەیلی لێی بێت و زیاتر خۆشی بوێت. کەواتە خۆشەویستی لەنێو دائیرەی حەلاڵدا بەم جۆرە بوو! گەڕان... چاوەڕوانی... پێنەگەیشتن... ناسین... شەرمکردن و... زۆرخۆشویستن... نهێنیی بابەتەکە لەوێدا حەشار درابوو و عەلی مانگێک لەنێو ئەو نهێنییەدا ژیابوو. لە کاتێکدا عەلی لەم بیرکردنەوانەدا بوو، پێغەمبەری ئازیز هەنگاوەکانی

داهاتووی بە عەلی گوت و کەمێک لە ئەو پارەیەی دابووی بە ئوموسەلەمەی هاوسەری، داوای کرد و دای بە زاواکەی و فەرمووی: "کە وا بێ، نەختێ خورما و کەمێک کەرێ و برێک ماست بکرە و وەرەوە."

ئەم ڕستەیەی کۆتایی بە مانای ئەوە دەهات: "تەواو ئەی عەلی! دەست بە ئامادەکارییەکانی زەماوەند بکە." عەلی پڕ بوو لە شەوق و خۆشبەختی، نائارامی و چاوەڕوانی کۆتایی هات. ئیزنی لە ڕەسول وەر گرت و بەرەو بازاڕی مەدینە بۆ کڕینی پێداویستییەکان بەڕێ کەوت. بە عەشق و شەوق و جۆشەوە ڕۆیشت پارەی زەماوەند ئامادە بکات، بەڵام بۆی دەر کەوت کە لە زرێپۆشەکەی سنگی زیاتر هیچی دیکەی نییە پارە بکات! عەلی لەگەڵ ئەوەی گەنجێکی زرت و زیرەک و بەتوانا بوو و دەیتوانی ببێت بە یەکێک لە بازرگانە ناودارەکان، بەڵام تا ئەو تەمەنەی، تاکە کاری پاراستنی پێغەمبەری خودا و خزمەتی دینەکەی بوو. عەلی بەردی بگوشییایە، ئاو و خەڵووزی بگرتایە بە دەستیەوە، ئەڵماس و تەماشایەکی خۆڵی بکردایە، دەبوو بە ئاڵتوون، لەگەڵ ئەوەشدا چاوی لەسەر هیچ هەبوویەکی دونیا نەبوو. دونیا وەک کیژۆڵەیەکی ناسک ئامێزی بۆ کردبوویەوە و عەلی فریوی پێ نەخواردبوو. ڕەنگە گەر مردن بکوژرایە و دونیا هەتاهەتایی بووایە، عەلی هەوڵێکی بۆ بدایە، بەڵام ئەوەی تا ئەو ڕۆژە دیبووی، گەورەترینی بازرگانان و پادشایان لە فرمێسک و خوێن و ڕق زیاتر، هیچیان لێ جێ نەمابوو. نەیدەتوانی چاو لەئاست کۆتاییەکی ئەوەندە دیار

دابخـات، یاخـود ئاسـۆی وابەسـتەی هیچێکـی ئەوەنـدە گـەورە بـکات، یاخـود ڕێ بـدات دڵێـک کـە پـڕ بـووە لـە عەشـقی ئـەو، مەیلـی شـتانێکی دیکـە بـکات، لەمێـژە خـۆری لەئامێـز گرتبـوو، نەیدەتوانـی بگەڕێتـەوە ئامێـزی تاریکیـی شـەو...

عەلـی بـە عەشـق و شـەوق و زرێپۆشـەکەیەوە، کـە وەسـتایەکی کارامەی یەهودی دروستی کردبوو و بە زارێکی پڕ سوپاسگوزاری و دڵێکی پڕ فاتیمـەوە بـە بازاڕدا دەڕۆیشـت. لـە کۆتاییدا چووەیـە نێـو دوکانـی زرێفرۆشـێکی کارامـە و ڕێـک کەوتـن لەسـەر ئـەوەی دوکانـدار تـا کۆتایـی ڕۆژ زرێکـە بفرۆشـێت و پارەکـەی ڕادەسـتی عەلـی بکات.

عەلـی بـەدەم هیلاکییەکـی شـیرینەوە بـەرەو ماڵەوە دەڕۆیشـت و لەنـاکاو گوێـی لـە دەنگێـک بـوو لـە پشـتیەوە بانگـی دەکـرد: "عەلـی! ئـەی عەلـی!"

ئاوڕی دایەوە و تەماشای کرد عوسمانی زاوای پێغەمبەرە، بەڵام ئـەوە سـەیر نەبوو، سـەیر لـەوەدا بـوو زرێکـەی عەلیی بە دەسـتەوە بـوو کـە کەمێک لەوەوبـەر ڕادەسـتی فرۆشـیارەکەی کردبوو. عەلی بەسـەرسـووڕمانەوە سـڵاوی لـە عوسـمان کـرد و عوسـمان گوتـی: "ئـەی عەلـی، ئـەم زرێپۆشـە یادگارییەکـی قەدیـم و بەشـێک نەبوو لە ئـەو غەنیمەتـەی لـە جەنگـی بـەدردا بـەر تـۆ کـەوت؟"

"بەڵێ، خۆیەتی!"

"دەی کە وا بێ، بۆ دەیفرۆشیت؟"

عەلـی بەزەردەخەنـەوە وەڵامـی دایـەوە: "مارەیـی فاتیمەیـە، من لای فرۆشـیارێک جێـم هێشـت، چـی دەکات بـە دەسـتی تـۆوە؟"

عوسمانی زاوای ڕه‌سول ده‌ستێكی خسته سه‌ر شانی عه‌لی: "دڵم به‌رگه‌ی نه‌گرت ئه‌ی عه‌لی! تۆیه‌ک كه به پۆشینی ئه‌و زرێییه ترس ده‌خه‌یته دڵی دوژمن و شادی ده‌خه‌یته دڵی دۆست، چۆن ده‌بێت له‌ده‌ستی بده‌یت! ئه‌و زرێیه له تۆ زیاتر له كه‌س نایه‌ت ئه‌ی عه‌لی! كه له ئه‌و دوكانه بینیم، به‌رگه‌م نه‌گرت و من كڕیم و ئه‌وه‌ش پاره‌كه‌یه‌تی، ٤٨٠ درهه‌م."

عه‌لی زۆری پێ خۆش بوو كه زرێی یادگاریی به‌در كه‌وتووه‌ته ده‌ستی عوسمان و گوتی: "زۆر له تۆش هاتووه ئه‌ی عوسمان! بۆ خێر به‌كاری بهێنیت."

"ئه‌رێ... به‌ڵام له من زیاتر له تۆ دێت ئه‌ی عه‌لی! تكایه وه‌ک دیاری هاوسه‌رگیری لێم قبوڵ بكه."

عه‌لی زۆر سه‌ری سووڕ ما و چاوانی پڕ بوون و نه‌یده‌زانی چی بڵێت! چه‌نده دیارییه‌كی مانادار و هه‌ڵوێستێكی ناسک بوو عوسمان ئه‌نجامی دا! عه‌لی له سوپاس زیاتر هیچی دیی شک نه‌برد پێی بڵێ و دیسان ڕێی بازاڕی گرت، به‌ڵام ئه‌م جار بۆ كڕینی پێداویستییه‌كان به ئه‌و پاره‌یه‌ی له فرۆشتنی زرێكه‌ی ده‌ستی كه‌وتبوو. بڵێی هه‌بێت دینێكی دیكه هاوكاری و خۆشه‌ویستی و تێگه‌یشتنی هاوه‌ڵان بۆ یه‌كتر هێنده زۆر بێت؟ به‌ده‌م شتكڕینه‌وه بیری له برایه‌تیی نێوانیان ده‌كرده‌وه و وه‌ختێ خورما و هه‌نگوین و كه‌رێكه‌ی برد بۆ مزگه‌وت، ڕه‌سولی بینی و ده‌ستبه‌جێ سڵاوی لێ كرد و بۆی باس كرد چی ڕووی داوه و خۆشه‌ویست زۆر خۆشحاڵ بوو به ئه‌و موحیببه‌ت و برایه‌تی و هاوكارییه‌ی عوسمان، ده‌سته‌كانی به‌ره‌و

ئاسمان بەرز کردەوە و فەرمووی: "عوسمان لە بەهەشتدا، دۆستی گیانیبەگیانیی منە!" نزای زۆری بۆ ئەو کەڵەپیاوە کرد کە سەروەت و سامانی هەمیشە لە زیادبووندا بێت. دواتر بیلالی بانگ کرد، بیلالێک کە هێندە هەستناسک و وریا و هەستیار بوو، شایانی ئەوە بوو ئەرکی هەڵبژاردنی بۆن و بوغوردی زەماوەندی کچی ڕەسولی پێ بسپێریت... ڕەسول برێک لە ئەو پارەیەی عەلی هێنابووی، خستیە دەست بیلال و فەرمووی: "بچۆ بۆن و عەتری خۆش بۆ زەماوەندەکەی فاتیمە بکڕە."

بیلال کەوتە نێو بێدەنگییەکی سەیرەوە، پارەکەی وەر گرت و نە دەیزانی چی بکات، نە هیچی بۆ گوترا و تەنها بە چاوی پڕەوە تەماشای ڕەسولی دەکرد، پێغەمبەری خۆشەویست بەشەکەی دیکەی پارەکەی دایە دەست ئەبوبەکر و فەرمووی: "ئەی ئەبوبەکر! ئامادەکاری بۆ زەماوەندەکەی فاتیمە بکە!"

ئەرکێکی قورس بوو، بەڵام داواکارییەکە لە جێیەکی بەرزەوە هاتبوو و قبوڵیان کرد و بیلال لەناو خۆیدا تووشی شڵەژان هاتبوو و بیری دەکردەوە: "ئەی هاوار، من لەکوێ بۆنی گونجاو بۆ کچی پێغەمبەر پەیدا بکەم، کە بۆنی میسک و عەمبەری لێ دێت! لەکوێ بۆنی دڵخوازی ئەوم دەست بکەوێت! بۆنی ئەو نە لە ڕەیحانە و گوڵەکانی مەدینە و نە لە عەتارفرۆشەکانی حەبەش و زولمەجاز و عوکاز و نە لە بۆنفرۆشەکانی شام دەست دەکەوێت، لەکوێ عەتری زەماوەندی عەلی و فاتیمەم دەست بکەوێت، کە بە بۆنی جوبریل گەورە بوون!"

حاڵی ئەبوبەکریش هیچ لە ئەو جیاواز نەبوو و بیری دەکردەوە: "خودا! من چی بکڕم بۆ ماڵێکی لەو جۆرە!" هەردووک بە دوو ئاڕاستەی جیاواز و بەدەم هەمان بیرکردنەوەوە ڕێیان دەکرد، دەبێت چ زەماوەندێک شایستەی دوو ڕۆحی پەروەردەی ناسکی دەستی ڕەسول بێت! بەڵام دەبێت دەستی بخەن، "توکلت علی الله!" سەروەری جیهان فەرمانی کردووە... بیلال بەرەو لای عەتارفرۆشەکان و ئەبوبەکر بەرەو بازاڕی کاروانچییەکان بەڕێ کەوتن، دەبووایە ئەوەی پێیان ڕاسپێردراوە، دەستی بخەن، گەڕانەوە بە دەستی بەتاڵ هەڵبژاردە نەبوو.

بیلال هێندە گەڕا، قاچەکانی ئاوسان، تا لە کۆتاییدا چووە لای مولەیکەی خانمی عەتاری ناوداری مەدینە، مولەیکە ئافرەتێک بوو، لەگەڵ باسکردنی بۆنی خۆشدا ناوی دەهاتە نێو باس و ئەو عەترانەی لای ئەو هەبوون، لە هیچ جێیەکی دیکەی مەدینەدا نەبوون. چەندین جۆر بۆنی ناوازە لەنێو دوکانە بچووکەکەیەوە بەنێو بازاڕاکەدا بڵاو دەبوویەوە. ئەو خانمەی عەتری زەماوەند و بۆنەی کیژی مەدینە نەبوو ئامادەی نەکات، ئەمێستا دۆش دامابوو! بۆنی میسکئاسای فاتیمەی بەسەردا هاتبوو و نەیدەزانی چ بۆنێک شایستەی زەماوەندەکەیەتی. وەختێ بێهیوا بوو لەوەی ئەستەمە بۆنی شایستە بە ئەو لە بۆنەکانی دوکانەکەی خۆیدا هەبێت، چوو بۆ لای ئەسمای کچی موحاریب، بەڵکوو ئێە، لای ئەو بۆنێکی بێوێنەی دەست بکەوێ، کە کوڕەکەی لە یەمەنەوە بۆی دەنارد. نا، نەبوو! لەوێش نەبوو، هیچ بۆنێک نەدەگەشت

بە بۆنی سەرمەستکەری فاتیمە، مولەیکە دواجار پەنای بردە لای قائیلەی ژنە عەترفرۆشی ناوداری مەدینە و کە لەوێش هیچی دەست نەکەوت، بێهیوا بوو و تەماشایەکی بیلالی کرد و گوتی: "لەخۆڕا خۆت ماندوو دەکەیت، لە هیچ جێیەک بۆنی شایستەی فاتیمەت دەست ناکەوێت."

ئێوارە هات وبیلال ماندوو و شەکەت و دڵگران و بێهیوا و بە هەنگاوی قورسەوە دەگەڕایەوە، پاش ماوەیەک لە ڕێگا چاوی بە پیاوێک کەوت لە خەڵکی ناوچەی ئەوان نەدەچوو و یەکەم جاری بوو ببینێت. پیاوەکە بانگی لە بیلال کرد و گوتی: "وەرە...! وەرە گیان، ئەو بۆنەی بۆی دەگەڕێیت، تەنها لای من دەست دەکەوێت."

بیلال مەست ببوو بەدیار بۆن و جوانیی ڕێبوارەکەوە و وەک بڵێی ئەو بۆنەی وێڵیەتی دۆزیبێتیەوە، زەردەخەنەیەکی کرد و لە ڕوخساری ئەم غەریبە جوانپۆش و بۆنخۆشە ورد بوویەوە، کە دوو شووشە عەمبەر و شووشەیەک میسکی دایە و بەرەو لای پێغەمبەر بەڕێ کەوت. دواتر، زۆر دواتر، بۆی دەر دەکەوت کە لە هیچ جێیەکی دی ڕێی لە ئەو بۆنە ناکەوێتەوە... پاش کەمێک ئەبوبەکریش بە هەژدە بوخچەوە گەڕایەوە و ڕیزی کردن و سادەترین و ناسکترین و بێفیزترین بوخچەی بووکێنیی بۆ کچەکەی ڕەسول ئامادە کردبوو، کە تەنها و تەنها پێک هاتبوو لە:

لێفەیەکی سەوز

کراسێکی سپیی حەوت-درهەمی

لەچکێکی گەورەی چوار-درهەمی
عەبایەکی قەدیفەی ناوچەی حەیبەر
حەسیرێکی چنراو لە چڵە خورما
دوو دۆشەکی کەتانی میسریی پڕ لە خوری
چوار پشتیی ناوچەی تائیف، کە بە لۆکەی مەککە پڕ کرابوون
عەزیزییەکی لە بەحرەین چنراو
هێلەکێکی ئارد
پێستەیەکی سپیی بەرخ بۆ نوێژکردن
پەردەیەکی چنراو لە خوریی حوشتر
دەستاڕێک
دەفرێکی قووڵ
سینییەکی تەختە
مەنجەڵێکی گەورە
دۆلکەیەکی سەوزی ئاو
سەماوەرێکی ئاو
چەند دەفر و قاپێکی لە قوڕ دروستکراو

ئێوارەی هەمان ڕۆژ هەمووان بەدەوری کەلوپەلەکانی فاتیمەدا کۆ بوونەوە و ئیدی هەموو شتێک تەواو ببوو و بێدەنگییەکی خەمئامێز باڵی بەسەر هەمووان‌دا کێشا. وەختێ بوخچەی فاتیمە کرایەوە، بەرەکە خۆی بۆ نەگیرا و دایە پرمەی گریان، زەماوەندی کچانی بێباوەڕانی مەککە و یەهودییەکانی مەدینە هاتە بەرچاوی کە چۆن لە خشڵ و زێڕ دەگیران و

دەستبەنی ئەڵماس و ملوانکەی مرواری و فەرشی ئاوریشم و سفرە و خوانی بێکەموکوورییان بۆ ساز دەکرا. بەڵام فاتیمە خەدیجەئاسا بوو، خەڵکی چی دەکەن با بیکەن و چییان دەگوت با بیڵێن، سادە دەژیا و بۆ خودا دەژیا... بوخچەکەی فاتیمە هێندە سادە بوو، بچووکترین دەماری ئیرەیی لە هیچ کەسێکدا نەجووڵاند و پێداویستییە زۆر سەرەکییەکانی ژیانی لێ دەر بچێت، هیچ پارچەیەکی دیکەی بۆ نەکرابوو و بەرەکە لە وسوچێکدا دانیشتبوو و دەلاوایە و دەیگوت: "ئاااه، ئەگەر خەدیجە لە ژیاندا دەبوو، کچەکەی ئاوا بەڕێ دەکرد!"

ئوموسەلەمە وەڵامی دایەوە: "دڵنیا بە وای دەکرد! مەگەر ئەویش هەرچیی ماڵ و موڵکیەتی فیدای گیانی ڕەسولی نەکرد؟ لە کاتی دەوڵەمەندییشدا هەرگیز حەزی بە خۆدەرخستن نەبووە، دڵنیا بە ڕازی دەبوو بەم بوخچە سادەیەی کچەکەی، چی هەیە لە ڕەوشتی جوان بەرزتر کچ لەگەڵ خۆی ببات بۆ ماڵەکەی؟"

بەرەکە داچڵەکی، ڕاستە، مەگەر چی هەیە لە ڕەوشتی بەرز مانادارتر! بوخچەکەی فاتیمە لە ئاوریشمی ڕەوشتی جوانی پێچرابوو. بوخچەی فاتیمەش وەک خەدیجەی گەورەبازرگانی دایکی پاکیزەیی و ڕەوشتبەرزی بوو، بەڵام کێ چۆن لە فاتیمەی دوور لە فیز و سادە و خاکی تێدەگات! بۆ مەگەر پێغەمبەر خۆی نەیفەرمووبوو: "ئەگەر دونیا لە چاوی خودادا هێندەی باڵی مێشێک بایەخی هەبووایە، نەیدەهێشت بێباوەڕان قومێک ئاویش بخۆنەوە!" ئەی مەگەر فاتیمە کچی

ئەو پێغەمبەرە نەبوو! دەیزانی خودا زیادەڕوانی خۆش ناوێت، دەیزانی مرۆڤ نابێت دڵی بە ماڵوموڵک و زێڕ و زیو شەکەت و پەرێشان بکات، دەیزانی نابێت دڵ بداتە دەست هەبووی لەناوچوو! ئەوانی دی بۆیە مەستی ژیانێکی شائاسا بوون، لە حەقیقەت بێئاگا بوون و ببوونە دیلی دەستی نەفس... بەڵام فاتیمە نا... ئەو ئاگا بوو...

سەروەری جیهان تەماشای کچەکەی دەکرد و هۆن-هۆن فرمێسک لە هەردوو چاوی دەهاتە خوار و نزا لە لێواکانی وەک مرواری دەکەوتنە خوار:

"ئەی اللەی گەورە، بەرەکەت و چاکە بڕژێنی بەسەر ژیانی ئەم دوو بەندەیەتدا، کە باشترین دەفری ماڵەکەیان لە قوڕ دروست کراوە!"

"خودایە، کەلوپەل و ماڵی ئەم بەندانەت بەرەکەتدار بکەیت کە خۆیان لە ئیسراف و زیادەڕەوی پاراستووە."

ماڵەکەی کچی سەرکردەی ئیسلام سادەترین ماڵ بوو مەدینە دیبێتی...

فاتیمە دەرزی و دەزوویەکی بە دەستەوە بوو، کراسێکی سپیی کەتانی میسری دەدووری و وەختێ سەری بەرز کردەوە، تەماشای کرد باوکی بەرامبەری وەستاوە و فرمێسک دەڕێژێت، فاتیمە سەری سووڕ ما! دەستبەجێ لە جێی خۆی بەرز بوویەوە و دەستی باوکی ماچ کرد و پرسیی: "چی بووە؟ چیتە بابە گیانم!"

"خۆزگە خەدیجە لە ژیاندا بایە... هاوکاریی بکردیتایە... ئەم ڕۆژانەی بدیبایە..." ئوموئەیمەنیش لەولاوە بەردەوام

دەلاوایەوە و خەفەتی ئەوەی دەخوارد کە فاتیمە بە جۆرێک بەڕێ ناکەن لایەق بە ئەو بێت و دەیگوت: "کەی بووە کچانی عەرەب بێ ئاڵتوون و زیو بەڕێ بکرێن! دەبێت بووک کە ڕۆیشت، ئاڵتوون و مرواری و درهەمی بەسەردا برژێنرێت، بادەم و لوقم ببەخشرێتەوە، نە بادەمێ هەیە بیبەخشین، نە ئاڵتوونێ پێوەی بکەین..."

لوقم و بادەم بەهانە بوو، دەردی ئومولئەیمەن ڕۆشتنی فاتیمە بوو! ئەگین چاک دەیزانی گەر ڕەسول بیەوێت، خودا خاک و خۆڵی مەدینەی دەکرد بە ئاڵتوون و دڕکی دەکردە یاقووت، بەڵام خەمی ئەو خەمی جودایی و دووری بوو...

بیلال لە سووچێکی مزگەوت بەدەم تەکبیرەوە شەربەتی هەنگوینی دروست دەکرد، هەنگوین و ئاوی زەمزەم و ئاوی گوڵ و نزای خێری تێکەڵ بەیەک دەکرد و ڕای دەوەشاند. شاری نور و موحیببەتی موحەمەدی هاوسەرگیرییان دەکرد... لەوەبەدوا زانستی عەلی تەنها لەنێو دڵی فاتیمەدا سوکنایی دەهات، تەنها فاتیمە دەیتوانی ببێتە بەندەری دەریای عەلی، تەنها عەلی دەیتوانی لە ئاسۆی فاتیمە حاڵی بێت، تەنها عەلی دەیتوانی دڵی فەتح بکات، تەنها عەلی لە فاتیمە تێدەگەیشت، تەنها عەلی دەگەیشت بە گوڵزاری دەروونی فاتیمە، هەر بۆیە تەنها عەلی لەئاست فاتیمەدا بوو، خۆشبەختییەکی شیرینماڵەکەی نەبیی داپۆشیبوو.

عەلی و فاتیمە هاوسەرگیری دەکەن

فاتیمە دەبێت بە بووکی عەلی

هەنگوین و گوڵ،
ئاو و خاک،
گوڵ و گەڵا،
زەوی و ئاسمان دەگەن بەیەک...

عەلی هەمان نزای دووبارە و دەبارە دەکردەوە: "خودایە، بە حەڵاڵەکەت لە حەرامەکەت دوورم کەیت، پڕم بکەیت لە هەردوو سیفەتی فەزڵ و میهرەبانیت و لە خۆت زیاتر موحتاجی دەستی کەسم نەکەیت!"

## بەهاری سەردەمی خۆشبەختی

ساڵی دووەمی کۆچ و ناوەڕاستی مانگی زیلحیجە بوو و ماڵی عەلی و فاتیمە تەنها لە ژوورێکی دڵگیر پێک هاتبوو، ژوورێکی ڕێکوپێکی پاکوتەمیز، کە دەرگایەکی گەورەی هەبوو کە دەکرایەوە سەر حەوشەیەک کە مزگەوتەکەی پێغەمبەری بەجوانی لێوە دیار بوو، بنمیچی ئەم ماڵە سادەیە لە چڵی خورما و دیوارەکانی لە قوڕی سوور دروست کرابوو و حەوشەکەشی ئاسمانی شین و فراوانی لێ دیار بوو، پاش پاککردنەوە و سڕین و تەکاندن، حەسیرێکی گەنمڕەنگیان داخست و چەند پشتی و بالیفێکی قەدیفە و پێستەیەکی خوریی مەڕیان ڕاخست و لە سووچێکدا دەفرێکی قوڕین، سوراحییەکی سەوز و دەستاڕێک و چەند جام و دۆلکەیەکیان دانا، ئەوەندە بەس بوو بۆ دونیایەکی مایل بە لەناوچوون...

دۆستەکانی خەدیجەش هەمووان هاتبوون بۆ لای فاتیمە و بەدەوریەوە بوون و کچە نازدارەکەی دۆستی ئازیزیان تەنها جێ نەهێشتبوو و یەکیان کراسێکی سپیی دانتێلی ئاڵتوونی و ئەوی دیکە دوو کراسی سووری ئاوریشمی بەدیاری بۆ هێنابوو و کارەکانی فاتیمە و عەلی هێندە ئاسان، هێندە ڕەوان

بەڕێوە دەچوو، هەمووان سەریان سوڕ مابوو، لە کۆتاییدا عائیشە و ئوموسەلەمە پاڵپشتەکانی ماڵەکەیان ڕیز کرد و جێیەکی پاکوتەمیزیان ڕاخست و سفرەیەکی ڕێکوپێکیان ئامادە کرد و ماڵەکەی عەلی و فاتیمە بۆنی میسک و عەمبەری لێ دەهات، بەڵام دونیایی نا، بەهەشتی، دەتوت ماڵێکی بەهەشتە لەسەر ڕووی زەوی و پڕ بوو لە ڕەنگی نەبینراو و سەدای نەبیستراو و بۆنی بێوێنە و تەنها ڕۆحگەلی فراوان و پاکیزە هەستیان بە جیاوازیی ماڵەکە دەکرد و ماڵ نەبوو، دیوانێ بوو لە نەبینراو و نەبیستراو...

## ڕۆژی سوپاسگوزاریی عەلی

ڕۆژێک پێش هەینیی گەورەی ڕۆژەکان بوو و ئیدی کاتی زەماوەند هاتبوو و سبەینێ فاتیمە ماڵە بابی جێ دەهێشت. ژنانی مەدینە عەزیزییەکی زارای ناوازەیان لە قەدیفەی شامی قورس و شاهانەی درێژ و تارایەکی بە پوولەکە چنراوی ناسکیان بۆ چنیبوو، بەڵام ڕۆحی سادەخوازی فاتیمە پێی وا بوو گەلێ زیادەڕۆیی تێدا کراوە و هەمیشە پێی وا بوو بەها و سەنگینیی مرۆڤ لە سادەییدایە و پێویستی بە ڕازندنەوەی زۆر نییە. پێی وا بوو ئینسان دەبێت سەرقاڵی ئەولا بێت، نەک موبتەلای ئەملا و تەماشای عەزیبەکەی دەکرد و لەم کەینوبەینەدا بوو لەگەڵ خۆیدا، وەختێ کچێکی هەژاری جلوبەرگدڕاو و حاڵپەرێشان لە دەرگای دا:

"بە خاتری خودا هیچتان نییە بمدەنێ؟"

وەک بڵێی ئەمە ئەو کەسە بێ کە کچەکەی نەبی چاوەڕێی بوو و لەنێو سەرسووڕمان و چاوی ئابڵەقی ژنانی ماڵەکەدا عەزییە زاراکەی هەڵگرت و دایە دەستی کچەکە! کچەی هەژار لەوپەڕی خۆشحاڵیدا وەری گرت و ڕۆیشت و فاتیمەش لەو ساتەدا بووە میراتگری ڕاستەقینەی بەخشندەیی فاتیمەی نەنکی و خەدیجەی دایکی. گەرچی هەمووان تاسان، بەڵام یەک کەس نەیپرسی "بۆ؟"

خەمێکی شیرین و هەستێکی قووڵ باڵی بەسەر ژوورەکەدا گرت و دواتر خوێندنەوەیەکی نەرمونیانی قورئان و دەنگی تەکبیری شیرینلاوانەوە و گریانی کز تێکەڵ بەیەک بوون...

بەرەکە و ئوموسەلمە وردورد تەماشای فاتیمەیان دەکرد و فرمێسکی ئەوەیان دەڕشت لەوەبەدوا لەگەڵ گوڵەکەی نەبیدا لەژێر یەک بنمیچدا نابن. کۆتا گوڵی ڕەسول دەبوو بە بووک و کۆتا شەوی بوو لە ماڵە باوان... هەروەها ڕەنگە کۆتا نوێژی ئێوەرەی بووبێ لەوێ... ژنانی پشتیوان و کۆچبەران هەمووان بەدەوریەوە کۆ ببوونەوە و شیعر و شانەمەیان بەسەردا دەخوێند. نادیە خەنەی دەگرتەوە بۆ لەپی دەستی سپی و نەرم و قاچەکانی، کەمێک ئاوی گوڵ و دارچینی و زەردەچەوە و گەڵای گوێزی تێکەڵ کرد و بە ئاوی زەمزەم شێلای و خەنەی لێ دروست دەکرد. بەرەکە بەدەم فرمێسکەوە دەیگوت: "دەڕۆی... ڕۆژی لەدایکبوونتم وەک دوێنێ لەیادە و دەڕۆی..." ئەشکی مرواریئاسا هۆن-هۆن بە چاوانی فاتیمەدا دەهاتنە خوار و ژنانی بالابەرز و شۆخوشەنگی مەدینە و کیژانی گەنج و پیرێژنەکانی نێو ماڵەکە هەمووان چاویان پڕ ببوو و ئەو شەوە حوزورێکی سەیر لە ماڵی نەبیدا هەستی پێ دەکرا و فاتیمە دەگریا... ئای چەند سەخت بوو لە دونیایەکدا ببی بە بووک دایکتی تێدا نەبێت...

لە ڕاستیدا مرۆڤ لە بەرد دەچوو... سروشتی ئینسان وەک بەرد نهێنیئامێز و بێدەنگ بوو، بەڵام بەردیش چاک و خراپی هەبوو و هەر وەک ئینسان گەر ئاڕاستەی پەستانێکی زۆر بکرایەتەوە، شێوەی خۆی وەر دەگرت. جیاوازیی نێوان خەڵووز و

ئەڵماس نهێنی بەرگەگرتنیان بوو بۆ پەستان، نهێنییەکە لە شێوازی بەرگەگرتن و مانەوەکەدا بوو، نەک پەستانەکە... هەموو بوونێکی بەنرخ بە سووتان و پیشان دەبوو بە بوون، ئاڵتوون بە سووتان لە ئاگردا پاک دەبوویەوە و ئەڵماس بە سووتان و توانەوە و پێداکێشان شێوەی وەر دەگرت و ئینسان بە هێڵەکی ئارامی و دەرد و ناڕەحەتی و پێگەیشتن و چۆکدانەدان و مانەوەدا تێدەپەڕی و شێوەی وەر دەگرت... هاوسەرگیرییش ڕێی شێوەوەرگرتن و پێگەیشتن بوو و نهێنییەکەی ناخی ئینسان بە هاوڕێگای گونجاو شێوەی وەر دەگرت...

پێغەمبەری ئەعزەم کۆتا ئێوارەی لەگەڵ کچەکەیدا بەسەر برد و ماچی کرد و لەئامێزی گرت و ئامۆژگاریی دەکرد و ئەو کچەی بوخچەکەی پاکیزەیی و مارەییەکەی لێخۆشبوونی ئومەتەکەی بوو، وردورد گوێی بۆ باوکی سەروەری جیهانی گرتبوو: "کچەکەم، لە ماڵی من دەر دەچیت و دەچیتە ماڵێکی دیکە، لەگەڵ کەسێکی دیکە دەژیت کە خووت پێوە نەگرتووە. تۆ ببە بە عەرش بۆ هاوسەرت، با ئەو ببێت بە ئاسمان بۆ تۆ. نەرمونیان مامەڵەی لەگەڵدا بکە و لە کاتی تووڕەییدا بەبێدەنگی لێی دوور بکەوەرەوە و تا تووڕەیی ئەویش تێدەپەڕێت، خۆتی نیشان مەدە." ڕەسول ئامۆژگاریی دەکرد و دایکی باوکی بەوردی گوێی دەگرت و بەو جۆرە شەوەکە بە ئامۆژگاری و نزا و سوجدە و سوپاسگوزارییەوە تێپەڕی و مانگێکی هیلالی باریک لە ئاسمانی مەدینەوە بەرەوە ڕووی دانیشتووانی زەردەخەنەی دەکرد...

## ڕۆژی بووکێنیی فاتیمە

"گەر خودای باڵادەست عەلیی کوڕی مامی
نەئافراندایە، هیچ تاکێک نەبوو شایانی ئەوە
بێت ببێت بە هاوسەری فاتیمەی زەهرا."

حەزرەتی موحەممەد

دووەم ساڵی کۆچ و ناوەڕاستی مانگی حوزەیرانی ساڵی ٦٢٤ و بەیانییەکی شێدار و تەڕی مەدینە بوو. لەگەڵ هەڵهاتنی ئاسۆ دەنگی زوڵاڵی بیلال لەسەر لووتکە سەختەکانی چیاکانی چواردەور دەنگی دەدایەوە و قووقەی کەڵەشێر و خوێندنی بولبول و تەیر و دەنگی گڕوگاڵ و پێکەنین و گریانی منداڵەکانیش تێکەڵ بەیەک ببوون، چەند ڕۆژێکی جوان بوو! ڕۆژی بەیەکگەشتنی فاتیمە و عەلی، حۆریی و فریشتەکان لە ئاسمانەوە تەماشای ئەم ڕۆژەیان دەکرد و عەلی لە کێوەکانی مەدینە گوڵی ڕەنگاوڕەنگی کۆ دەکردەوە تا چەپکێکی لێ دروست بکات بۆ بووکە نازدارەکەی. دواتر بۆ کڕینی پێداویستیی ئێوارەخوانی زەماوەندەکەی ڕێی بازاڕی گرت و بەرەو مزگەوت ڕۆیشت و لەوێ کە ڕەسوڵەڵڵای بەدڵخۆشی بینی، دوو هێندە دڵخۆش بوو. پێغەمبەر گیان بەڵێنی دابوو

خۆی شیرینیی زەماوەندی کۆتا ئەمانەتی خەدیجە ئامادە بکات و بە دەستە نەرمەکانی خۆی سفرەیەکی ڕاخست و دەفرێکی گەورەی لەسەر دانا و ئەو خورمایانەی عەلی هێنابووی، بە دەستە پێغەمبەرانەکانی شێلای. دواتر ئارد و ماست و کەرێی تێ کرد و شیرینیی بەناوبانگی 'خایس'ی دروست کرد و بە دەستە شیفابەخشەکانی کردی بە پارچەی بچووک-بچووکی شێوەی مانگ و لەسەر سینی ڕیزی کردن. هەڵبەت لەم ڕۆژە گەورەیەدا هاوەڵانیش بێکار نەوەستان و هەریەکەیان کەلێنێکی پڕ کردەوە؛ سەعدی کوڕی عەبادە مەڕێکی سەر بڕی و یەکێکی دی ڕۆن و ئەوی دی برنج و گەنمەشامیی هێنا و نانی گەرم و نەرمیان برژاند و کە ئامادەکارییەکان تەواو بوون، ڕەسول بانگی لە زاوەکەی کرد: "ئەی عەلی! هاوەڵانت بانگێشت بکە." عەلی هاوەڵانی کۆ کردەوە و لە ماوەیەکی کەمدا مزگەوت جمەی دەهات و کەسێکی دیکەی نەدەگرت. عەلی خەمی لێ هات و فەرمووی: "یا رسول الله! قەرەبالغییەکی زۆر دروست بووە، ئێوە دەڵێن خۆراکەکە بەش دەکات؟"

پێغەمبەر تەماشایەکی قووڵ و بزەیەکی گەرمی کرد و فەرمووی: "من لە خودا دەپاڕێمەوە بەرەکەت بخاتە خۆراکەکەمانەوە." دواتر بانگی لە بیلال کرد و فەرمووی: "ئەی بیلال، دە-دە ئامادەبووان بانگهێشتی سەر سفرە بکە."

بیلال هاوەڵانی بانگهێشت کرد و هەر دە کەسە بەیەکەوە دەهاتنە ژوورەوە و لەسەر سفرە دادەنیشتن و لە کەشێکی بێهاوشێوە و پڕ حزووردا نان خورا و شەربەت هەڵقوڕێنرا. لە

کاتێکدا ڕەسولەڵلا بە دەستەکانی خۆی خۆراکی پێشکەشی ئامادەبووان دەکرد، حەمزە و عەلی و عەباس پێشوازی و ماڵئاواییان لە میوانەکان دەکرد و پاش ئەوەی بە نزیکەیی ٧٠٠ کەس لە ئەو ئێوارەخوانەی خوارد، ڕەسول داوای سینییەکی کرد و خۆراکی خستە سەر و ناردی بۆ هاوسەرانی و دواتر سینییەکی دیکەی داوا کرد و فەرمووی: "ئەمەشیان بۆ فاتیمە و هاوسەری." ئەوەی مایەوە، بەسەر هەژار و نەداردا دابەش کرا.

دواتر ئوموسەلمە بانگی ئومورپیملەی کرد، کە بووکەکانی مەدینەی دەڕازاندەوە و تارای پێوە دەکردن و ئامادەی ڕۆژی بووکێنیی دەکردن، بۆ ئەوەی فاتیمە بڕازێنێتەوە، بەڵام ئومورپیملە تەماشای فاتیمەی کرد و هەرچیی دەکرد نەیدەزانی چۆنی بڕازێنێتەوە! "چۆن بیڕازێنمەوە! نە سەرکوڵمی دەوێت، نە کل! دەست نابەم بۆ ئەو دەموچاوە حۆریئاسایە، ڕوخساری لەو جۆرە پێویستی بە من نییە." هەر بۆیە هیچی بۆ نەکرد و دواتر ئەو کراسە درێژە ئاوریشمە سادە سپییەیان بۆ لەبەر کرد کە ئوموئومەیمەی بەرگدووری ناودار بۆی دووریبوو و تەنانەت کراسێکی سادەی سپیی یەکپارچەش جوانیی لەڕادەبەدەری دەر خستبوو و دەتوت مانگی چواردەیە دەدرەوشێتەوە...

وەختێ پێغەمبەری خۆشەویست کەلوپەلی بوخچەکەی فاتیمەی ئامادە کردبوو، یەکێ لەو شتانەی زۆر گرنگیی پێ دا، بۆن بوو. وەک هەموو شتێکی دیکە ڕۆحی ئینسانیش بۆنی

هەبوو، دڵی بۆنی هەبوو، بیرکردنەوەکانی بۆنی هەبوو و بۆنی هەریەکیان لەوی دیکە جیاواز بوو. بۆنی فاتیمەش لە هەمووان خۆشتر و دڵبەرتر، باوکی زووزوو ماچی دەکرد و پڕ بە بوونی بۆنی هەڵدەمژی. ئوموسەلمە لە فاتیمە نزیک بوویەوە و پرسیی: "ئەی فاتیمە، بۆنێکت هەیە تایبەت بە ڕۆژە تایبەتەکان؟"

فاتیمە وەڵامی دایەوە: "بەڵێ." پاشان ڕۆیشت لەنێو کەلوپەلە تایبەتکانیدا شووشەیەکی عەتری هێنا و کەمێکی کرد بە مەچەکیدا و لە ئوموسەلەمەی نزیک کردەوە بۆنی بکات، ئوموسەلەمە پرسیی: "کردگارا! ئەمە چ بۆنێکە!" فاتیمە زەردەخەنەیەکی کرد و سەرگوزەشتەی عەترەکەی گێڕایەوە: "منداڵ بووم، جوبریل زووزوو سەردانی باوکمی دەکرد و لە یەکێک لەو جارانەدا باوکم فەرمووی: ‹ئەی فاتیمە، بچۆ پشتییەک بهێنە با میوانەکەمان پاڵ بداتەوە.› پشتییەکەم بۆ هێنا و ماوەیەکی زۆر دانیشتن گفتوگۆیان کرد و وەختێ هەستا بڕوات، ئەم شووشەیەی لێ کەوتە خوارەوە و باوکم فەرمانی پێ دام هەڵی بگرمەوە. لەو کاتەدا عەلییش لەوێ بوو و پرسیی کە ئەوە چییە و ڕەسولەڵڵا فەرمووی: ‹ئەوە بۆنی عەمبەرە، لە باڵەکانی جوبریل کەوتە خوار.› منیش لەو ڕۆژەوە پارێزگاریی لێ دەکەم!›» هەمووان چاویان پڕبوو و لەگەڵ سەرگوزەشتەکەدا گەشتیان کرد بۆ عالەمێکی جودا و هەرچی حوزنە گۆڕا بە شادی و لەنێو ئەو شادییەدا دەست و پێی فاتیمەیان لە خەنە گرت و بە نزا و هیوای جوان ڕازاندیانەوە ئەو بووکەی نە موحتاجی کل بوو، نە

سەرکوڵم. بەپێی کولتووری ئەو ڕۆژە، تارایەکیان دا بەسەردا و جوانیی حۆریئاسایان لە گشت چاوێ شاردەوە و وەختێ حۆرییەکەی ڕووی زەوی ئامادە بوو، پێغەمبەر ئاگادار کرایەوە و فەرمووی: "فاتیمەم بۆ بانگ بکەن." ئوموسەلمە فاتیمەی هێنایە حزوری نەبی و کراسە سپییە سادەکەی لە زەوی دەخشا و تارای شەرم و حەیا بەسەر ڕوخساریدا درابوو و زۆر شەرمی لە باوکە گیانی دەکرد و نەیدەتوانی سەر بەرز بکاتەوە و لە شەرماندا قاچی لێک ئالا و هەڵکەوت و پێش ئەوەی بکەوێت، ڕاست بوویەوە و ئازیز فەرمووی: "خودای گەورە لە دونیا و ئاخیرەتیشدا لە هەڵکەوتن بتپارێزێ شیرینم!"

"الله لە پێترازان بتپارێزێت."

زەوی و ئاسمان بەئاسپایی دەنگی دەدایەوە: "اللهم امین."

دواتر باوەشی کرد بە کچەکەیدا و ماچی ناوچاوی کرد و تاراکەی هەڵدایەوە و ئیدی ئەو ساتە عەلی ڕوخساری مانگئاسای فاتیمەی دی و پێغەمبەری ئازیز دەستی کچەکەی خستە نێو دەستی زاوەکەی و فەرمووی: "خودای گەورە ئەم هاوسەرگیرییە پیرۆز بکات لە کچەکەی رسول اللە."

دواتر فاتیمە دەستی بابە گیانی ماچ کرد و دیسان بۆنی کرد و دیسان ماچی کرد و ڕەسولەڵڵاش بەوپەڕی میهرەبانییەوە کچەکەی لەباوەش گرتەوە. فاتیمە لە شەرمدا تەنها تەماشای گوڵە نەخشێنراوەکانی کۆتایی عەزییەکەی دەکرد، بێجووڵە، بەوردی و ئارام... ڕەسول ڕووی کردە زاوەکەی و فەرمووی: "ئەی عەلی، چەندە هاوسەرێکی جوانە فاتیمە!"

دواتـر ڕووی کـردە کچەکـەی و فەرمـووی: "ئـەی فاتیمـە، چەنـدە هاوسـەرێکی جوانـە عەلـی!" دواتـر بـە چـاوی پڕەوە داوایەکی لـە عەلی کـرد: "ئـەی عەلی! ئەمـە فاتیمەیـە، ئەمانەتی رسـول اللـە و خودایـە لای تـۆ، ئەماناتەکـەی مـن و خـودا بـاش بپارێـزە!" پاشـان نـزای خێـر و سـەلامەتیی بـۆ کـردن: "خودایـە! ئـەم یەکگرتنـە بپارێزیـت، دڵیـان لەنێو یەکدا بپیشـێنی، ئـەوان و نەوەکانیشـیان بـە جێنشـینەکانی بەهەشـت بگێڕی، نـەوەی پـاک و جـوان و موبارەکیـان پـێ ببەخشـیت و بـە فەرمانـی خـۆت بیانکەیت بـە مرۆڤانێک لەژێر فەرمانی خۆتدا ئەمری چاکە بە خەڵکی بکـەن و ببنـە ئیمامانـی ئومـەت."

لـە کۆتاییدا فەرمـووی: "بچنـە ماڵی خۆتـان و چاوەڕێی مـن بکـەن."

شـەونمی جودایـی بـە برژانگەکانـی فاتیمـەدا هاتـە خـوارەوە و هۆن-هـۆن دەگریـا. سـەخت بـوو جیابوونـەوە لـە بابـە گیانـی، وەک چـۆن گوڵـی گوڵەبـەڕۆژە لـە دووریـی خـۆر سـەری کـز دەکرد، فاتیمـەش بۆ دوورکەوتنـەوە لـە هەتـاوی ژیانـی دەگریـا. هەسـتی دەکـرد هەناسـە و ڕەنـگ و بـۆی دەکوژێتـەوە، بـەڵام دەیزانـی خـودا سـوکانایی دەدات و تەسـلیم بـوو...

هەمـووان دەگریـان، فاتیمـە لـە باوکی و باوکی لـە حۆرییەکەی و خەڵکی ماڵیش لـە فاتیمـە دوور دەکەوتنـەوە، بـەڵام لـە لایەکی دیکەشـەوە زەماوەنـد و ئاهەنـگ بـوو و باوکـی خۆشـەویستی کچانـی عەبدولموتەڵیب و ژنانی کۆچبـەر و پشـتیوانانی بانگ کرد و فەرمـووی: "هاوڕێیەتیی فاتیمـە بکـەن، سـرودی شادیبەخشـی

بۆ بڵێن، سوپاسگوزار بن و خۆشحاڵ بن و شتێکیش مەڵێن خودا پێی ناخۆش بێت."

بە دەنگی تەکبیر و سەڵات و سرود فاتیمەیان لە ماڵ دەر کرد و هاوەڵان دەستەدەستە ڕیز ببوون و پیرۆزباییان لە عەلی و فاتیمە دەکرد و دواتر فاتیمەیان سواری حوشترێکی سپی کرد و پەتەکەیان دایە دەستی سەلمان و لەپێشیانەوە حەزرەتی کائینات و لەتەنیشتیدا حەمزە و عەقیل و جەعفەر و لەدواوە کوڕانی بەنوهاشیم و پشتیوانان و کۆچبەران و کەژاوەی بووک لەنێوان دارە سەوزەکانی مەدینەوە بەدەم نیدای 'اللە اکبر، اللە اکبر لا الە الا اللە' ڕێیان دەکرد. ئاواز و سەدایەکی شادیبەخش لە قووڵترین جێی دڵی هەمووواندا دەنگی دەدایەوە و هاوەڵان بەسەرسووڕمانەوە تەماشای یەکیان دەکرد، چوون دەنگەکە لەوان بەدەر بوو و ئازیز فەرمووی: "ئەمێستا جوبریل و میکائیل و حەفتا هەزار فریشتە بەشداریی زەماوەندی فاتیمە دەکەن و ئەو دەنگ و سەدایە هیی ئەوانە." وەک بڵێی دەرگاکانی ئاسمان کرابێتەوە، وەک بڵێی هەموو کەون لەوێدا کۆ بووبێتەوە، سەدایەکی بەرز لە گوێ و دڵی هەمووواندا دەزرنگایەوە:

"اللّه اکبر کبیرا
والحمد اللّه کثیرا
سبحان اللّه بکره و اصیلا"

ئەم مەراسیمە تایبەت و جیاوازە بە قسمەتی هیچکام لە کچەکانی دیکەی نەبی نەببوو، تەنها لە زەماوەندی فاتیمەدا دەنگی ئینسان و فریشتان لەیەک جیانە دەکرانەوە!

ئەو ڕۆژە خۆشترین ڕۆژی عەلی و فاتیمە بوو و دەنگی دەف و شیعر و سرود لە ڕۆحەکاندا دەزرنگایەوە. هۆنراوە بە شان و باڵی شێرەکەی مەیدانی جەنگدا دەگوترا و فاتیمەش بە ئەستێرەی سورەییای شەوانی تار دەچووێنرا و لە کۆتاییدا فاتیمە گەشتە بەردەرگای ماڵی عەلی و هاوسەرانی ڕەسول فاتیمەیان دوور لە چاوان لە حوشترەکەی داگرت و بردیانە ماڵە نوێیەکەی. ژنانی مەدینە سروودیان دەچڕی و خۆشی و شادی و حوزور تک-تک دەڕژایە نێو دڵان و وەک بڵێی هەرچیی ئەهلی عەرش و فریشتەی ئاسمانە کۆ بووبنەوە و تەماشای ئەو ساتە بکەن و هەرچیی هەبووە زمانی لاڵ بووبێت و تەماشا بکات. شادییەک لە دڵاندا بوو، ئەستەم بوو بکرێت بە وشە و عائیشەی هاوسەری ڕەسول خۆی بۆ نەگیرا و گوتی: "ئەمە یەکەم جارە زەماوەندی لەم جۆرە ببینم! دوور لە زیادەڕەوی و ناڕەحەتی و پڕ لە کەیف و خۆشی و شادی."

عائیشە قسەی دڵی هەمووانی کرد، چوون تا ئەو ڕۆژە زەماوەندی لەو جۆرە بە نسیبی کەس نەببوو، بەڕووکەش نە عەزیی باقوبریقاوی و نە زرەی خشڵ و زێڕ و میوانداریی شاهانەی تێدا نەبوو، بەڵام شادییەکی هێندە جیاوازی تێدا بوو، ئەوانەی لەبیر هەمووان بردبوویەوە و دڵەکانی ژیاندبوویەوە...

***

ئێوارەیەکی فێنکی مەدینە بوو و تاکە شتێک لەو ڕۆژە خۆشە مایەوە، شنەبایەکی فێنکی شیرین بوو. ئەستێرەکان لە ئاسماندا وەک چرا دەسووتان و تاکە هەستی زەین و دڵی

مەدینەییەکان ئەو ئێوارەیە خۆشی بوو و ئێستا عەلی و فاتیمە لە ماڵی خۆیاندا بوون.

دەنگی بیلال لە ئامێزی کێوی ئوحودەوە دەنگی دایەوە و موسڵمانان نوێژی خەوتنانیان کرد و عەلی دەستی دەستبۆنەبراوی فاتیمەی گرت و لە حەوشەکەدا دای نیشاند و خۆیشی بەرامبەری دانیشت و بێدەنگ چاوەڕێی پێغەمبەریان دەکرد. فاتیمە زۆر شەرمی لە عەلی دەکرد و عەلی لەنێو کوڵمی سوور و چاوی وەک ئەستێرە داگیرساوی فاتیمەدا ون ببوو...

ئەو ئێوارەیە جیاواز لە هەموو ئێوارەکانی دی، تیشکێکی مەیلەوپرتەقاڵی مەدینەی داپۆشیبوو و ئەستێرەکانیش لەژێر ڕۆشنایی هیلالدا بزەیان دەکرد و سەروەری جیهان بەرەو ماڵی عەلی و فاتیمە هەنگاوی دەنا و لە کاتێکدا حزورێکی شیرین و شادییەکی پێناسەنەکراو ڕۆحی داگیر کردبوون، بۆ یەکەم جار لە دەرگای ماڵەکەیان درا، تەق، تەق، تەق...

یەکەم کەس لە دەرگای ماڵەکەی دان، ئەو بوو... خۆری گیانی فاتیمە، پایەی عەشقی عەلی... بەرەکە بەپەلە ڕای کرد دەرگاکەی کردەوە و نەبی چرایەکی سەوزی بە دەستەوە و بە زەردەخەنەیەکەوە ئیزنی چوونەژووری وەر گرت: "سڵاوی خودات لێ بێت ئەی بەرەکە، عەلیی برام لەکوێیە؟"

"عەلیی برات کێیە یا رسول الله؟"

"عەلیی کوڕی ئەبی تاڵیب."

بەرەکە سەری سووڕ مابوو:

"ئەی خۆشەویست، ئێوە کچەکەتان دا بە عەلی، کە وا بێ، ئەو چۆن برای ئێوەیە؟"

وەختێ موسڵمانان کۆچیان کرد، پەیمانی برایەتی لەنێوان خەڵکی مەککە و مەدینە بەسترا و هەرکەس برایەکی بۆ خۆی هەڵبژارد و پێغەمبەرەکەی خوداش عەلیی بە برای خۆی هەڵبژاردبوو: "ڕاستە، بەڵام عەلی لە دیندا برای منە و ئەمە بەربەست نییە لەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ فاتیمە بکات."

لە کاتی چوونەژوورەوە چاوی کەوتە سەر کەسێک کە لە خانەوادەکە نەبوو و لە بەرەکەی پرسی: "ئەمە کێیە؟"

ئافرەتەکە وەڵامی دایەوە: "من سەلمام."

"سەلمای کچی ئومەیس؟"

"بەڵێ یا رسول الله."

"نەوەک بۆ هاوەڵیکردنی فاتیمە هاتبیت؟"

سەلما وەڵامی دایەوە: "بەڵێ، هەموو کچێک کە دەبێت بە بووک، پێویستی بە ئافرەتێکی نزیکە لە خزمەتیدا بێت و هاتووم تا بزانم پێداویستیی چییە بۆی ڕایی بکەم."

پێغەمبەر ورد گوێی بۆ گرتبوو و سەلما بەردەوام بوو: "کۆتا ڕۆژەکانی خەدیجە بوو و ڕۆشتم بۆ لای و بینیم دەگری، ڕۆشتمە نزیکی و پرسیم، ‹ئەی شاژنی ژنانی دونیا، بۆچی دەگریت کە تۆ هاوسەری پێغەمبەری و مژدەی بەهەشتت پێ دراوە؟› بە ئەشکەوە وەڵامی دامەوە: ‹بۆ فاتیمە دەگریم، هێشتا زۆر منداڵە، لە یەکەم شەوی هاوسەرگیریدا کچان پێویستیان بە ژنێکی دیکەیە نهێنییەکانیانی لا باس بکەن، پێداویستیەکانییان بۆ

ڕایی بکات و ئامۆژگاریی بکات، کێ لە شەوی بووکێنییدا هاوکار و ئامۆژگاریکەری فاتیمە بێت؟› کە لەو حاڵەدا بینیم، پێم گوت: ‹بەڵێن بێت گەر تا ئەو کاتە لە ژیاندا بم، لە جێی تۆ ئەم ئەرکە بگرمە ئەستۆ.››»

هەڵبژێردراوی جیهان چاوەکانی پڕ بوون و فرمێسک بە کوڵمەکانیدا هاتنە خوارێ و فەرمووی: "مادەم بۆ ئەوە لێرەیت، هەمیشە خێر بێتە ڕێت."

بە ڕووناکیی چراکەی دەستی و تیشکی ڕوخساری، کە تا هەتایە ڕووناکی دەبەخشێت، چووە لای فاتیمە و عەلی و هەردووک دەستبەجێ هەستانە سەر پێ و پێغەمبەری گەیشتوو بە مەرتەبەی کەماڵ زەردەخەنەیەکی کرد و داوای لە سەلما کرد لە دەفرێکی پاکدا ئاوی بۆ بهێنێت. سەرەتا دەستنوێژی بە ئاوەکە گرت و دواتر کەمێک میسکی تێ کرد و دوعای بەسەردا خوێند و داوای لە هەردووکیان کرد لێی بخۆنەوە و دواتر کەمێکی ڕشاند بە ڕوخسار و شانی عەلی و فاتیمەدا و نزای بۆ کردن:

"اللهم بارک فیهما و بارک لهما فی نسلیهما!"

"خودایە ئەم هاوسەرگیرییە پیرۆز بکەیت."

"نەوەکانیان پیرۆز بکەیت."

"خودایە پەنا دەگرم بە تۆ لەوەی شەیتان فریوی فاتیمە و نەوەکانی بدات!"

"یا ڕەب وەک چۆن نەوەت بەخشیوە بە پێغەمبەرەکانی پێشوو، نەوەی ڕێنیشاندەری منیش لە نەوەکانی عەلی و فاتیمە بگێڕیت، خودایە ئەمە ئەو کچەمە کە لە هەموو مرۆڤایەتی لام

خۆشەویستتر و عەلییش بەنرخترینی موسڵمانانە لام، خودایە خۆشەویستیی نێوانیان تەندروست و سەنگین بێت."

"خودای گەورە کارە پەرشوبڵاوەکانتان کۆ بکاتەوە، هاوسەرگیرییەکەتان پیرۆز بکات، بتانکاتە خاوەن نەوەی نازدار و چاکەخواز! خودایە ئەم هاوسەرگییە بکەیتە مایەی خێر بۆ هەردووکیان."

دواتر فەرمووی: "گیان و ڕۆحم، هیچ کەمتەرخەمیم نەکردووە لە پەروەردەکردنتدا، ئێستاش مارەم کردووی لە باشترینی خانەوادەکەم. خودا ئاگادارە هاوسەرت کەسێکی باشە، لە ڕیزی پێشەوەی هاوەڵانە، لە گەورەکانی ئیسلامە، زانست و دانایی قووڵ و قارەمانی ئیسلامە، کچەکەم هەرگیز نارەحەتی مەکە و لە قسەی دەر مەچۆ."

پاشان ڕووی کردە عەلی: "ئەی عەلی، باش ئاگاداری فاتیمەی کچم بە، دڵی ڕابگرە، لەبیری نەکەیت فاتیمە پارچەیەکە لە گیانی من و گەر ئەو بڕەنجێنی، منت ڕەنجاندووە."

"ئەی عەلی، لەمەبەدوا خێزانەکەت لەژێر ئاگاداریی تۆدایە و بە ناو و بەرەکەتی خودا بچۆرە لای هاوسەرت."

ئازیز ئەمانەتەکەی تەسلیمی دەستێکی ئەمانەتپارێز کرد و پێش ئەوەی بچێتە دەرەوە، لای دەرگاکەوە ئاوڕێکی دایەوە و فەرمووی: "خودا ئێوە و نەوەکانتانی لە پاکیزان گێڕاوە، هەرکێ لەگەڵ ئێوەدا ئاشت بێ، منیش ئاشتم لەگەڵی و هەرکێ لەگەڵتان بجەنگێ، منیش لەگەڵی دەجەنگێم، ئەمانەتی خودای تاک و تەنهاتان دەکەم."



# بەشی چوارەم

## إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ

خوایە، تەنها هەر تۆ دەپەرستین و هەر لەتۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین

فاتیحە/٥

## وەختی تەماشای ڕوخساری فاتیمە...

" ئەوان کەسانێکن لەبەر خودا یەکدیيان
خۆش دەوێت."
"بوخاری، ٣٦"

بەرەبەیـان بـوو، وەختـی کرانـەوەی خونچـە و خوێندنـی کوکوختییـان بوو و عەلی و فاتیمـە وردەوردە بـە ژیانـی نوێیـان ڕادەهاتـن. ژیانـی ناسـکیان بـەرەو ڕووی یـەک کردبوویـەوە و بـە نـاوی خـوداوە یەکیـان خـۆش دەویسـت و خۆشویسـتن و بەخشـین و وەرگرتـن و دڵڕاگرتـن و ئارامگرتـن هەمـوو بـە ناوی خـوداوە جوانییەکی تایبەتی هەبوو، دڵخۆش بوو عەلی... دڵخۆش بوو فاتیمـە... تـا زیاتر یەکدییـان هـان بدایە، بۆ خێر و جوانی موحیببەتـی نێوانیـان زیاتـری دەکـرد. گـەر هاوسـەرگیری هونـەری دۆزینـەوەی دڵێک بێت بەرامبـەر بـە دڵت، ئـەوەی ئـەو بەیەکەوەبوونـەی دەپاراسـت، خۆشەویسـتی و میهرەبانـی بـوو. ئـەرێ عەشـقیش ڕەنـگ و قاڵـب و شـێوەی هەبـوو و هەنـگاوێ پێش عەشـق ڕاسـتگۆیی و دواتـر موحیببـەت و دواتـر عەشـق و دواتـر هۆگـری مـەوەدە بـوو کـە یـەک پارچـە لـە میهرەبانییـەوە

سـەرچاوەی دەگـرت. هـەر بۆیـە ئـەو هاوسـەرگیرییەیانەی خاڵیبـوون لـە میهرەبانـی کوێـر و شـەل و هەتیـو بـوون و گـەر هەمـوو ئـەو هەسـتانەش یەکلایەنـە بووایـە، ئـەوا وەک باڵندەیەکی باڵشـکاو ئـەو بەیەکەوەبوونـە ئاسمانی نەدەبینی. تەنها ئەوانـەی میهرابانییـان دەکـرد بـە ئـاو و موحیببەتیـان دەکـرد بـە خـاک، دەیانتوانـی گەشـە بکـەن و لەژێـر قوببـەی ئاسـمانی شـیندا داسـتانی قەدیـم بهۆننـەوە...

عەلی و فاتیمە ڕێچکەیەکی سـادەیان هەڵبژاردبوو بۆ چیرۆکی عەشقەکەیان، بە مەبەستی ئـەوەی هێز و توانا و کاتیـان تەنها لـە شـتانێکدا کار بکـەن، شاییسـتە بێت، ژیانـی ڕۆژانەیـان لەنێوان دوو خەتدا تێدەپەڕاند؛ سـادەیی و نەبوونـی. لـە سـادەییدا حوزور هەبـوو و لـە نەبوونیدا پاکـی. هەرچییـەک لـە قـەدەرەوە بهاتایـە، جـوان بـوو و ئەوانـەی ئاسـۆیان بێسـنوور بـوو، مەنزڵـی کاتـی گرنگیـی نەبـوو. هـەردووک بـێ گلەوگازنـدە لەگـەڵ شـەپۆلەکانی ژیاندا دەڕۆشـتن و عەلـی لـەو کاتانـەدا کە لـە حزوری ڕەسـولدا نەبـوو، سـەرقاڵی پەیداکردنـی بژێویـی ژیـان بـوو. جـار هەبـوو دارخورمـای دەوڵەمەندەکانـی مەدینـەی ئـاو دەدا و کات هەبـوو ئـاوی لـە بیـر دەر دەکـرد و کاتیـش هەبـوو بـە فرۆشـتنی ئـەو گوڵانەی لە کێوەکان کۆی دەکردەوە و فرۆشـتنیان بە گوڵفرۆشـە یەهودییـەکان بژێویـی ژیانـی پەیـدا دەکـرد.

یەکێـک لـەو ڕۆژانـە، بەیانیـی زوو عەلـی لـە مـاڵ دەر چـوو. لەو ڕۆژانــەدا بێبـاوەڕان پلانـی پەلاماردانـی موسـڵمانانیان دانابـوو، هـەر بۆیـە زووزوو لەگـەڵ پەیامبەرەکـەی خـودا کـۆ دەبوونـەوە

و پەیڕەو و پرۆگرام و پلانی جەنگیان دادەنا. دەرد زۆر و ناڕەحەتی زۆر و ئەرک زۆر و کات کەم بوو. گەورەترینی بەرپرسیارێتییەکانی عەلی پاراستنی پێغەمبەر و پەیداکردنی قووتی ماڵەکەی بوو. ئەو ڕۆژە عەلی بەپەلە ئەو گوڵانەی بەیانی زوو کۆی کردبوویەوە، دایە دەست شالۆمی گیافرۆشی یەهودی و دەستبەجێ بەرێکەوت بەرەو باخی خورماکان بۆ کردنەوەی جۆگەی نوێی ئاو و بێ ئەوەی سانیەیەک بەفیڕۆ بدات، چەند جۆگەیەکی نوێی هەڵکەند و درەختەکانی ئاو دا و بەرەو مزگەوت و فەرمانی پێغەمبەر بەڕێ کەوت. عەلی کاتی نوێژەکانی لێ دەر بچێت، بۆ ساتێکیش نەدەحەوایە و گرنگترین شتێ لە زەینیدا دەهات و دەچوو، پاراستنی پێغەمبەر و دینەکەی و سەلامەتیی موسڵمانان و خۆشبەختیی زەهرا بوو، لە کۆتایی ڕۆژێکی لەو جۆرە پڕووکێنەردا شەکەت وماندوو و تینوو، گەشتە ماڵەوە و لە کاتێکدا تەنانەت زەردەخەنەی سەر لێوی وشکیشی وشک بووبوویەوە، بەزەردەخەنەوە سڵاوی لە مەعشوقی کرد: "سڵاو و خۆشەویستیی خودا بەسەرتا برژێت زەهرا گیانم."

فاتیمە هەموو جارێک بە هەمان ناسکی و نەرمونیانییەوە دەرگای بۆ دەکردەوە: "بەخێر بێیتەوە ئەی شێرەکەی خودا و یاوەرەکەی نەبی و یارەکەی فاتیمە!"

"...!"

ئەمە چ هێزێک بوو خودایە! هێشتا پێی نەنابوویە ماڵەوە، بارانێکی موحیببەتی بەسەردا دەڕژاند، چەندە قووڵ بوو

نەرمیی نێو لەرینەوەکانی دەنگی فاتیمە، میهرەبانیی سەر ڕوخساری و گەرمیی نێو چاوانی...

عەلی و فاتیمە بێ شکان، بێ ژاکان، بێ ژێرپێخستن، لەنێو باخی قەدیمی موحیببەتدا میوانداریيان لە یەکدی دەکرد. زەردەخەنەی ناسک و نەرمی فاتیمە دەستبەجێ دەبوو بە دەوای هەرچیی دەردی عەلییە. دەتوت نهێنییەکی لە هەمووان جیاواز لەنێو چاوانی فاتیمەدایە، چاوەکانی دەکەوتنە سەر هەرشتێک، مەست و حەیرانی دەکرد. با زەمەن وەک ئاو بڕوات یاخود بوەستێت، چ باکی پێیە عەلی! جوانی ڕووی فاتیمە دەیبردە بەندەری ئارامی و لەگەڵ هەر دەرگاکردنەوەیەکی فاتیمەدا دڵی دەگەشایەوە. تەماشاکردنی فاتیمە هێزی دەبەخشی بە دڵی. دوور لە هەموو حەزێکی دونیایی یەک پارچە نوقمی جوانییەکەی دەبوو. بە زەردەخەنەکانی بیابانەکانی ناخی سەوز دەبوو و بە تەماشا نەرمەکانی ئارامی دەکردەوە و دەیزانی کە عەشق و خۆشەویستی بەس نییە، میهرەبانی و ڕەحمە کە پەیوەندییەکان دەهێڵێتەوە... نهێنییەکی دیکە، کە عەلی لە فاتیمەدا پەیی پێ بردبوو، ئەوە بوو بەیانی جۆرێک و نیوەڕوان جۆرێک و ئێواران جۆرێ ڕوخساری دەدرەوشایەوە! گەر چاو ئاوێنەی ڕۆح و ڕوخسار ڕەنگدانەوەکەی بێت، ئەوا عەلی لە ڕوخساری فاتیمەدا تەماشای ڕۆحی پێگەیشتوو و پەروەردەکراوی دەکرد و هەرجارێ تەماشای ڕۆحی دەکرد، شیعرێکی نوێ لە ناخیدا قوڵپی دەدا:

ئەی ئەو کچەی لەگەڵ ناوی پیرۆزی ڕەسولدا ناوی دەهێنرێت، ئەی فاتیمە!

ئەی نموونەی شکۆ و ئیمان، فاتیمە!
ئەی باشترینی ژنان و کچەکەی ڕەسول
ئەی ئەوەی لە بوونیدا گەورەیی حەشار داوە
ئەی کچی ڕەسولە ناودارەکەی جیهان
عاشقی ئەو چاوانەتم کە لە ئەزەلەوە سوورمەکێشراون
ئەو چاوانەت کە بێمنەتن لە کلی ڕووی زەوی.

فاتیمە بە سوراحییە سەوزەکەی دەستی و زەردەخەنە نەرمەکەی ڕوخسارییەوە هەموو ڕۆژێ عەلیی دەنایە نێو ئەو هەموو هەست و سۆزەوە و جامێک ئاوی ساردی دەدایە و قوم قوم لە جێی شەربەتی هەنگوین دەیخواردەوە. عەلی بە تەرازووی هەستیاریی دڵ عەشقی دەپێوا و لە ناخیدا سەدایەک دەنگی دەدایەوە: "بگەڕێرەوە ناو خۆت ئەی ئینسان، کۆڵانەکانی ناخت بگەڕێ، حوکمداریی دڵ بناسە، ڕێی بەختیاری لەوێوەیە، خوداکەت بناسە، پشتی پێ ببەستە، خۆشت بوێ، جا ئەو کات لە مانای ڕاستیی عەشق تێدەگەیت." تەماشای چاوی فاتیمەی دەکرد و دەیبینی چۆن لە نیگاکانییەوە نهێنیی عالەم دەتکا: "هیچکەس ناتوانێ تەنهایی دڵ بڕەوێنێتەوە. خودای لێ دەر بچێت، هیچکەس لە تەنهایی مرۆڤ ناگات. چاوی دڵ بە یەک تیشک دەکرێتەوە و ئەوی دی گشتی لافوگوزافە." هیچیان نەدەگوت و چەندین کاتژمێر دەدەوان و تەنها بە چاو وەڵامی یەکدییان دەدایەوە: "دەگەڕێی، خۆت دەگری، پێچ و دەور دەدەیت، خۆت سەرقاڵ دەکەیت، ئاه و فەریاد لە دڵت دەئاڵێ و بە هیچ ناگەیت... وەک بیابانێکی چۆڵ لە شەوانی تەنهاییدا

وێڵی تیشکێک دەبێت، کۆشکی جەستە بەرز دەکەیتەوە و ڕۆحت لەنێو بیرێکی قووڵدا بێچارە دەناڵێ. نازانێت، لەکوێوە بزانێت ئینسان، کە ئاوی دڵێکی وشکبوو خۆشەویستیی خودایە و بەس." ئەم حاڵ و باسوخواسە ناوەکییەیان هەر لە یەکەم ڕۆژی هاوسەرگیرییەوە بەردەوام بوو و عەلی هەرکات ماندوو و شەکەت دەگەڕایەوە، بە جوانیی فاتیمە دەژیایەوە و دەرد و غەمی دەڕەوایەوە و دەبوو بە هاودەمی ئەو نازەنینە و لەنێو دەریای موحیببەتیدا هەمیشە وڕ و گێژ و سەرمەست بوو و جارجار هەستەکانی دەکرد بە وشە و دەیگوت: "هەرکات لە ماندوویتی و جەنجاڵیی ژیانەوە دەگەڕامەوە و فاتیمەم دەبینی، هەرچیی دەرد و غەم و نارەحەتیمە دەڕەوایەوە." زۆر جار وتەکەی پێغەمبەری دەهاتەوە فیکر کە لێیان پرسی: "هاوسەری باش کامەیە یا رسول الله؟"

فەرمووی: "ئەو ژنەی کاتێ پیاوەکەی تەماشای ڕوخساری دەکات، دڵی دەکرێتەوە."

## تایبەتترینی زەردەخەنەکان

"باشترینی پیاوەکانتان ئەوانەن کە لەگەڵ ژنەکانیاندا باشترینن و میهرەبانترن بەرامبەریان."

ئـەم گوتەیـەی ڕەسـول لـە ناخـی عەلیدا دەنگـی دەدایـەوە و کات هەبـوو دڵـی تەنـگ دەبـوو لەبـەر ئـەوەی ناتوانێت فاتیمـە بـەو جۆرە بژیەنێت کـە خـۆی دەیەوێت. مـات و بێدەنـگ و سـەرکز دەبـوو ئـەو سـاتانەی پێـی وا بـوو ناتوانێـت وەک عوسـمان و ئەبوبەکـر خەرجیـی هاوسـەری بـکات و فاتیمـە لـەو سـاتانەدا دەیویسـت ئـەو گـرێ ڕۆحییـەی بـۆ بکاتـەوە و لێـی دەپرسـی: "هـۆکاری دڵتەنگیـت چییـە، گیانـی مـن؟"

عەلـی بێدەنـگ دەبوو، هیچـی نەدەگوت. فاتیمـە بـە وشـەکانی شـەربەتی حـوزوری پـێ دەنۆشـی و دەیگـوت: "ئـەی میوانـی دڵـم، گیانەکـەم! گـەر هـۆکاری خەمەکـەت دونیایـە، ئـەوا تـۆش دەزانیت خەمـی لـەو جـۆرە لـە ئێمـە ناوەشـێتەوە، گـەر ئاخیرەتیشـە، بـۆم بـاس بکـە، بـا بەیەکـەوە خەفـەت بخۆیـن، چـوون پێغەمبەرێتیـی باوکـم لەودونیـا کەسـمان ڕزگار نـاکات."

عەلـی مووچڕکەیـەک بـە گیانیـدا دەهـات و دەهاتـەوە هـۆش خـۆی و سوپاسـی خـودای دەکرد کـە هاوسـەرێکی وەک فاتیمـەی هەیـە و

دواتر ئامۆژگارییەکانی ڕەسولی هاتەوە یاد: "ئەی عەلی، پێم بڵێ، شەش سەد هەزار مەڕت دەوێت یاخود شەش سەد هەزار لیرە، یاخود شەش سەد هەزار ئامۆژگاری؟" عەلی زەردەخەیەنی کردبوو و وەڵامی دابوویەوە: «شەش سەد هەزار ئامۆژگاریم دەوێت."

"دەی گەر گوێ بۆ ئەم شەش ئامۆژگارییە بگری، وەک ئەوە وایە گوێت بۆ شەش سەد هەزار ئامۆژگاری گرتبێت."

عەلی بە گوێی ڕۆح گوێی بۆ شل کردبوو تا ئازیز ئەو شەش نهێنییەی بۆ بدرکێنێت و ڕەسول فەرمووی:

"لە کاتێکدا هەمووان سەرقاڵی سوننەتەکانن، تۆ فەرزەکان بەجێ بگەیەنە و واجب و سوننەتەکانی ناو فەرزەکان جێبەجێ بکە."

"لە کاتێکدا هەمووان سەرقاڵی دونیان، تۆ یادی خودا بکە و سەرقالی دینەکەت بە و بە جۆرێک بژی، شاییستە بە دینەکەت و بە جۆرێک پارە پەیدا بکە، شاییستە بە دینەکەت و بە جۆرێک پارە خەرج بکە، شاییستە بە دینەکەت."

"لە کاتێکدا هەمووان سەرقاڵی دۆزینەوەی عەیبوعاری یەکدین، تۆ وێڵی دۆزینەوە و چارەسەرکردنی عەیب و عارەکانی خۆت بە."

"لە کاتێکدا هەمووان خەریکی بونیادنان و ڕازاندنەوەی دونیاکەیانن، تۆ دینەکەت بونیاد بنێ و بیڕازێنەرەوە."

"لە کاتێکدا هەمووان هەوڵی ئەوە دەدەن خەڵکی لێیان ڕازی بێت، تۆ هەوڵ بدە حەق لێت ڕازی بێت و بەشوێن ئەو هۆکارانەدا بگەڕێ کە لە خودات نزیک دەکەنەوە."

"لە کاتێکدا هەمووان هەوڵی ئەوە دەدەن کاری زۆر بکەن، تۆ چاوت لەسەر ئەوە نەبێت کارت زۆر بێت، بەڵکوو هەوڵی ئەوە بدە هەرچیت کرد، دڵسۆزانە بیکەیت."

خۆشەویست دونیای لەم چەند ڕستەیەدا بۆعەلی کورت کردبوویەوە.

ئیکسیری خۆشبەختی و شیفرەی بەختیاریی ئینسان بوون ئەم وتانە و هەر وەک چۆن ڕەسول کە وەحیی بۆ هات بەپەلە ڕۆیشت بۆ خەدیجەی گێڕایەوە، عەلییش دوای ئەم ئامۆژگارییانە بەپەلە ڕۆیشت بۆ فاتیمەی باس کرد و بەیەکەوە زەردەخەنەیان دەکرد. دواتر، زۆر دواتر، ڕۆژێک پێغەمبەر دەیفەرموو: "ڕۆژێک خەڵکی بەهەشت لەنێو کۆشکەکانیاندا دێن و دەچن و لەپڕ ڕووناکییەکی گەش بەرەو ڕوویان دەگەشێتەوە و بە تیشکەکەی هەموو بەهەشت ڕووناک دەکاتەوە، خەڵکی لە فریشتەی پارێزگاریکەری بەهەشت دەپرسن، ئێمە لە دونیا وامان بیستبوو لە بەهەشت مانگ و خۆری لێ نییە، ئەم تیشکە بەهێزە چییە؟ وەڵامیان دەداتەوە، 'ئەوەی دەیبینن، نە خۆرە، نە مانگ، ئەوە عەلی و فاتیمەن زەردەخەنە دەکەن و لە دەرەنجامدا بەهەشت نوقمی ئەو تیشکە دەبێت.'"

هەر بە هۆی ئەو نهێنییەوەیە کە تا قیامەت هەردوو هاوسەرێک لەژێر بنمیچێکدا زەردەخەنە بۆ یەک بکەن، نور و تیشکی بەهەشت دزە دەکاتە نێوماڵەکانیان و موحیببەتیان زیاد دەکات و ئەو ماڵە دەبێت بە پارچەیەک لە بەهەشت...



## خولدی بەرین

**بهێڵە دەستبکەمەوە و بیپرژێنم نزای گەوهەرین**
**چوون ئەوی دەستی کردەوە، جێیەتی خولدی بەرین**
**بفەرموو، ئەوە مولک و ئەوە خولدی بەرین**
**بەهەشتە جوان یاخود مولکە شیرین!**
**"حەبدولحەق حەمید."**

ئـەم جـار چۆلەکـەی ئەبابیلـەکان لـە جێی بـەرد مژدە و خۆشـییان دەباراند بەسـەر خەڵکی مەدینـەدا و عەلی و فاتیمە هەوڵـی ڕاهاتنیـان دەدا بـە ژیانـی نوێیـان. دووری سـەخت بـوو و لەگەڵ ئەوەی چەند مانگێک بەسـەر هاوسـەرگیرییاندا تێپەڕیبوو، حەسـرەت و ئیشتیاقی باوکی ڕۆژبەڕۆژ لای فاتیمە زیادی دەکرد و دووریی لە جگەرگۆشـەکەی خۆشەویستیشی مەحـزون کردبـوو و دوور و نزیـک هەمـووان هەسـتیان بە حاڵیان کردبوو. گشـتیان بەشـوێن ڕێگەچارەیەکدا دەگەڕان و لە کۆتاییدا حاریسـی کوڕی نوعمان بڕیـاری دا ئەو ماڵەی کە ڕوویەکی لەسـەر مزگـەوت و ڕووەکەی دیکەی لەسـەر ماڵی پێغەمبـەر بـوو بیـدات بـە فاتیمـە و عەلی و چـووە حزوری ڕەسـول: "یـا رسـول اللـە، دەزانـم دووری لـە فاتیمـە زۆر

ســەختە لەســەرتان و گەر ئیزن بفەرمــوون، دەمەوێت کۆتایی بەم حەســرەتە بهێنم، ڕێک لەتەنیشــت ماڵتانــدا کوڕانی نەجار ماڵێکیــان هەیــە و مــن چەنێکە لــەوێ دەمێنمەوە، بــەڵام چۆڵم کــردووە و پێــم خۆشــە فاتیمە و عەلــی بێن لەوێ نیشــتەجێ بن."

بــەم جۆرە حەســرەتی نێوانیــان کۆتایی هــات و پێغەمبەر مەمنــون و فاتیمــە خۆشــبەخت و عەلییــش شــاد بــوو. عەلی و فاتیمــە بــوون بــە نزیکتریــن دراوســێی وەحــی و لــە دیوارەکەشــدا پەنجەرەیەکــی بچووکیان دروســت کرد و ئیدی لەوێــوە فاتیمــە و عائیشــە حاڵ و هــەواڵ پرســییان دەکرد و فاتیمــە و باوکیشــی لەوێــوە بــەردەوام ئاگایــان لەیــەک بوو حەســرەتیان دەڕەواندەوە. دوو هاوســەری نوێــی بەختیار بە درێژایی شــەو گوێیان لە دەنگی حوزوربەخشــی ڕەســول بوو و لە ســەرچاوەی ئــاوی حەیاتی نەبەویان دەخــواردەوە و بە نــوری چاوی ئەو ڕۆژیــان دەکردەوە. فاتیمــە و عەلی لەدوای موحەممــەد و خەدیجــە دوو بەختیارتریــن هاوســەری جیهان بــوون. وەک یەک دەیانڕوانــی و وەک یەک تێدەفیکرین و وەک یــەک دەدوان و وەک دیاریی خودا تەماشــای یەکدییان دەکرد. هەمیشــە لە هەوڵــی ئەوەدا بــوون تا هەتایە یەکدی لەدەســت نــەدەن و ماڵەکەیــان ببێتــە ســەرچاوەی دڵخۆشــیی هــەژار و نــەدار و هەتیــوان و ســفرەی عیلــم و زانیــاری ڕابخــەن و قووڵترین خۆشبەختییان سوپاســگوزاری و پێناسەنەکراوترین شــادییان خۆشەویســتیی خــودا بــوو و بەم جۆرە لــە مەدینە

ژیان لە گشــت ساتێکدا نوێ دەبوویەوە و حیکایەتە قەدیمەکان ســفر دەبوونەوە و شــیعرە ئەزبەرکراوەکان لەیــاد دەکران و دێڕەکانــی حیکایەتێکــی نوێی عەشــق دەنووســرایەوە و لەوە دەچــوو ئــەم حیکایەتەیــان چەندین ســەدە بمێنێتــەوە و ببێتە میراســیی ئومەتێک.

## چاوەکانتان دابخەن ئەی چاوکراوان
## چاوەکانتان دابخەن...

«ئەوەی لەناو جەستەدایە، گیانە،
بێشک فاتیمەش حۆریی ئینسانە...»

ڕۆژەکان لە مەدینە وەک ئاو دەڕۆیشتن و فاتیمەش هەردەم لە حوزوری باوکیدا بوو. یەک لەو ڕۆژانە فاتیمە ئەشک لە چاوانی نەدەوەستا و گەلێ دڵتەنگ بوو، وەختێ پێغەمبەر هات بۆ سەردانی و بەو جۆرە بینیی، لێی پرسی: "چییە هۆکاری ئەم خەمەت پارچەی گیانم!"

"بیر لە ڕۆژی قیامەت دەکەمەوە بابە گیان! لەو ڕۆژەدا هەمووان بەڕووتی حەشر دەکرێن، شەرم دەکەم لە بەردەم خودادا ڕووت بم!"

هۆن-هۆن فرمێسک بە چاوانی کچەکەی ڕەسولدا دەهاتە خوارەوە لەئاست شەرم و تەریقی و بێچارەیی ئەو ڕۆژەدا و خۆشەویست دەستبەجێ دڵی کچە نازدارەکەی دایەوە، کە بەرگەی ساتێکی دڵتەنگیی نەدەگرت: "ڕاست دەکەیت کچی شیرینم، ئەو ڕۆژە بەڕاستی ڕۆژێکی ترسناکە و بەپێی ئەو زانیارییانەی فریشتەی وەحی پێی داوم، ئەو ڕۆژە یەکەم

کەس زیندوو دەکرێتەوە منم و هەر لەو ڕۆژەدا خودای گەورە جوبریل و هەزار فریشتە دەنێرێتە سەر گۆڕەکەی تۆ و حەوت قوبەی ڕووناکی لەسەر گۆڕەکەتەوە بەرز دەبێتەوە و دواتر ئیسرافیل بە سێ کراسی لە نور دروستکراوەوە بە ڕاسەرتەوە دەوەستێت و دەفەرموێت: ‹کچە بەنرخەکەی موحەممەد! وەختی حەشرت هاتووە! هەستە!› تۆش زۆر ئارام و لەسەرخۆ و خۆشبەخت هەڵدەستیت و ئیسرافیل کراسەکانی بەهەشتت دەداتێ و دەیانپۆشیت و لەو کاتەدا فریشتەیەکی دیکە بە ناوی زوکایل دێت و ئەسپێکت بۆ دێنێت کە لغاوەکەی لە مرواری و زینەکەی تەختێکی ئاڵتوونیی لەسەرە و بەوپەڕی شکۆوە سواری دەبیت و وەختێ دەگەیتە جێی مەحشەر، حەفتا حەزار فریشتە پێشوازیت لێ دەکەن."

کوڵمەکانی فاتیمە تەڕتەڕ ببوون لە فرمێسکدا و بە گوێی گیان گوێی بۆ باوکی دەگرت. گریان لە ناسکترین لایەنەکانی بەندە بوو و خۆشەویست هەر لەو ساتەدا مژدەیەکی دیکەشی دا بە فاتیمە دەربارەی ئەو بەندانەی ئاوا زۆر و زوو فرمێسک دەڕێژن و فەرمووی: "لە ڕۆژی قیامەتدا هەمووان دەگرین، سێ چاو نەبێ فرمێسک ناڕێژن، ئەو چاوەی تەماشای حەرامی نەکردووە، ئەو چاوەی لە ڕێی خودادا تەرکی خەوی کردووە و ئەو چاوەی لە ترسی خودا ئەشکی ڕشتووە، ئەم سێ چاوە لە ڕۆژی مەحشەردا ناگرین و خۆشبەختانە لە گۆڕەکانیان بەرز دەبنەوە، چوون دەزانن دەگەن بە خودا، حەسرەت کۆتایی دێت و عاشق بە مەعشوق دەگات."

ئـەم جـار فاتیمـە هەنسـکی دەدا و فرمێسـکەکانی بارانـی بەخـوڕی نیسـان بـوون و لـە خـۆی زیاتـر بـۆ ئومەتەکـەی خۆشـحاڵ بوو و نەبی بـەردەوام بوو: "ئـەوەی خۆی داپۆشـێت، خـودا دەیپۆشـێت، ئـەوەی حەیـا بکات، خـودا دەیپارێزێت." فاتیمـە یەک-یـەک گوێـی بـۆ مـژدەکان دەگـرت و دواتـر خۆشەویسـت فەرمـووی: "لـە ڕۆژی حەشـردا جارڕدەرێـک لەودیـو پـەردەوە جـاڕ دەدات، ئـەی ئەهلـی مەحشـەر! چاوەکانتـان دابخـەن! ئێسـتا لێـرەوە فاتیمـەی کچـی موحەممـەد ڕەت دەبێـت و بـەو جـۆرە تـۆ وەک هەورەبروسـکە و بـە هاوەڵیـی حەفتـا هـەزار فریشـتە و حـۆری بەسـەر پـردی سـیراتدا دەپەڕیتـەوە."

"یا اهل الجمع، غضوا ابصارکم!"

"ئەی ئەهلی مەحشەر، چاوەکانتان دابخەن..."

بـەو جـۆرە فاتیمـە بـە قەفتانێکـی سـەوزی بەهەشـتەوە لەوێـوە تێدەپـەڕێ و ئەهلـی مەحشـەر هەمـووان چاویـان دادەخـەن...



# بەشی پێنجەم

## اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ

ڕێنموونیی ڕێی ڕاستمان بکە...

الفاتحە/٦



# نەسلی یاسین

لـە سـاڵی سـێیەمی کۆچـدا مـژدە کەوتـە نێـو ماڵـی نەبـی و لـە کۆتایـی سـاڵی یەکەمـی هاوسـەرگیرییاندا فاتیمـە بـۆی دەر کـەوت لەوەبـەدوا بوونەوەرێکـی دیکـەی بچـووک بەشـداریی نـزا و پاڕانەوەکانـی دەکات و تاکێکـی دی دێتـە نێـو خانـەوەدەی ڕەسـەنی ڕەسـول و فاتیمـە و عەلـی دەبـن بـە دایـک و بـاوک. لەنێو گیانـی فاتیمـەدا ڕۆحێـک گـەورە دەبـوو، لەژێـر نەفەسـی ڕەسـول و خۆشەویسـتیی عەلیـدا نەشـونمای دەکـرد، بـەدەم نـزا و زیکـر و ئیمانـەوە گەشـەی دەکـرد و فاتیمـە لـەدوای حـەوا و هاجـەر و خەدیجـە دەبـوو بـە جوانتریـن دایـک. فاتیمـە بەختیـار و عەلـی پـڕ جـۆش و خۆشەویسـت پـڕ شـادی بـوو. سـکپڕییەکەی تـا بڵێـی ئاسـان و نەرمونیـان دەڕۆشـت بەڕێـوە و وەختـێ مانـگ شـێوەی کەوانێکـی باریکـی وەر گـرت، ئیـدی وادەی چاوەڕوانیـی فاتیمـەش هێواش-هێـواش کۆتایـی هـای هـات و لـە شـەوی پازدەهەمـی شـەعباندا و لـە کاتێکـدا مانـگ پـڕ و گـەورە لـە ئاسـمانەوە بزەی دەکـرد، سـەلمای مامـان ئامـادەی لەدایکبوونـی منداڵەکـەی فاتیمـە بـوو و پشـتی بـۆ دەشـێلا و فاتیمـە تەنهـا یـەک نـزای دەکـرد و دەکـردەوە: "لا حول و لا قوه الا بالله العلی العظیم." ئەسـمای کچـی

ئونەیس و سەودای کچی میسراب بە ڕاسەریەوە بوون و حوزورێکی جیاواز باڵی بەسەر ژوورەکەدا گرتبوو. وەختێ ڕەسول زانیی ژانی منداڵبوونی کچەکەی دەستی پێ کردووە، ئوموسەلما و زەینەبی کچی جەحشی نارد و فەرمانی کرد ئایەتەل کورسی و ئایەتی ٥٤ی سورەتی اعراف و سورەتی فەلەق و ناسی بەسەردا بخوێنن و بە هاوکاری و نزای هاوەڵانی منداڵ هاتە دونیا و وەختی خۆرهەڵات و سەحەر مژدە بەنێو شاردا بڵاو بوویەوە: "فاتیمە کوڕێکی بوو!"

فاتیمە لە ژنێکی منداڵبوو زیاتر، لە حۆرییەکی ئەرخەوان دەچوو و بەدەم زەردەخەنە و فرمێسکەوە سوپاسی ئەو خودایەی دەکرد کە ئەم نیعمەتەی پێ بەخشیوە. دەستبەجێ مژدە بە عەلی درا: "مژدە بێت! کوڕێکی وەک مانگی چواردە جوان و پڕتان بوو."

عەلی سەجدەی شوکری برد و خۆشەویست زەردەخەنەی خۆشیی کرد و ڕۆشتە ژوورەوە: "کوانێ! کوڕەزاکەمم نیشان بدەن."

بۆ یەکەم جار کوڕەزاکەیان خستە کۆشی ڕەسول و منداڵە سەیری ڕەسولی دەکرد و بۆ یەکەم جار چاویان چوویە سەر چاوی یەک. ئای چەندە وتەی لەخۆ دەگرت ئەو سەیرکردنە! ڕەسول بانگی دا بە هەردوو گوێی نەوەکەیدا و لە عەلیی پرسی: "چ ناوێکتان بۆ داناوە؟" عەلی، کە ڕۆحێکی جەنگاوەرانەی هەبوو و دەیویست کوڕەکەشی وەک خۆی شمشێربەدەست و بوێر، بەرگری لە ئیسلام بکات، وەڵامی دایەوە: "حرب!" بەڵام

خۆشەویست حەزی بەم ناوە نەکرد و لەجێی 'جەنگ' ناوێکی ئاشتیخوازانەی لا جوان بوو و بەزەردەخەنەوە تەماشای عەلیی کرد و فەرمووی: "با ناوی حەسەن بێت!" حەسەن بە مانای 'خاوەن جوان و جوانچاک' دەهات و خۆشەویست دەیزانی ناوی ئینسان کاریگەریی دەبێت لەسەر کەسایەتی و دەیویست لە جێی جەنگ، جوانی لە کەسایەتییدا ڕەنگ بداتەوە... فاتیمە و عەلییش زۆریان بەدڵ بوو و بەو جۆرە ناویان لێ نا حەسەن.

"کوڕەکەم! حەسەنم! بەخێر بێی بۆ دونیاکەمان..."

لەنێو بەختیارییەکی قووڵدا عەلی شاهی زانست و فاتیمەی شاژنی ڕەوشت چێژی بوون بە دایک و باوکیان دەچەشت. گەرچی پێغەمبەر بەتەنها بوو لەم خۆشییەشدا... ئەی چەندە نیوە بوو هەموو خۆشییەکی بێ خەدیجە... چەند کامڵ دەبوو خۆشییەکە گەر خەدیجەش یەکەم تۆوی زنجیری نەبەویی بدیبایە، بۆنی کوڕە جوانەکەی فاتیمەی بکردایە، چەند جوان دەبوو ئەو خانمەی یاسای عەشقی شکاند لەوێ ئامادەیی هەبووایە، ئای کە چەندە حەزی دەکرد ئەم خۆشییە لەگەڵ ئەو ژنەدا بەش بکات کە ماڵ و گیانی لەپێناودا دانا... هەر بۆیە خۆشییەکی خەمئامێز بوو ئەمیشیان...

دواتر حەسەنیان خستە باوەشی فاتیمە و بەدەم سوپاسگوزارییەوە لە باوکی پرسی: "بابە گیان، قوربانیی بۆ بکەین؟" ڕەسول وەڵامی دایەوە: "نەخێر، سەرەتا قژی بتاشن و هێندەی قورسایی قژی ئاڵتوون بدەن بە هەژاران و پاشان قوربانیی بۆ دەکەین."

وەختێ حەسەن بوو بە حەوت ڕۆژ، قوربانییان بۆ کرد و لەبەر ئەوەی خۆشەویست کوڕی نەبوو، فاتیمە و عەلی ئاڵای نەسلی پێغەمبەریان گرت بە دەستەوە و بوون بە دایکی نەوە و نەسلی نەبی بە نسیبی فاتیمە بوو. هەر وەک پێغەمبەر دەیفەرموو: "نەسلی هەموو ئینسانێک بە کوڕەکانی بەردەوام دەبێت، نەسلی من نەبێت بە فاتیمە بەردەوام دەبێت." هەروەها ناوێکی دیکەی نەسلەکەشی 'نەسلی یاسین' دەبوو، یاسین، کە سورەتی شازدەهەمی قورئان بوو و سین کە پیتی بەرجەستەکاری ئینسان بوو و نهێنیی کۆتا پێغەمبەریش لەو حەرفەدا کۆ ببوویەوە و تەنها کەسانی خاوەن تەقوا لەو نهێنییە تێدەگەشتن، وەختێ نەسلی یاسین لە فاتیمەوە سەری هەڵدەدا، ئەو کاتە ئیدی ئەم نهێنییە بۆ هەتاهەتایە ئاشکرا دەبوو...

## فرمێسکەکانی فاتیمە

ئارامگرتن جوانترین خوو و
زانست جوانترین بەرگە خۆتیان پێ
برازێنیتەوە...
"حەزرەتی عەلی"

ڕۆژەکان لە مەدینە زوو دەستی پێ دەکرد و چڵە خورماکان بەو شنەبایە دەشنانەوە کە لە ئوحودەوە دەهات و دەمێک بۆ ئەملا و دەمێک بۆ ئەولا دەیشەکاندنەوە. چەند وەفدێک لە وڵاتانی دوورەوە هاتبوون و فاتیمەش وەک هاوسەرانی پێغەمبەر سەرقاڵی میوانداریکردنی میوانە ژنەکان بوو. بە دەستە پەپوولەئاسا ناسکەکانی لە لایەکەوە ئەو هەویرەی دەکرد بە گونک کە شەوێ شێلابووی و لە لایەکی دیکەوە داری دەخستە نێو تەنوور و جوانیی گوڵئاسای تێکەڵ بە ئارد و دووکەڵ و تەپوتۆز دەبوو و لە لایەکی دیکەوە بە دەستاڕ گەنمی دەهاڕی و لەو ساتەداشدا دەنگی گریانی حەسەن بەرز بوویەوە و فاتیمە دەمێک بەرەو لای حەسەن ڕای دەکرد و دەمێک بۆ سەر ئاگرەکە و لە لایەکیشەوە گەنمی دەهاڕی و لەو کاتەدا بیلال لەوێوە ڕەت بوو و لە یەک کاتدا گوێی لە

گریانی حەسەن و هاڕەی دەستاڕەکە بوو و لە دەرەوە بانگی لە فاتیمە کرد: "ئەی کچەکەی ڕەسولەڵڵا! گەر دەتانەوێت، من دێم دەستاڕەکە با دەدەم، ئێوە خەریکی حەسەن بن، یاخود گەر دەڵێن، من حەسەن ژێر دەکەم و ئێوە خەریکی کاری خۆتان بن."
فاتیمە گەلێ خۆشحاڵ بوو بەم هاوکارییە و گوتی: "من لە تۆ میهرەبانترم بەرامبەر کۆرپەکەم، ئەی بانگبێژەکەی پێغەمبەر."
بەو جۆرە فاتیمە چوو بەدەم حەسەنەوە و بیلال لە ماوەیەکی کەمدا هەموو گەنمەکەی هاڕی و گەرچی هاوکارییەکی زۆری فاتیمەی کرد، بەڵام درەنگ کەوت بۆ نوێژ و کە گەیشتە مزگەوت، بینیی ڕەسول چاوەڕێی دەکات و فەرمووی: "لەکوێی ئەی بیلال!" بانگبێژەکەی نەبی شەرمەزارانە وەڵامی دایەوە: "کە بە بەردەم دەرگای فاتیمەدا ڕەت بووم، گوێم لێ بوو هەم گەنمی لە دەستاڕ دەدا، هەم حەسەن دەگریا و من چووم گەنمەکەم هاڕی بۆ ئەوەی ئەو حەسەن ژێر بکاتەوە، بۆیە دوا کەوتم، ببورن ڕەسولی خودا."

پێغەمبەر زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی: "تۆ ڕەحمت بە ئەو کردووە، خوداش ڕەحم بە تۆ بکات."

سەرقاڵیی فاتیمە لەو ڕۆژانەدا ڕۆژبەڕۆژ لە زیادبووندا بوو، چوون لەو سەردەمەدا ئیسلام زۆر بەخێرایی بڵاو دەبوویەوە و ماڵی پێغەمبەر بەردەوام پڕ بوو لە ئەو کەسانەی لە مەملەکەتی دوورەوە هاتبوون تا دەربارەی دینەکەی موحەممەد بزانن و میوانداریکردنیشیان دەکەوتە سەر نزیکانی ڕەسول. لە لایەکی دیکەشەوە ئەرکی سەر شانی عەلی قورس بوو و شەو و ڕۆژ

سەرقاڵی بڵاوکردنەوەی پەیامەکەی نەبی و پلانی جەنگ و هەموو ئەو شەوە درەنگانەی خۆشەویست لە ئامێزی تاریکی و مارومێروو و چەقەڵ و گورگ و دز و جەردەدا دەهات و دەچوو، تەنها عەلیی بەشوێنەوە بوو و عەلی نە لە خۆشیی بەهەشت، نە لە ترسی جەهەنەم، بەڵکوو لەبەر ڕەزامەندیی خودا دەهات و دەچوو و دۆستەکانی هەردەم دەیانگوت: "عەلی لەم پێناوەدا هەموو شتێکی خۆی دانا." هەرکاتیش عەلی لەگەڵ ڕەسولدا دەڕۆیشت، ئەرکەکانی ماڵ، وەک میوانداری و دەرسی ژنان و بەڕێوەبردنی ماڵ و بەخێوکردنی حەسەن و چەندین ئەرکی دی، دەکەوتە سەر شانی فاتیمە و جەستەی نارینی زۆر شەکەت و ماندوو دەبوو و پێغەمبەر بەزەیی بە کچەکەیدا دەهاتەوە کە لەم حاڵەدا دەیبینی و پێی دەفەرموو: "کچم! لەبەر شیرینیی ئاخیرەت بەرگەی ماندوویێتیی ئەم دونیایە بگرە!" بەڵام بۆ تەنها جارێکیش گلەیی لە کچەکەی نەدەبیست و دەیوت: "سوپاس و ستاییش بۆ خودا بەرامبەر هەموو نازونیعەتەکانی."

ژنانی وەک ئەو بەختی نەبڕاوەی پیاو و سەروەتێکی دەگمەن بوون، هەر بۆیە ئەو نەوانەی لە شیری فاتیمەیان دەخواردەوە، دەبوون بە نوری چاوی مرۆڤایەتی. فاتیمە ژنێ بوو لە نوری نەبی هاتبوویە بوون، هەر بۆیە عەلی بەخۆشحاڵییەوە گیانی بۆ فیدا دەکرد و دڕکێ بچووایە بە پەنجەی فاتیمەدا، دڵی عەلی خوێنی لێ دەتکا. عەلی هەزاران بەستەی بێئاواز لە دڵیدا کۆ ببوویەوە، سەدان شیعری بەوشەنەکراو لەناویدا

قەتیس ببوون، کورتە و ورد و درشتی ژیان لەنێو خەندەکانی فاتیمەدا بوو بۆ ئەو...

عەلی زۆر دڵگران بوو بە ئەو ژیانە ناڕەحەتەی فاتیمە و دەیویست ئەوەندەی لەدەستی دێت، هاوکاریی بکات، دڵی کزەی دەکرد بۆ دەستی ناسک و جەستەی نارینی و جارجار لای دایکی دەردەڵی دەکرد و دەیگوت: "گەر خزمەتکارێکی هەبووایە، ئەوەندە ماندوو نەدەبوو، هەرچیی کاری نێوان دوو نوێژە خۆی دەیکات و وەک عیبادەتێک تەماشای دەکات، بۆیە زۆر بەخۆشحاڵییەوە دەیکات، بەڵام دەترسم نەخۆش بکەوێت و بپرووکێت و شەکەت بێت."

"خودا گەورەیە کوڕم، سەبرتان هەبێ، هەڵبەت خودا ئاسانی دەکات."

ئەو ڕۆژە عەلی کەمێک زووتر هاتەماڵەوە و بێدەنگ تەماشای زەهرای دەکرد کە بەدیار دەنگی دەستاڕەکەوە خەیاڵی ڕۆشتبوو و دەتوت خەم و خۆشی و خەندە و فرمێسکەکانی دەهاڕێت و سورەتی الزمری دەخوێند. کراسە سپییەکەی بەری لە تەپوتۆز و دووکەڵدا ڕەنگی خۆڵەمێشیی وەر گرتبوو. عەلی چاوەکانی پڕ بوون و کە دەیبینی کوڵمەکانی کوژاونەتەوە و کراسەکەی بەری سووتاوە و نزیک بوویەوە و سڵاوی لێ کرد و فاتیمەش وەک هەمیشە بە دەنگێکی شادیبەخش و حزووربەخشەوە پێشوازیی لە هاوسەری کرد و لەو حاڵەشدا هێشتا زەردەخەنەی دەکرد: "بەخێر بێیتەوە ئەی شێرەکەی خودا!"

عەلی بە چاوە پڕەکانیەوە تەماشای دەکرد و دەستە نارینەکانی خستە نێو دەستیەوە و بینیی ئەو دەستانەی ڕۆژانێک لە پەڕی گوڵ ناسکتر بوون ئێستا هەمووی بووە بە بڵق و برین و بەکزەیەکەوە گوتی: "دەستەکانت بوون بە بڵق...!"

فاتیمە هیچی نەگوت و تەنها زەردەخەنەیەی کرد، بەڵام با هیچیش نەڵێت، دەستەکانی دەکزانەوە و بەزۆر خۆی گرتبوو... عەلی لەوە زیاتر خۆی پێ نەگیرا و گوتی: "فاتیمەم! ئەم چەند ڕۆژەی پێشوو چەند کۆیلەیەک هاتنە خزمەتی ڕەسول، با بچین داوا بکەین خزمەتکارێکت بداتێ!"

ئەمە پێشنیارێک بوو فاتیمە هەرگیز بیری لێ نەکردبوویەوە و سەرەتا کە بیری لێ کردەوە، هەستێکی ناخۆش و سەیر سەرتاپای داگرت، بەڵام دواتر داواکەی عەلیی قبوڵ کرد و بە پێشنیارێکی عاقڵانەی زانی. ڕۆیشت بۆ ماڵی باوکی و لە دەرگای دا، عائیشە دەرگای کردەوە و فەرمووی لێ کرد. وەختێ فاتیمە چوویە ژوورەوە، بۆی دەر کەوت باوکی میوانی هەیە و گەڕایەوە. فاتیمە پێی وا بوو بابەتگەلێکی زۆر گەورەتر هەیە لە ژیانی ڕەسولدا و پێویست ناکات بە بابەتی بچووکی خۆیەوە سەرقاڵی بکات و دەستبەجێ گەڕایەوە ماڵەوە و عەلی سەری سووڕ ما کە چوون و هاتنەوەی یەکێ بوو و وەختێ فاتیمە هۆکارەکەی بۆ باس کرد، حەقی پێ دا.

ئێوارەی هەمان ڕۆژ، ئەو وەختەی تاک-تاک چرای ماڵان دادەگیرسا، باوکی خۆشەویست سێ جار لە دەرگای ماڵی کچەکەی دا. مەراقی بوو بزانێت فاتیمە بۆچی هاتووە و هیچی نەگوتووە.

یەکێک بوو لە ئێوارە ساردەکانی مەدینە و عەلی و فاتیمە و حەسەن قاچیان خستبوویە ژێر بەتانییە قەدیفە سەوزەکەیان، گوێیان لە تەقەی دەرگا بوو و عەلی بەپەلە هەڵستا و دەرگاکەی کردەوە. ڕەسول سڵاوی لێ کردن و کە بەو جۆرە بینینی، بەزەردەخەنەوە فەرمووی: "منیش دەتوانم بێم و قاچ بخەمە ژێر بەتانییەکە لەگەڵتان؟" عەلی وەڵامی دایەوە: "بێگومان! ئەی ڕەسولەڵڵا، بفەرموون." فاتیمە دەستبەجێ هەستایە سەر پێ و دەستەکانی باوکی ماچ کرد و باوکی ئازیزی پرسیی: "کچم! عائیشە پێی گوتم ئەمڕۆ هاتوویت بۆ لام و بێ ئەوەی هیچ بڵێیت، ڕۆشتوویت، هۆکاری چییە؟" فاتیمە لە شەرماندا کوڵمەکانی سوور بوونەوە و هیچی پێ نەگوترا. عەلی بۆ ئەوەی فاتیمە لەو بارودۆخە دەر بکات، گوتی: "ئیزن بفەرموون من عەرزتان بکەم یا رسول الله. سوپاس بۆ خودا کە فاتیمەی گیانی تۆ حەڵاڵی منە. وەک خۆتان ئاگادارن من زۆر جار بە هۆی پێویستی و ئەرکەوە لە ماڵ نیم و ئەو بەردەوام تەنهایە و هەموو کارەکان کەوتووەتە ئەستۆی ئەو و دەیبینم زۆر ماندوو و شەکەتە، هەر بۆیە من داوام لێ کرد بێت داوای خزمەتکارێکتان لێ بکات، بڵێی مومکین بێت خزمەتکارێکی بۆ دابین بکەین!" بێدەنگییەکی قووڵ باڵی بەسەر ژوورەکەدا گرت و پەردەیەکی حوزن بەسەر ڕووی ناوازەی ڕەسولدا درا و بەبەزەییەوە تەماشەیەکی کچەکەی کرد و فەرمووی: "وەڵاهی ناتوانم کاری وا بکەم، لە کاتێکدا ئەهلی سوف لە برسێتی و نەبوونیدا دەتلێنەوە، نیازم وایە دیلەکان ئازاد بکەم

و بە فیدیەکەی پیداویستییەکەی ئەهلی سوف دەستەبەر بکەم."
فاتیمە، کچە بچووکەکەی ڕەسول و دایکی حەسەنەین و چەندین ئەولیا و پیاوچاک بوو لە نەوەکانی، بەڵام نەبی مەجبور بوو داواکەی ڕەت بکاتەوە و لەبەر ئەوەی دەترسا بچووکترین شت لە دڵی کچەکەیدا دروست ببێت، زیاتر ڕوونکردنەوەی دا: "ئەی فاتیمە! سوێن بەو خودایەی منی بەحەق ناردووە، لە ئێستادا چوار سەد پیاو لە مزگەوتن، نە شتێکیان هەیە بۆ خواردن و نە پۆشاکێ بۆ پۆشین و گەر خەمی ئەوانم نەبووایە، ئەوەی دەتویست بۆم دابین دەکردی، ئەی فاتیمە، نامەوێت ئەو خێرەی تۆ دەستت دەکەوێت بچێت بۆ جاریەیەک!" فاتیمە کە باسی ئەهلی سوفی بیست، دڵی کزەی کرد و نەیتوانی فرمێسکەکانی ڕابگرێت. هاوەڵانی سوف بازنەی عیلمی نەبی بوون و لە مزگەوت دەژیان و بەردەوام زانستیان لە فەخری کائینات وەر دەگرت. بیری ژیان و نان و ئاو و گەڕانیان نەمابوو و هەموویان کەسانی بلیمەت و زیرەک بوون و هەر وشەیەک لە زاری نەبی دەکەوتە خوارەوە، دەستبەجێ لەبەریان دەکرد. نان و ئاو و ژیانی ئەوان ناسینی خودا بوو و پێغەمبەری خودا بژێویی ژیانیانی گرتبوویە ئەستۆ. جلوبەرگیان دڕاو و سکیان برسی و بێکار و ماڵ بوون، بەڵام خاوەنی عیلم و عیبادەتێکی نەبڕاوە بوون، هەر بۆیە دەوڵەمەندترینەکان بوون. فاتیمە شەرمەزار بوو لە داواکارییەکەی و حوزن لەنێوان برژانگەکانیەوە دەتکا و ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو، نەیدەزانی چی بڵێت و لە کۆتاییدا گوتی: "من لە خودا و پێغەمبەرەکەی

ڕازیم." خۆشەویست بەوپەڕی میهرەبانییەوە فەرمووی: "خەم مەخۆ کچەکەم، دوعایەکت فێر دەکەم، جوبریل فێری کردووم و هەرکات ماندوو چوویتە ناو جێگە، ٣٣ جار سبحان الله و ٣٣ جار الحمدالله و ٣٤ جار الله اكبر بخوێنە و دڵنیا بە خوێندنی ئەمانە زۆر لە بوونی خزمەتکار زیاتر فریات دەکەون و دێن بەدەمتەوە!"

بەو جۆرە ئەو زیکرانە دەبوون بە یادگاریی ماندوویێتی و شەکەتیی فاتیمە، کە پێغەمبەر وەک دڵدانەوەیەک پێی فەرمووبوو و لە ئەویشەوە بۆ ئومەت جێ دەمان و خەڵکی دوای نوێژەکان تا هەتایە دەیانخوێند...

# عەلیی حەیدەر لە ڕێی یەمەن

هونەر ئەوە بوو بتوانی لەژێر بنمیچی شینی ئاسماندا چەند زەردەخەنەیەک جێ بهێڵی و ژیان بریتی بوو لەوەی حەقی تەواوەتی بدەیت بە خۆشەویستانت و ئەرکی بەندایەتی بەسەرتەوە ئەوە بوو بەعەشقەوە وابەستەی ئەو زاتە بیت کە ژیانی خەڵق کردووە. بەپێی ئەم هاوکێشەیەش بێت، گەر ئەوانەت خۆش بویستایە کە خودا خۆشی ویستوون، حەقی موحیببەتت دابوو!

ڕەسولیش لەوانە بوو بە سەروو زیادەوە حەقی موحیببەتی دەدا و لەنێوان ئەو هەموو کار و سەرقاڵییەدا، هەمیشە هەواڵپرسیی فاتیمەی دەکرد و دەچوو بۆ لای. لە یەکێک لەو ڕۆژانەدا، پاش نوێژ خۆشەویست چوو بۆ لای فاتیمە و بینیی بە دەستەکانی سەرقاڵی دوورینەوەی کراسە سپییەکەی عەلییە و بە قاچەکانیشی بێشکەکەی حەسەن ڕادەژەنێت و قورئانی بۆ دەخوێنێت. خۆشەویست نەرم-نەرم تەماشای کچەکەی دەکرد و هیچی نەگوت، وەختێ فاتیمە سەری بەرز کردەوە و باوکی بینی، چاوەکانی گەشانەوە: "فەرموو بابە گیانم!"

"دانیشە کچەکەم، هەڵمەستە."

"بابە گیان، چۆن دەکرێت تۆ بێیت و من دانیشم!"

خۆشەویست ڕازێکی لە خۆی ئاشکرای بۆ بەیان کرد: "خانمان زۆر لە خێردان، دەزانیت! هەر لەگەڵ هاتنەژوورەوەمدا تەماشام کرد ئەم ماڵە پڕە لە فریشتە."

فاتیمە مووچڕکەیەک بە گیانیدا هات و زەردەخەنەیەکی گەرمی کرد و دەرزی و بەکرەکەی دەستی دانا و پرسیی: "بە چ هۆکارێک لێرەن بابە گیان؟"

خۆشەویست زەردەخەنەیەکی کرد: "هەریەکەیان بە هۆکارێک!"

فاتیمە لە شەرماندا هەردوو کوڵمی سوور بوونەوە و زەردەخەنەکەی سەر ڕوخساری زیاتری کرد و نەبی بەردەوام بوو: "دەبینم خەریکی دوورینەوەی کراسی هاوسەرتی و خزمەتی دەکەیت، بەشێک لە فریشتەکان بە هۆکاری ئەو گرنگیدانەت بە هاوسەرت لێرەن، چوون خزمەتکردنی هاوسەر بۆ هاوسەرەکەی عیبادەتێکە فریشتەکان پیرۆزبایی لە خاوەنەکەی دەکەن لەسەری."

فاتیمە دڵی لەرزی و وردتر گوێی بۆ بابە گیانی گرت: "لە کاتێکدا بە دەست جلەکانی هاوسەرت دەدووریتەوە، بە قاچ منداڵەکەت ڕادەژەنی و بە موحیببەت و خۆشەویستییەوە خزمەتکردنی منداڵ و گەورەکردنی حاڵێکە، فریشتان دێن تەماشای جوانییەکەی دەکەن، هەندێک لە فریشتەکانیش بەو هۆکارە لێرەن."

فاتیمە شەرمی دەکرد لە خودا و لە باوکیشی و سەری شۆڕ کردەوە و تەماشای زەویی دەکرد و باوکی بەردەوام

بوو: "لە کاتیکدا ئەم کارانەشت دەکرد، قورئانت دەخوێند و کۆمەڵێک لە فریشتان بۆ ئەوە هاتوون گوێت لێ بگرن. هەر بۆیە خانمان زۆر لە خێردان گیانی من، چوونەبەهەشتیان زۆر لە پیاوان ئاسانتر و لەپێشترە."

"چۆن شتی وا دەبێت بابە گیان!"

"گەر خانمان نیەتیان پاک ڕابگرن و ئەم کارانە وەک عیبادەت تەماشا بکەن، ئەوا هەرچیی دەیکەن بە عیبادەت دەنووسرێت، هەروەها گەر خانمێک بە چاوی ئیمان لە ڕووداوەکان بڕوانێ و بە عیبادەتێکی زۆر و چڕ ژیانی بڕازێنێتەوە و دونیای تایبەتی بە بنچینە ئیسلامییەکان بڕازێنێتەوە، ئەوا هەرچیی کارێک ئەو خانمە لە ماڵەکەیدا دەیکات، عیبادەتە و ئەمەش مژدەیەکی گەلێ دڵخۆشکەرە بۆ خانمان."

فاتیمە باوەشی کرد بە باوکیدا و دەستەکانی ماچ کرد، چەندە مژدەیەکی جوان بوو ئەمە، بەڵام مژدەی گەورە و تاسێنەر کۆتا ڕستەی ڕەسول بوو: "گەر ئافرەتێک هەرپێنج فەرزە نوێژ بکات و بەڕۆژوو بێت و پاکیزەیی بپارێزێت و گوێ بۆ هاوسەری بگرێت، لە ڕۆژی دواییدا پێی دەگوترێت: ‹بفەرموو، لە کام دەرگای بەهەشتەوە دەتەوێت، بچۆ ژوورەوە.›"

فاتیمە لە خۆی زیاتر بۆ ژنانی ئوممەت سوپاسگوزار بوو و دووبارە دڵنیا بوویەوە کە هیچ ڕەفتارێکی جوان و هیچ گوتەیەک و هیچ جووڵەیەکی سەر ڕووی زەوی بەهەدەر ناچێ...

***

ژیان لە مەدینە شیرین و خێرا دەڕۆشت بەڕێوە و لەو ڕۆژانەدا پێغەمبەر و هاوەڵان تا بڵێی سەرقاڵی بڵاوکردنەوەی پەیام بوون و خۆشەویست نامەی بۆ پادشایەتیی فارس و قەیسەری ڕووم و نەجاشیی حەبەشە و سەرکردەی چەندین وڵاتی دیکەی وەک میسر و یەمەن و ئێران ناردبوو و هەواڵی خۆشیان لێ دەبیسترا، بەڵام ئەو هەواڵانەی لە یەمەنەوە دەهاتن، دڵخۆشکەر نەبوون و پێویستی بە کەسێکی پتەو و مەتین بوو، کارەکانی ئەوێ بەڕێوە بەرێت و ئازیز ئەو ئەرکەی خستە سەر شانی زاواکەی. عەلی، کە تا ئەو ڕۆژە گەشتی زۆر شوێنی کردبوو، دەیزانی خەڵکی ئەو ناوچەیە کەسانی کەللەڕەق و دڵڕەقن و شانازی بە هۆزەکانی خۆیانەوە دەکەن و لە خۆیان زیاتر گوێ بۆ کەس ناگرن، هەر بۆیە دوودڵیی خۆی بەیان کرد و گوتی: "یا رسول الله، ئەمە کارێکی قورسە." ڕەسول ئاگاداری ئەو سەختییە بوو، بەڵام دڵنیا بوو لەوەی هەموو سەختییەک ئاسانییەکی لەگەڵدایە و دەستەکانی بەرز کردەوە و نزای ئاسانکاریی بۆ کرد: "ئەی خودایە! زمانی عەلی بکەیت بە وەرگێڕی حاڵی و دڵیشی بە سەرچاوەی نوری هیدایەت." خۆشەویست فەرمانی "بڕۆ"ی دابوو، عەلی بە ناوی خودا سواری ئەسپەکەی بوو، ئاڵای ئاشتی بە دەستیەوە و نزای خودایی لەسەر زاری، بەرەو یەمەن بەڕێ کەوت. لەگەڵ گەیشتنی بە یەمەن، کارەکان زۆر ئاسانتر بەڕێوە چوون و لە کۆتایی چەند گفتوگۆ و سەرقاڵییەکی چەند ڕۆژیدا یاوەرەکەی نەبی زۆر خێراتر لەوەی چاوەڕوان

بوون توانیی هۆزی حەمەدانی یەمەن بهێنێتە ناو ڕیزەکانی ئیسلام و بە جۆشوخرۆشێکی زۆرەوە گەڕایەوە و هەواڵی سەرکەوتنەکەی پێش خۆی گەیشتە یەسریب. موسڵمانان گەلێ کەیفخۆش و بێباوەڕان وەخت بوو لە داخاندا دەتەقین و خۆشەویست خۆشحاڵ و فاتیمە دڵخۆش بوو و چاوەڕێی گەڕانەوەی عەلیی دەکرد و کراسێکی سووری بریقەداری لەبەر کرد و کلی دا لە چاوانی و بۆنی خۆشی دابوو لە خۆی و لە گشت کونوکەلەبەرێکی ماڵەکە و بە موحیببەت و خۆشەویستییەکی زۆرەوە پێشوازیی لە هاوسەرکەی کرد، وەختێ عەلی گەڕایەوە، مەستی جوانیی حۆریئاسای فاتیمە و بۆنی خۆشی حەسەن و ڕازەوەیی ماڵەکەی بوو، هەرچیی ماندوویێتیی ڕێیە لەبیری کرد و ئەستەم بوو لەنێوان ئەم هەموو گرنگیپێدان و جوانییەدا موحیببەت و خۆشبەختی چەکەرە نەکەن و بەو جۆرە گشت ساتێک بەهاری نوێ و دەورانی نوێ بەرەو ڕووی ماڵە خۆشبەختەکە دەکرایەوە...

# براکەی حەسەن

ماڵی خۆشبەخت ڕۆژ لە دوای ڕۆژ فراوانتر دەبوو و فاتیمە سکپڕ بوو بە منداڵی دووەمیەوە و شادییەکی نوێ دزەی کردە نێو ماڵی نەبی و گوڵزاری دونیا بە یەکێکی دیکە لە نەوەکانی ڕەسول دەڕازایەوە. فاتیمە بە هەزار شەرم و ڕەوشتەوە سکپڕییەکەی دەشاردەوە، فاتیمە شەرمی دەکرد، فاتیمە تەریق دەبوویەوە... شەرم و حەیا، کە سرێکی قەدیم بوو، کەمینە لێی ئاگادار...

هاوکات لەگەڵ سکپڕییەکەیدا خێروبەرەکەتێکی زۆر ڕووی لە ماڵەکەی کردبوو و تا زۆر پێویست نەبووایە، لە ماڵ نەدەچووە دەر و خەریکی کاری ماڵ بوو، گەنمی دەهاڕی، هەویری دەشێلا، نانی دەبرژاند و بەدەم هەویرشێلانەوە هەردەم بیری دەکردەوە، چەندە لەیەک دەچوون هەویر و دایک! هەردووک پێویستیان بە سەبر و چاوەڕوانی و شێلان و گرنگیپێدان بوو تا هەڵبێن. فاتیمە لە چاوەڕوانیی هەڵهاتنی هەویرەکەدا بیری لەوە دەکردەوە کە پێگەیشتنی ئینسانیش هەمان هونەری دەوێت، دەبووایە هێندە وریایانە بیبرژێنی، نەسووتێ، بەڵام بەهەویریش نەمێنێتەوە. هەر وەک چۆن

هەویری کاڵ و جواننەبرژاو نەدەبوو بە نان، ئینسانێکیش بەرگەی ناڕەحەتیی نەگرتایە، نەدەبوو بە ئینسان، یاخود گەر باش ئاگات لێ نەبووایە و وریا نەبوویتایە، نانەکە لە ئامێزی تەنووردا دەبوو بە خەڵوز. هەر بۆیە ئەوانەی تەرازووی میهرەبانییان شێوابوو، نەیاندەتوانی نە نان ببرژێنن، نە منداڵ گەورە بکەن. دایکان گەر ڕێگەیان نەدایە منداڵەکەیان خاوەن دەردی خۆی بێت و خۆی چارەسەری بکات، ئەوا لاواز و بێسەبر دەر دەچوو بەرامبەر ناڕەحەتییەکان و گەر تەرازووی میهرەبانییشی بشێوایە و درەنگ لە ئاگرەکە دەری بکردایە، ئەوا منداڵە دەسووتا و لەناو دەچوو، چوون وەک هەموو شتێکی دیکەی دونیا دەواش، کە لە ڕادەی خۆی دەر چوو، دەبوو بە دەرد...



## حەسەنەین

«بۆنی منداڵ بۆنی بەهەشتە!»

ژیـان زۆر خێـرا و پـڕ ژاوەژاوە بەڕێوە دەچـوو و خەڵکی دەهاتـن و دەچـوون و دەهاتنـە نێو ئیسـلام و پەلاماریان دەدا و فێـڵ و تەڵەکەیـان بـۆ دادەڕشـت و ژیـان بـەردەوام بـوو. خۆشەویسـت دڵی خۆش بوو، چوون حەسـەن ئیدی وردەوردە پێـی گرتبوو، نـەوەی دووەمی لەڕێ بوو و لە سـاڵی چوارەمی کۆچ و سـێیەم ڕۆژی شـەعبان فاتیمە بۆ جاری دووەم بوو بە دایک و کۆرپەکەیان خسـتە ئامێزی و مژدەیان بە ڕەسـول دا و وەک شـنەبای بەهەشـت هات بـەرەو ڕووی نەوەکەی و لەگەڵ هاتنـەژوورەوەی وەک هەمیشـە ژوورەکـە پـڕ بـوو لـە بۆنی ئەفسـووناوی و لاهووتـی و فاتیمە کوڕەکەی خسـتە باوەشـی ڕەسـول و خۆشەویسـت زەردەخەنەیەکی گەرمی کرد و ڕووی کردە زاوەکـەی: "چی ناوێکتان بۆ کوڕەکامـان هەڵبژاردووە؟!" عەلـی وەڵامـی دایەوە: "یا رسـول الله، نەمویسـت لـە ناونانیدا پێش ئێـوە بکـەوم." ڕەسـول وەڵامـی دایـەوە: "منیـش لـە ناونانیـدا پێـش خودا ناکەوم." جوبریل هـات بەهانایەوە: "ناوی حوسەینە..."

بەو جۆرە ناوی حوسەینیان لێ نا و بانگیان دا بە گوێیدا و هەمووان تا بڵێی دڵخۆش بوون و حەسەن و حوسەینیش بێئاگا لە هەموو شتێک، ڕۆژبەڕۆژ گەورە دەبوون و خونچەیان دەکرد و بووبوونە سەرچاوەی شادی و خۆشیی ماڵەکە. بەردەوام بەدەوروخولی ڕەسولدا دەهاتن و دەچوون و لەژێر چاودێری و پەروەردەی ئەودا پێدەگەیشتن. حەسەن زۆر لە باپیری دەچوو و وەک ئەو ناوچاوی پان و ڕووی گەشاوە بوو و لەنێو هەموو منداڵاندا دەستبەجێ دەناسرایەوە و ڕۆژێک ئەبوبەکر لە حەوشەی مزگەوت بینیی و لەئامێزی گرت و خستیە قەڵادۆشکان و گوتی: "ئەو منداڵەی لە عەلی ناچێ و لە نەبی دەچێ، هەرچیم هەیە قوربانت بێت!"

خۆشەویست بەردەوام نازی هەڵدەگرتن و لە کاتی نوێژکردندا سوجدەکەی درێژ دەکردەوە تا لەسەر شانەکانی بمێننەوە و جارێک هەردووکیان بە کراسە سوورەکانی بەریان و زەردەخەنەکانی سەر ڕوویانەوە خۆیان کرد بە مزگەوتدا و هێندە شیرین و جوان بوون، ڕەسول گوتارەکەی بڕی و لە مینبەر دابەزی و هەردووکیانی لەباوەش گرت و دواتر لە خوتبەکەی بەردەوام بوو. لەنێو ئەو هەموو سەرقاڵییەیدا هەرگیز پشتگوێی نەدەخستن و یاریی لەگەڵ دەکردن و منداڵ دەبوویەوە لەگەڵیاندا و شەڕەئاو و تیرهاوێژی و ڕاکردن و پێشکەوتن و زۆرانبازیی لەگەڵدا دەکردن و دەنگی قریشکە و شادییان چەندین کۆڵان دەڕۆشت و هەرکات باپیریان دەبینی، بە قریشکە و پێکەنینەوە بەرەو ڕووی ڕایان دەکرد

و هەمیشـەش ئامۆژگاریـی هەمووانـی دەکـرد: "هەرکـێ منداڵـی هەیـە، بـا منـداڵ ببێتـەوە لەگەڵیـدا."

عەلـی و فاتیمـەش، وەک ئـەوەی لـە خەونێکـی شـیریندا بـن، تەماشـای ئـەو سـاتانەیان دەکـرد. ڕەسـول جارجـار هەردووکیانـی دەخسـتە قەڵادۆشـکان و دەیبـردن بـۆ مزگـەوت و هەرکـێ دەبینیـن دەیگـوت: "ئـای کـە چەنـدە بەختیـارن ئێـوە! گـەر دەزانـن بەسـەر شـانی چ مرۆڤێکـی بەنرخـەوەن!" ڕەسـول زەردەخەنەیەکـی دەکـرد و دەیفەرمـوو: "ئەوانیـش لای مـن زۆر بەنرخـن!"

خۆشەویسـت بـەردەوام کچەزاکانـی لەبـاوەش دەگـرت و ماچـی دەکـردن و زووزوو دەیفەرمـوو، "حەسـەن و حوسـەین گوڵـی ڕەیحانـەی منـن."

ڕۆژ دەهـات و دەچـوو و بەختیارتریـن دوو منداڵـی دونیـا لـە ئامێزی ڕەسـولدا گـەورە دەبـوون و ڕۆحیـان ناسـکترین شـێوەی وەر دەگـرت. بـە شـێوازێکی شـیرین و نـەرم و هانـدەر و دوور لـە زۆرلێکـردن ئامۆژگاریـی دەکـردن و لەنێـوان شـەپۆلەکانی میهرەبانییـەوە دەیفەرمـوو: "حەسـەن پێنـج فـەرزی نوێژەکانـت بێ کەموکووڕی بەجێ بگەیەنـە، هەرچـی جێی گومـان بـوو، لێی بـەدوور بـە و هـەر کارێـک گومانـی لـە دڵتـدا دروسـت نەکـرد، بـەرەو ڕووی بـڕۆ، چـوون کاری چـاک حـوزور دەبەخشـێت بـە دڵـی مـرۆڤ و خراپـە و درۆش نائارامـی دەکات."

## حۆرییەکەی کێوی ئوحود

لە ساڵی سێیەمی کۆچ و مانگی شەوالدا هەواڵێک لە دوورەوە گەیشت: "قورەیش بە سوپایەکی سێ هەزار کەسییەوە بەرەو مەدینە دێن."

بێباوەڕانی مەککە سوێندی تۆڵەیان خواردبوو و بەڵێنیان دابوو تاکە موسڵمانێک لەسەر ڕووی زەوی نەهێڵن و بەم مەبەستەش سەد هەزار لیرەیان کۆ کردبوویەوە و چەک و پێداویستیی جەنگیان پێ کڕیبوو و بە سوپایەکی گەورەوە، کە لە حەوت سەد زرێپۆش و دوو سەد ئەسپسوار و سێ هەزار حوشتر پێک هاتبوو، بەڕێ کەوتن و بۆ هاندان و ورەبەخشین بە سوپاکەش بە پێشڕەویی هیند، ئافرەتان شیعر و سرود و گۆرانییان دەگوت.

لەگەڵ بیستنی هەواڵەکە، خۆشەویست دەستەی ڕاوێژکاریی کۆ کردەوە و بڕیاریان دا لە جێیەکی نزیکی تەپۆلکەی عەینەین چادر دابدەن و چاوەڕێی دوژمن بکەن. زۆری نەبرد سوپای بێباوەڕان بە دەنگی دەف و لەنێو هەوری تەپوتۆزدا دەر کەوتن و پڕ قین و نەفرەت و کوێرانە ڕێیان دەکرد. عەلی وەک هەمیشە لە ڕیزی پێشەوە و لەتەنیشت ڕەسولدا بوو و هاوەڵان

دەستبەرداری سەر و سامان ببوون و لە هەوڵی پاراستنی نەبیدا بوون و فاتیمە و هاوڕەگەزەکانی بە چارۆکەی پڕ خۆراکی پشتیان و جامی پڕ ئاوی دەستیان لەوێ بوون و نان و ئاویان دەدا بە جەنگاوەران و خێراخێرا دۆلکە ئاوەکانی دەستیان پڕ دەکردەوە و دەیاندا بە برینداران. هەروەها هۆکارێکی دیکەی بەشداریی ئافرەتان لەم جەنگەدا تیمارکردنی برینداران بوو و بۆ ئەم مەبەستەش چادرێکیان بۆ هەڵدرابوو. پێش ئەوەی جەنگ دەست پێ بکات، ئوموعەتییە بەدڵگرانییەوە چووبوویە خزمەتی ڕەسول و پرسیبووی: "ئەی نێردراوی خودا، هەموو شتێک بۆ پیاوانە، بۆچی لە هیچ جێیەکدا نابینین باس لە خانمان بکرێت؟" لەو ساتەدا دەستبەجێ ئایەتێکی سورەتی ئەحزاب دابەزیبوو: "بەڕاستی پیاوە موسڵمانەکان و ئافرەتە موسڵمانەکان و پیاوە باوەڕدارەکان و ئافرەتە باوەڕدارەکان و پیاوانی هەمیشە گوێڕایەڵ و ئافرەتانی هەمیشە گوێڕایەڵ و پیاوە ڕاستگۆکان و ئافرەتە ڕاستگۆکان و پیاوان و ئافرەتانی خۆگر و بەئارام و پیاوانی لەخواترس و ژنانی لەخواترس و پیاوان و ئافرەتانی بەخشندە و پیاوان و ئافرەتانی ڕۆژووەوان، پیاوان و ئافرەتانی داوێنپاک، پیاوانێ کە زۆر یادی خوا دەکەن و ئافرەتانێ کە زۆر یادی خوا دەکەن، خوا ئامادەی کردووە بۆ هەموویان لێخۆش بوون و پاداشتی گەورە." (الاحزاب/٣٥)

ئەم ئایەتە ڕوونی کردەوە کە لە چاوی خودادا هیچ جیاوازییەک نییە لەنێوان پیاو و ژندا و هەرکێ کاری چاکە بکات، پاداشت دەدرێتەوە.

جەنگێکی بێبەزەیی دەستی پێ کرد و حیلەحیلی ئەسپ و بۆڕەی حوشتر و هاواری مرۆڤ تێکەڵ بە تەپوتۆزی بیابان و تیشکی ئاگرینی خۆر بوون. بێباوەڕان بە تەڵەکە لە پشتەوە پەلاماری موسڵمانانیان دا و مامی زۆر خۆشەویستی پێغەمبەر و چەند هاوەڵێکیان شەهید کرد، هەمووان بەشوێن ڕەسولدا دەگەڕان بیکوژن و عوبەی کوڕی خەلف، کە لە جەنگی بەدرەوە بە ئاواتی کوشتنی پێغەمبەرەوە دەژیا، دەینەڕاند: "موحەممەد لەکوێیە؟ پێم بڵێن لەکوێیە؟" پێغەمبەر لەو کاتەدا بریندار ببوو و کڵاوە ئاسنینەکەی سەری شکابوو و ددانەکانی شکابوون و لە ئامێزی ئوحوددا ماندوو پاڵی دابوویەوە... وەک بڵێی ئوحود بەڵێنی دابێت لە دوژمن بیشارێتەوە، عوبەی بە بەردەمیدا دەڕۆشت و نەیدەبینی، ڕەسول لەخۆڕا نەیگوتبوو: "ئوحود ئێمەی خۆش دەوێت و ئێمەش ئوحودمان خۆش دەوێت." خۆشەویست لە کەناری ئوحوددا پارێزراو بوو و بێباوەڕان وەختێ لە هیچ جێیەک نەیانبینی، هاواریان کرد: "موحەممەدمان کوشت!"

گەرمیی ئەو ڕۆژە بێسنوور بوو و مەدینە دەسووتا و کێوەکان دەبرژان و خوێن دەڕژا و خۆر دەتگوت دابەزیوەتە سەر زەوی و عەلی چەندین برین و جێی شمشێری پێوە بوو و هێشتا بە شمشێری زولفیقاری دەستی پەلاماری بێباوەڕانی دەدا و بە زاری الله اکبری دەکرد.

موسڵمانان تێک شکابوون و عەلی هاواری دەکرد، "یا نصر الله! اقترب!" بە برینداربوونی پێغەمبەر موسڵمانان ئەوەندی

دی تێک شکان و هەواڵ گەشت بە کچەکەی نەبی: "پێغەمبەری خودا بریندارە!" فاتیمە وەک هەورەبروسکە لە جێی خۆی بەرز بوویەوە و بەرەو مەیدانی جەنگ ڕای کرد و سەفیەی پووری و عائیشە و ئوموسولەیمیش بەشوێنیدا ڕۆشتن. هەرچواریان بەژێر بارانی تیردا بێباکەنە ڕایان دەکرد، دڵۆپێ خوێنی ئەو ئازیزە بڕژایە، هەر فاتیمە نا، ئاسمان هەڵدەستایە سەر پێ و فاتیمە لە باوکی زیاتر بۆ پێغەمبەر دەگەڕا. ئەو شتێکی لێ بهاتایە، مرۆڤایەتی پەرێشان دەبوو. فاتیمە خۆی و عەلی و حەسەن و حوسەینی فیدا دەکرد، بە شەرتێ ئەو هیچی لێ نەهاتەیە... نەمانی ئەو یانی نەمانی هەناسای دونیا، یانی مەرگی جیهان... فاتیمە لەنێو حیلەی ئەسپ و هاوار و ناڵەی جەنگاوەراندا بەسەر ئوحوددا هەڵدەزنی و خۆشی نەیدەزانی چۆن گەیشتووەتە ئەوێ و دەیزانی هەر لەحزەیەک دەکرێ تیرێک بەر پشتی بکەوێت، بەڵام ڕای دەکرد و بۆ باوکی دەگەڕا و هاواری دەکرد: "باوکە لەکوێییت؟" "رسول الله لەکوێیت!" پێغەمبەری خۆشەویست گوێی لە دەنگی جگەرگۆشەکەی بوو و بانگی عەلیی کرد، کە بۆ پارێزگاریکردن لێی لەتەنیشتیدا وەستابوو: "سەفیەی پوورم لێرە دوور بخەرەوە، بەرگە ناگرێت، فاتیمەم بۆ بهێنە." عەلی لە ئامێزی ئوحودی داخبوو دابەزی و بانگی لە فاتیمە کرد: "وەرە فاتیمەکەم، مەترسە! ڕەسولەڵلا لێرەیە." عەلی خۆی کردبوو بە قەڵغان بۆ فاتیمە و بەرەو لای پێغەمبەر دەیبرد. عەلف جەستەی هەموو بریندار و شکۆی جەنگاوەرێکی بوێری لێ دەتکا، قەڵغنێکی سپی بەسەریەوە و

جوبەیەکی سەوز بە شانیەوە و شمشێری دوودەمی زولفیقار بە دەستیەوە، هاوکات لەگەڵ پێستی ئەسمەر و برۆ تیژەکانی و چاوە ڕەشەکانی، هەیبەت و شکۆیەکی بێوێنەی هەبوو. شمشێری زولفیقار تەنها لە شانی پان و بازووی بەهێزی ئەو دەوەشایەوە و لە پێشەوە و دواوە و تەنیشتەوە پارێزگاریی لە خۆشەویست دەکرد و لە ترسی هەیبەت و شکۆی عەلی، هیچکەس نەیدەتوانی لە پێغەمبەر نزیک ببێتەوە و خودا پارێزەرێکی دابوو بە خۆشەویستەکەی، کە هەتا دونیا دونیایە، پیاوی لەو جۆرەی نەدەبینییەوە و لە ئاسمانیشدا نازناوی 'شێرەکەی خودا' بوو.

فاتیمە لە کۆتاییدا گەشتە لای باوکی و کە بەو شێوە بینیی ڕوخساری خەڵتانی خوێن بووە، وەک چۆلەکە کەوتە پەلەقاژە و تک-تک فرمێسکی دەڕشت و بە دەستە ناسکەکانی برینەکانی دەسڕی و عەلی ئاوی پێدا دەکرد. بەڵام برینەکانی قووڵ بوون و خوێنەکەی نەدەوەستا و فاتیمە بێچارە سەیری ڕاست و چەپی دەکرد، تا لەنێوان بەرد و چقڵ و داری ئوحوددا شتێکی دەست بکەوێت و لە کۆتاییدا بە هاوکاریی عەلی پارچەیەک حەسیری دۆزییەوە و دەستبەجێ شۆردی و وردی کرد و نایە سەر برینەکە و بەو جۆرە خوێنەکەی وەستا و زەهرا، کە چەنێک بوو حەبیبەی باوکی بوو، ئەم جار بوو بە تەبیبەی باوکی... ئێوارە داهات و بەحری خوێن لە ئوحود هەڵقوڵابوو و ئوحود هەم بۆنی خوێن، هەم بەهەشتی لێ دەهات، ئوحود بۆنی شەهیدی لێ دەهات، ئوحود بۆنی حەمزەی لێ دەهات،

ئوحود بۆنی موسعەبی لێ دەهات، بۆنی ئوحودی ئەو ڕۆژە بە هیچ میسک و عەمبەرێک پێوانە نەدەکرا...

لەو ڕۆژەوەی ئوحود ئوحود بوو، خەمی لەو جۆرەی نەدیبوو، حەمزەی شێرەکەی موتەڵیب لە ئامێزیدا کەوتبوو، موسعەبی قۆزترین و دەوڵەمەندترین گەنجی مەککە لەپێناو دینەکەیدا قەفتانە گرانبەهاکانی فیدا کردبوو و لە کفنێک پێچرابوو کە بەشی ئەوەی نەدەکرد هەموو جەستەی داپۆشێت و قاچەکانی بەدەرەوە بوون... موسڵمانان شەهیدەکانیان هەر لەوێدا ناشت و دڵشکاو و غەمبار گەڕانەوە، حەبیبوڵڵا لەگەڵ کچەکەیدا ڕێی دەکرد. فاتیمە، سەرەڕای نارینی و ناسکیی ئەو ڕۆژە، حەقی نازناوی موجاهیدەی دا، بوو بە دەوا بۆ باوکی و گیانی خۆی لەپێناو ڕەسول و دینەکەیدا خستە مەیدانی جەنگ...

## ئەستێرەکانی زەوی

«من و عەلی و فاتیمە و حەسەن و حوسەین لە
ڕۆژی قیامەتدا لەژێر عەرشدا بەیەکەوین.»
حەزرەتی ڕەسول

هەر ڕووداوێک سەرەداوی جوانییەکە و ڕۆژێک خۆشەویست لەگەڵ هاوەڵان سەرقاڵی باسوخواسی گرنگ بوون و ئومونەیمەن بەرەو مزگەوت ڕای کرد و هەمووان بە دەنگی پڕ ترس و لەرزی ئومونەیمەن ڕاچڵەکین: "فریا کەوە یا رسول اللە! حەسەن و حوسەین ون بوون و هەرچیی شوێنە گەڕاوین نایاندۆزینەوە." پێغەمبەر بێ ئەوەی سکونەتی پێغەمبەرانەی بشێوێنێت، بەرەو ماڵی کچەکەی ڕۆیشت و دەبینێت فاتیمە دەگری و بەدەم هەسنکەوە دەڵێت: "چوونە دەرەوە یاری بکەن و کاتێکی زۆری بەسەردا چووە و هێشتا نەهاتوونەتەوە و لەبەر ئەوەی عەلیی لێ نییە، تۆم ئاگادار کردەوە بابە گیان!" باوکی بە دەنگێکی ئارامیبەخشەوە وەڵامی دایەوە: "ئارام بە گیانی من، خودای گەورە دەیانپارێزێت." دواتر ئەم نزایەی کرد: "یا ڕەبی، گەر حەسەن و حوسەین لە دەریادان، بە پارێزگاریی خۆت

بیانگەیەنـــەرەوە وشـــکانی و گـــەر لـــە بیابانیشـــدان، ڕابەرییـــان بکەیـــت بۆ ماڵەوە و بۆمـــان بگەڕێنیتەوە." لەو ســـاتەدا جوبریل هـــات بەهانـــای نەبییەوە: "ســـڵاوت لێ بێ یا رســـول الله! ئەوان لـــە گـــەورە و ســـەردارەکانی دونیـــا و دایکیـــان لە شـــکۆدارانە، بێخـــەم بن، لـــە باخچەکەی کوڕانی نەجار پارێـــزراون و خودای گـــەورە دوو فریشـــتەی بـــە پارێزگاریکەر بەســـەرەوە داناون و بـــە باڵەکانیان دایان پۆشـــیون." کۆتا پێغەمبـــەر لەگەڵ هاوەڵاندا ڕێـــی باخچەکەیان گرت، کە گەیشـــتن، دەبینن لـــە باخی کوڕانی نەجـــار لـــە لێـــواری بەرزاییـــەک وەســـتاون و هەردووکیـــان لە ترســـاندا جووڵەیـــان لـــە خۆیـــان بڕیـــوە و باوەشـــیان کردووە بەیەکـــدا، چـــوون مارێکی گەورە لـــە بەردەمیاندا وەســـتابوو. لە کاتێکـــدا مارەکە خـــۆی بۆ پەلامـــاردان ئامادە کردبـــوو، گوێیان لە دەنگی ئارامیبەخشـــی باپیرەیان بوو و مار دەســـتبەجێ دوور کەوتەوە و حەســـەن و حوســـەین خێرا خۆیـــان هەڵدایە ئامێزی باپیریـــان. لە ڕێـــگای گەڕانەوە هەریەکەیانی خســـتبوویە ســـەر شـــانێکی و ڕێیان لە ئەبو ئەیوبی ئەنســـاری کەوت: "یا رســـول الله، یەکیانم بدەرێ بیخەمە ســـەر شـــانی خۆم، با کەمێک ســـەر شانت ســـووک بێت." ڕەســـول بە گەرمترینی زەردەخەنەکانەوە وەڵامـــی دایـــەوە: "یـــا ئەبو ئەیـــوب! ئەمانە لە دونیـــا پیرۆز و لە ئاخیرەتـــدا ڕێزلێنـــراون و دایکیـــان لـــە خۆیان بەرزتـــرە." دواتر تەماشـــایەکی هاوەڵانـــی کـــرد و فەرمـــووی: "پێتان بڵێـــم کێ لە ڕووی نەنـــک و باپیـــرەوە لە هەمـــوو مرۆڤایەتـــی بەرزترە؟"

"بەڵێ یا رسول الله."

"حەسەن و حوسەین! چوون باپیریان موحەممەدی پێغەمبەری خودا و نەنکیان خەدیجەی کوبرایە." زەردەخەنەکەی زیاتری کرد و ئەم جار فەرمووی: "ئەی پێتان بڵێم کێ لە رووی دایک و باوکەوە لە هەموو مرۆڤایەتی بەرزترە؟"

"بفەرموو یا رسول الله."

دیسان تەماشای کردن و فەرمووی: "حەسەن وحوسین! باوکیان عەلیی کوڕی ئەبوتاڵیب و دایکیان فاتیمەی کچی ڕەسولە."

بەو جۆرە حەسەن و حوسەین بەدەم زەردەخەنە و قسەی نەستەقەوە و بەسەر شانی باپیریانەوە تەماشای شاریان دەکرد و ئەوان بە دایکیان و دایکیان بە ئەوان شاد بوویەوە.



## منداڵێ بی لە نزیڪ ئەو...

**«هەرگیز هاوڕێیەتیی کەسێک مەکە کە هێندەی گرنگیی ئەو لای تۆ، تۆ گرنگ نیت لای ئەو.»**

**حەزرەتی عەلی**

وەک چۆن کارامەیی هونەرمەند لە هونەرەکەیدا دەر دەکەوت، کارامەیی دایک و باوکیش لە ڕەوشت و کەسایەتی و ڕەفتاری منداڵەکەیدا دەر دەکەوت. ئەو کەسایەتییە لەبیرنەکراوانەی چەندین سەدە ناویان لەنێو ناواندا دەمایەوە، بەری هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر بوون و منداڵەکانی عەلی و فاتیمەش پەروەردەیەکی لەو جۆرە پتەویان هەبوو و یەکەمین نموونەکانی پەروەردەی موحەممەدی بوون بۆ نەوەکانی داهاتوو. وەک دەڵێن منداڵی بەهاری عومرە و بەهاری حەسەن و حوسەین ئاوەکەی عیلم و خۆرەکەی میهرەبانی بوو.

حەسەن لەو ڕۆژانەدا تەمەنی حەوت ساڵ بوو و بە ساتیش لە باپیری دوور نەدەکەوتەوە و لە مزگەوت و ماڵەوە و دەرەوە لەگەڵ ئەودا بوو و لە لایەکی دیکەشەوە زۆر وابەستەی دایکی بوو و گرنگییەکی زۆری بە دایکی دەدا،

چوون وا لە پێغەمبەرەوە فێر ببوو: "بەردەوام لە خزمەتی دایکتدا بە، چوون بەهەشت لەژێر پێی ئەودایە."

حەسەن و حوسەین پەروەردە و فێربوونی بنچینەییان لەلایەن پێغەمبەرەوە بوو و حەسەن ئەو ئایەتانەی ڕۆژانە لە حزوری ڕەسولدا لەبەری دەکرد، بەپەلە دەهاتەوە و بۆ دایکی دەگوتەوە و ماڵیان دەتوت قوتابخانەیە.

عەلی هەر لە سەرەتای هاوسەرگیرییەوە کردبووی بە خوو، ئەو ئایاتانەی لە نەبیی دەبیست، یەکەم کەس بۆ فاتیمەی دەگێڕایەوە، بەڵام لە ماوەی کۆتاییدا دیقەتی شتێکی دابوو، ئەویش ئەوە بوو، پێش ئەوەی ئەو ئایەتەکانی بۆ بخوێنێتەوە، فاتیمە دەیزانی و عەلی بەسەرسووڕمانەوە پرسیی: "گوڵی بەهەشتەکەم! ئەم ئایەتە تازە دابەزیوە و تۆ دەیزانی، لە کێوە فێر بووی!"

فاتیمە زەردەخەنەیەکی سوپاسئامێزی کرد: "لە حەسەنی کوڕمەوە." ئەم زیرەکی و وردییەی حەسەن زۆر دڵی عەلیی خۆش کرد و بۆ ئەوەی بە چاوەکانی خۆی زیرەکییەکەی ببینێت، پێش ئەوەی حەسەن بێتە ماڵەوە، عەلی لە سووچێکدا خۆی حەشار دا و داوای لە فاتیمە کرد هیچ بە حەسەن نەڵێت و پاش کەمێک حەسەن بەجۆشوخرۆشەوە خۆی کرد بە ژووردا و سڵاوی لە دایکی کرد و باوەشی کرد و دواتر دەستی کرد بە خوێندنەوەی ئەو ئایەتانەی ئەو ڕۆژە پێغەمبەر فێری کردبوو، بەڵام لەناکاو زمانی بەسترا و بۆی نەگوترا و فاتیمە دەستی بە قژی ئاوریشمیی کوڕەکەیدا

هێنا و سەری سوورِ ما لە ئەو حاڵەی و پرسیی: "چییە حەسەنم! چیتە!"

حەسەن بەرێزەوە وەڵامی دایەوە: "دایکە گیان، وا هەست دەکەم لەم ژوورەدا زاتێکی گەورە گوێم بۆ دەگرێت و گوێگرتنی ئەو زاتە وای کرد نەتوانم تەواوی بکەم!"

سەرسوورِمانی عەلی بوو بە دوو ئەوەندە و لەوە زیاتر خۆی پێ نەگیرا و لەو شوێنەی خۆی حەشار دابوو، هاتە دەرەوە و کورِەکەی لەباوەش گرت و لەگەڵ زەهرادا تەماشای یەکیان کرد و سوپاسی خودایان کرد لەسەر وریایی و فیراسەتی کورِەکەیان، کە دیار بوو چرای ئومەتی بە دەستەوە دەگرت لە داهاتوودا...



## کاسە زمنجەفیلەکان

«وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا»

«لەو خۆراکەی کە خۆیان حەزی لێ دەکەن، بە هەژار و بە هەتیو و بەدیلگیراوی دەبەخشن.»

الانسان/٨

ڕۆژانی نەبوونی بوو و موسڵمانان لە نارەحەتیدا بوون و لە هەمووان نارەحەتتر خۆشەویست و هاوسەرەکانی و کچەکەی و زاواکەی و دوو نەوەکەی بوون. ئەوەی لە دەستیاندا بوو، دەیاندا بە خەڵکی و هیچ بۆ خۆیان نەدەما. هەموویان خۆیان بۆ ئەو ڕۆژە ئامادە دەکرد. ئەو ڕۆژە ترسناکەی کارەکانت وەک کتێبێک لە بەردەمتدا دەکرانەوە، ئاه لەو ڕۆژە ترسناکە... منداڵ تێیدا لە حەیبەتدا پیر دەبوو، ئەو ڕۆژەی کێوەکان لە سامیدا وەک پەشمەک دەوەرین، دەریاکان قوڵپیان دەدا، زەوی و ئاسمان بەیەکیاندا دەکێشا، دڵەکان لە ترساندا پارچەپارچە دەبوون، هەر بۆیە فاتیمە و عەلی شەو و ڕۆژیان خستبوویە سەر یەک. هیچکەس نەبوو لە فاتیمە فیداکارتر، پارچەیەک لە گیانی ڕەسول و نوری چاوی عەلی هەمووانی خستبوویە پێش خۆی و کێ دەزانێت! ڕەنگە دونیا هێشتا بە حورمەتی فیداکارییەکانی ئەو بێت هەڵبسووڕێت...!

فاتیمە لە دونیادا سێ شتی زۆر خۆش دەویست و دەیگوت: "ئەی عەلی، من لەم دنیایە سێ شتم خۆش ویست و هیچ شتێ هێندەی ئەو سیانە ئازیز نییە لام."

"چین ئەی نوری چاوم!"

"نەمچەشتووە حزورێک لە خوێندنەوەی کتێبەکەی خودا گەورەتر، نەمدیوە خۆشییەک لە تەماشاکردنی رووی رەسول اللە خۆشتر و بەدیی ناکەم چێژێک لە بەخشین لە رێی خودادا ئارامیبەخشتر." عەلی زەردەخەنەیەکی کرد، فاتیمە چەند جوان ببوو بە وەرگێڕی هەستەکانی ناو ئەویش...

ژیان بێ ئەوەی یەک سات چاوەڕێی هیچ کەسێ بکات، زەحمەت و نارەحەت تێدەپەڕی و تاقیکردنەوەی نوێ دەهاتە رێی بەندە تا بزانرێت تەنەکەیە رۆحی ئەم بەندە؟ یان زیوە؟ یاخود ئاڵتوون...؟ بۆ پێوانی ئەمە، رووداوەکان و بڕی تەسلیمیی بەندە بەرامبەریان پێوانە بوو...

حەسەن و حوسەین نەخۆشبوون و ئەو شەوە عەلی و فاتیمە بۆ ساتێکیش خەو لە چاوانیان نەکەوت و بەدیار منداڵەکانیانەوە رۆژیان کردەوە. بۆ رۆژی دوایی حەبیبوڵڵا لەگەڵ دوو هاوەڵی هات سەردانی نەوەکانی بکات: "سڵاوی خوداتان لێ بێت ئەی بەندە هەڵبژێردراوەکانی خودا! هاتووم نەوەکانم ببینم، ئیزنی هاتنەژوورم هەیە؟"

عەلی و فاتیمە بە چاوێکی ماندوو و شەکەت و دەنگێکی پڕ نەشئەوە وەڵامیان دایەوە: "سڵاو و رەحمەتی خودا لە پێغەمبەرەکەی، ماڵ هیی خۆتانە، بفەرموون شادیتان هێنا." ئازیز

هاتە ژوورەوە و بۆنی عەمبەر لەگەڵیدا هاتە ژوور. حەسەن و حوسەین تایەکی بەرزیان هەبوو، بێهێز ببوون و نەیانتوانی بەرەو ڕووی باپیریان ڕابکەن و تەنها زەردەخەنەیەکی شیرینیان بەرەو ڕووی کرد. هەرچیی هەوڵیان دا هەڵبستنەوە، نەیانتوانی و خۆشەویست مەحزوون و غەمبار لەتەنیشتیاندا دانیشت و لەئامێزی گرتن و ماچی کردن و هاوەڵانیش وەک ئەو دڵتەنگ بوون، چوون حەسەن و حوسەین نوری چاوی هەمووان بوون. عەلی سەرەتا سەیرێکی چواردەوری خۆی کرد و پاشان سەیرێکی فاتیمەی کرد و بۆی دەر کەوت ماڵەکە لە ئاو زیاتر، هیچی تێدا نییە پێشکەشی میوانەکانی بکەن، لەنێو ماڵی سەرکردەی سوپا ناودارەکەی ڕەسولدا هیچی تێدا نەبوو بۆ خواردن! بەڵام میوانەکان شانازییان بەم حاڵەی عەلییەوە دەکرد، چوون گەر بیویستایە، دەیتوانی زۆر شایانە بژی، بەڵام هەموو کات و ژیانی بۆ دین تەرخان کردبوو.

پێغەمبەر و هاوەڵان هەستان بڕۆن و خۆشەویست ئاوڕێکی دایەوە و تەماشایەکی حەسەنی کرد، کە چاوەکانی بەکزی بۆ دەکرایەوە و حوسەین کە چاوەکانی بەتەواوی داخرابوون و قەفەسەی سنگیان خێراخێرا بەرز دەبوویە و دەنیشتەوە و چاوەکانی پڕ بوون و پێشنیارێکی کرد بۆ فاتیمە و عەلی، کە وەک پەروانە بەدەوری منداڵەکانیاندا دەسووڕانەوە: "ئەی باوکی حەسەن! دەتوانیت قوربانییەک بکەیت بە مەبەستی چاکبوونەوەی منداڵەکانت!" چۆن بوو تا ئەو ساتە ئەوە نەهاتبوو بە فیکریاندا! هەردووک فەرموویان: "خودایە، حەسەن و حوسەینی ئەمانەتت چاک ببنەوە، نەزر بێت سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بین." حەسەن و

حوسەین، کە بەزۆر چاویان بۆ دەکرایەوە، گوتیان: "ئێمەش! ئەگەر چاک بینەوە، سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبین!" هەرکێ لە ژوورەکەدا بوو پێکەنی، قسەکەیان هێندە پاک و جوان بوو، ڕەقترین دڵی دەهێنایە لەرزە.

بۆ ڕۆژی دوایی هەردووک چاک بوونەوە و هەستانەوە سەر پێ و فاتیمە و عەلی دەستبەجێ بەڕۆژوو بوون، بەڵام لە کۆتایی ڕۆژەکەدا هیچ نەبوو ڕۆژووی پێ بکەنەوە! عەلی چووە لای شەمعونی یەهودی بەقەرز چەند کیلۆیەک ئاردی هێنا و فاتیمە یەک لەسەر سێی ئاردەکەی شێلا و چەند کولێرەیەکی لێ برژاند و لە کۆتاییدا و دوای چەندین شەوی بێخەوی و نەخۆشی دانیشتن نان بخۆن و بۆنی نانی گەرمماڵەکەی تەنیبوو و حەسەن و حوسەین زۆر بەکەیف بوون و هەمووان بەدەوری سفرەکەدا کۆ بوونەوە و چاوەڕێی بانگ بوون و دەنگێکی کز و لاواز لە دەرگاکەوە هات: "سڵاوتان لێ بێت ئەی خانەوادەی عەلی! من و منداڵەکانم زۆر برسیین، لە ڕای خودا و پێغەمبەر شتێک بدەن بەم هەژارە و بەڵکوو خودا لەسەر سفرەی بەهەشت کۆتان بکاتەوە!" عەلی دەرگاکەی کردەوە و دەبینێت پیاوێکی لاواز و هێندە برسی لەبەر دەرگاکەیاندا وەستاوە، بەپێوە خۆی ناگرێت و لە برساندا دەلەرزێت، عەلیی حەیدەر خۆی بۆ نەگیرا و لەگەڵ فاتیمەدا تەماشایەکی یەکیان کرد: "ئەی فاتیمەم! تەماشای حاڵی ئەو پیاوە بکە! لەو حاڵەدا خودا ناردوویەتیە بەردەرگای ئێمە، چی دەڵێیت؟"

"هەرچیی پێت باشە بیکە ئەی عەلی، نە دەڕەنجێم و نە گلەیی دەکەم!"

عەلی، بێ ئەوەی بهێڵێت منداڵەکانی هەست بکەن، کولێرەکەی خۆی هێنا و بە فاتیمەی گوت: "ئێوە ڕۆژووی خۆتان بکەنەوە، من بە ئاو دەیشکێنم و نیەتی ڕۆژووی بەیانی دەهێنم." فاتیمە زەردەخەنەیەکی کرد و کولێرەکەی خۆیشی هێنا و نایە بان کولێرەکەی عەلی و حەسەن و حوسەینیش هەستیان بە حاڵەکە کرد و ئەوانیش کولێرەکانی خۆیان خستە سەر ئەوانەی ئەوان و پیاوەی هەژار بە باوەشێکی پڕ لە کولێرە و چاوێکی پڕەوە گوتی: "شەرمەزارتان کردم بە بەخشندەییتان ئەی ئەهلی ڕەسول! زۆر سوپاستان دەکەم." پێویستیان بە سوپاس نەبوو، نە چاوەڕێی هیچ بوون لە کەس، نە منەت و داواکارییان لە کەس هەبوو و ئەو ئێوارەیە بە ئاو ڕۆژووەکەیان شکاند. بۆ کەسێ خودای وەک خۆی بناسییایە، نەک ئاو، هەواش تێری دەکرد...

بۆ ڕۆژی دوایی فاتیمە ئەوەی مابوو لە ئاردەکە کردی بە کولێرە و دووبارە لەسەر سفرە دانیشتن بە هیوای بانگ و دیسان لە دەرگا درا: "ئەی ئەهلو بەیتی موحەممەد! من منداڵی هەتیوم و هیچم نییە بیخۆم و لە بێچارەییدا هاتوومە قاپی ئێوە، لەبەر ڕەزامەندیی خودا پارچە نانێکم بدەنێ، خودای گەورە لەو بەهەشتەی بەڵێنی داوە تێرتان بکات، برسیمە، توو خودا برسیمە... زۆرم برسییە..." ئەی خودا، ئەمە چ حاڵێک بوو! عەلی و فاتیمە دوو ڕۆژ بوو هیچ نەچووبوویە سەر زاریان، خۆیان بە هەرحاڵ، منداڵەکانیشیان برسی بوون، بەڵام ئەم جار حەسەن و حوسەین یەکەم کەس کولێرەکانیان پێ دا و ئەوانی دی بەدوایاندا و منداڵەکە بە چاوی پڕەوە گوتی: "سوپاستان دەکەم، زۆر سوپاس."

عەلی تەماشایەکی کرد و فەرمووی: "نەخێر! سوپاسی ئێمە مەکە، ئێمە چاوەڕێی سوپاس نین و تەنها نیوەندگیرین، سوپاسی ئەو خودایە بکە کە خاوەنی ماڵ و موڵکی بێکۆتایە." ئەو شەوەش بەبرسێتی سەریان نایەوە و ئێوارەی سێیەم بە هەمان جۆر لەسەر سفرە دانیشتن و دیسان داوای هاوکارییان لێ کرا، حەسەن و حوسەین لە برساندا ڕەنگیان زەرد ببوو، فاتیمە سکی بە پشتیەوە نووسابوو و عەلی لە برساندا هەڵدەلەرزی، بەڵام بۆ جاری سێیەم دڵیان نەهات دەست بە ڕووی هەژارێکەوە بنێن و هەرچییان لە بەردەستدا بوو، دایانێ و زەڕەیەک دوودڵ نەبوون لە بەخشین...

عەلی بە تەماشاکردنی فاتیمە تێر دەبوو و فاتیمە بە خوێندنەوەی قورئان و حەسەن و حوسەینیش بە بوونی دایک و باوکیان و بەو جۆرە ئەو شەوەش بێ شێو سەریان نایەوە. بەیانی کە لە خەو ڕابوون، عەلی بۆ ئەوەی دڵی حەسەن و حوسەین بداتەوە و دڵخۆشیان بکات، بردنی بۆ لای باپیریان و وەختێ ڕەسولەڵڵا نەوەکانی بینی و لەئامێزی گرتن و ماچی کردن، ڕەنگی زەرد و لاوازیان سەرنجی ڕاکێشا و بینیی هەردووک وەک دوو پەڕەسێلکە هەڵدەلەرزن و پرسیی: "ئەی عەلی! ئەمە چ حاڵێکە ئەم دوو منداڵەی تێدایە!" عەلی باسی سێ ڕۆژی پێشووی بۆ کرد و خۆشەویست چاوی پڕ بوو، هەمووان بەیەکەوە و چوون بۆ لای فاتیمە و ڕەسول دڵی کزەی کرد کە فاتیمەی بینی بە ئەو برسێتی و لاوازییەوە ڕاوەستاوە نوێژ دەکات و فرمێسکەکانی بۆ نەگیرا و فەرمووی: "ئەی خودا! ئەهلو بەیتی موحەممەد وا لە برسێتیدا دەمرن!" بەدەم فرمێسکڕشتنەوە دەپاڕایەوە و جوبریل

هات بەهانایەوە: "سڵاوی خودام بۆ هێناویت لەگەڵ ئەم سورەتە، خودای گەورە پیرۆزباییت لێ دەکات بەرامبەر ئەو ئەهلو بەیتەی پەروەردەت کردووە." سورەتەکە سورەتی الانسان بوو، کە باسی لە ئالو بەیتی ڕەسول دەکرد و بەڵێنی بەهەشت و تەخت و ئاوریشمی پێ دابوون لەپای فیداکارییەکانیان، بەڵێنی خۆراکی ناوازە و کاسی شەرابی پێ دابوون:

بسم الله الرحمن الرحيم

لەو خۆراکەی کە خۆیان حەزی لێ دەکەن، بە هەژار و بە هەتیو و بەدیلگیراوی دەبەخشن.

دەڵێن بەڕاستی ئێمە خواردەمەنیتان دەدەینێ هەر لەبەر خوا، چاوەڕوانی ناکەین لە ئێوە نە پاداشت و نە سوپاس.

بەڕاستی ئێمە لە سزای پەروەردگارمان دەترسین لە ڕۆژێکی ترش و تاڵ و دژوارا.

جا خوا پاراستنی لە بەدیی ئەو ڕۆژە و پێی دان پاراوی و خۆشی.

لە پاداشتی خۆگری و ئارامگرییاندا بەهەشت و ئاوریشمی پێ بەخشین.

ئەو بەختەوەرانە لەسەر کورسی و قەنەفە ڕازاوەکان شانیان داداوە، نە گەرمای خۆر بێزاریان دەکات، نە کزەبا و سەرما سەغڵەتیان دەکات.

سێبەری درەختە جوانەکان بەسەر شوێنە خۆشەکانیاندا سەری فرو هێناوە و لێکردنەوەی میوەکانیش ئاسانە و ملکەچ کراوە.

هەروەها لە سوراحی و دۆلکەی زیودا شەرابیان بۆ دەگێڕن، کە دەکرێتە ئەو کوپ و پەرداخانەوە کە لە شووشە و کریستاڵی تایبەت دروست کراون.

هەروەها شەرابێکی تریان پێشکەش دەکرێت کە ئاوێتەکەی زەنجەبیلە.

ئینجا نەوجەوانانی هەمیشە لاو و ڕووخۆش و جوان و پاک بەناویاندا دەگەڕێن (قسەی خۆش و سرودی بەتام دەڵێن)، کاتێک دەیانبینیت، وا دەزانیت مروارین و بەو ناوەدا بڵاو بوونەتەوە.

کاتێکیش بە هەرلایەکدا چاو دەگێڕیت، ئەوە نازونیعمەتی نەبڕاوە و بێئەنداز و دەسەڵاتێکی گەورە دەبینیت لە باخ و باخات و کۆشک و تەلار و دیمەنی جوان و فراوانی بێسنوور.

پۆشاکی بەختەوەران ئاوریشمی سەوزی تەنکە، کە بەسەر پۆشاکی ئاوریشمی ئەستووردا لەبەریان کردووە، بە بازنی زیوی ڕازێنراونەتەوە، ئینجا لەلایەن پەروەردگاریانەوە شەرابی پاک و بێگەرد و خاوێنیان پێشکەش کراوە.

پاشان پەروەردگاریان پێیان دەفەرموێت: بەڕاستی ئەم پاداشتە شایستەی ئێوەیە، هەوڵ و کۆشش و کار و کردەوەی ئێوە شایانی سوپاس و ڕێزە...

سورەتی (الانسان)

## دەریای عەشق

«هەر کێ حەسەن و حوسەینی خۆش
بوێت، منی خۆش ویستووە و هەر کێ قینی
هەبێ بەرامبەریان، ڕقی لە منە.»

حەزرەت

بەیەکەوەبوونی ئەوان لەسەر سێ پایە ڕاوەستابوو؛ خۆشەویستی و سەکینەت و میهرەبانی، ماڵیان پڕ بوو لە موحیببەت و عەلی و فاتیمە بەسەر ئەو پردە باریکەدا دەڕۆیشتن و پڕ بوون لە ویستی ڕەزامەندی و خۆشەویستیی خودا و یەکدی. با لە ڕێی گەیشتن بە ئەو جەستە برسی بێت، ماندوو بێت، نارەحەتی بکێشێت، مادەم لە کۆتاییدا گەیشتن بە ئەوی تێدا بوو، هەرچیی غەم و نارەحەتییە دەیهێنا...

ئەوەی ئەوانی تێدا دەژیان، حیکایەتێکی بێوێنە بوو، بێ لادانە ڕاست و چەپ، بێ چەمینەوە و هەڵکەوتن، ڕێبواری ڕاستەڕێیەک بوون بە ناوی ڕێی عەشق! عەشق نهێنیی قەدیم، عەشق ڕێگەکەی نەبێ...

ڕێبوارانی ئەو ڕێیە تینوو و بەسەبر بوون، بەسەر کێوی مەشەقەتدا هەڵدەگەڕان و نەک تەنها بە زار، لە دڵیشیاندا

گلەییان نەبوو. عەشق لای ئەوان گوتەیەکی سادە یاخود یارییەکی منداڵانە نەبوو، کراسێکی ئاگرین بوو دڵی کاڵوکرچ بۆی نەدەپۆشرا و هەرکێ ئەو کراسە ئاگرینەی نەپۆشیبایە، نەیدەتوانی بەسەر سیراتی عەشقدا بڕوات. ئەوێ وێستگەی هەستی کاڵوکرچ نەبوو، بەهارێک نەبوو وەک مشتێ خۆڵ بە بادا بدرێت، چیرۆکێکی نیوەناچڵ و خۆشەویستییەکی بەدرۆکۆتاییهاتوو نەبوو. ئەوانەی لایان وا بوو عەشق تامکردن و بەرکەوتن و تێربوونە، ئەوانە بوون کە لە بیری قووڵی جەستەدا زیندانی بوون، عەشق عەرشی ڕازەوە بوو و ئاسمانەکەی بە ئەستێرەی سەبر ڕازێنرابوویەوە، عروجکردن بۆ ئەو عەرشە ئەشکی زۆر و ناڕەحەتیی زۆری دەویست و سووتان و چەمینەوە و سکوت بوو عەشق...

بە قورئانەکەی دەستیان و ئیمانی نێو دڵیان و موحیببەتی نێو چاویانەوە ڕێیان دەکرد، ڕەنگە هەر بەو هۆکارە بێت ببنە دایک و باوکی گەنجانی بەهەشت، ڕەنگە هەر بۆیە وەک خانمە تایبەتەکەی بەهەشت ناوی بنووسرێت لە ئاسمان، فاتیمە...

خۆشەویستیی نێوانیان لە ماڵەکەشیاندا ڕەنگی دابوویەوە و کاریگەرییەکەی لەنێو چاوانی منداڵەکەنیاندا دەبینرا، چوون ئەو هاوسەرانەی بەموحیببەتەوە تەماشای یەکیان دەکرد، منداڵەکانیان خۆشبەخت بوون.

پەرستش گرنگترین بەش و پارچەی ژیانیان بوو و نوری وەحی باڵی بەسەر هەموو ژیانیاندا گرتبوو.

ژیانی حەسەن و حوسەینیش بە هەمان شێوە بە ئیمان

ڕازێنرابوویەوە، بۆ نموونە لە هیوایەتە گەورەکانیان هاتنی ڕەمەزان بوو و جۆشوخرۆشی پارشێوان، حوزوری وەختی ئیفتاریان بە ڕۆحی بچووکیان هەست پێ دەکرد و شەوانی قەدر تا بەرەبەیان مەستی دەنگی لاهووتیی خوێندنەوەی قورئان دەبوون و بۆ ئەوەی خەویان لێ نەکەوێت، ئیفتاری شەوانی قەدر شتی زۆر سووک و کەمیان دەخوارد و دەیانزانی زۆرخۆری زۆرخەوی دەهێنێت و تەمبەڵی لە پەرستشەکاندا دروست دەکات و بەم جۆرە گشت ساتێکی ژیانیان پڕ و ڕەنگاوڕەنگ بەڕێوە دەچوو نەوەکانی خۆشەویست، ئیمامەکانی ئومەت...

***

نەبیی ئەشرەف دەیویست نەوەکانی بەرگەی گشت ناڕەحەتییەکی ژیان بگرن و چۆک دانەدەن بەرامبەر سەختییەکان و بوێر و نەترس بن، هەر بۆیە هانی دەدان بۆ وەرزشی زۆرانبازی، چوون هەم تەمەنیان، هەم هەڵکەوتەی جەستەیان وەک یەک بوو و دەیویست ئەو وزەیە لە وەرزشێکدا سەرف بکەن. دەمەونیوەڕۆیەک بەدیاریانەوە دانیشتبوو و بەزەردەخەنەوە دەیفەرموو: "دەی حەسەن بتبینم! حوسەین بگرە." عەلی زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: "یا رسول اللە! حوسەین تەمەنی بچووکترە، بۆچی پشتی ئەو ناگرن!" خۆشەویست وەڵامی دایەوە: "مەگەر نابینیت ئەی عەلی! جوبریل هاتووە و پشتگیریی ئەو دەکات و دەفەرمووێ: ‹دەی حوسەین، بتبینم!›"

خۆشەویست نەوەکانی زووزوو لەباوەش دەگرت و ماچی دەکردن و دەیفەرموو: "خودایە، من حەسەن و حوسەینم زۆر خۆش دەوێت تۆش خۆشت بوێن."

حەسەن و حوسەین هەم لەلایەن باپیریان، هەم باوکیانەوە ئامۆژگاریی ئاڵتوونی دەکران و ڕۆژ هەبوو بەیانییان زوو لەگەڵ دەنگی بولبولان و بیلالدا هەڵدەستان بۆ نوێژ و عەلی ماچی حەسەنی دەکرد و ئامۆژگاریی دەکرد: "کوڕەکەم، وەختێ بەلا و ناڕەحەتییەکان تەوژمت بۆ دێنن، وەک کێو بەهێز ڕابوەستە، هەرگیز پشتگیریی ستەمکار مەکە و ببە بە هێز و باڵی ستەملێکراو، هەموو ڕۆژێکی نوێی ژیان بە شەوق و تاسەوە بژی و توند دەست بگرە بە پەتی خوداوە و هەرگیز مەڕووخێ و سینەت بکە بە سەرچاوە و دەریای لێ هەڵبقوڵێنە."

"وەک باپیرم؟"

"بەڵێ، وەک ئەو، با نموونەت بۆ بهێنمەوە، تۆ دەزانیت ئاڵتوون بۆ وا بەنرخە؟"

"بۆچی؟"

"چوون توخمێکە بەرگەی ئاو و خاک و قوڕ و لیتە و باران و ئاگر و کاتیش دەگرێت. چەندین سەدە لەژێر گڵدا بمێنێتەوە، لە بیری تاریکدا فڕێ بدرێت، لەناو ئەگردا بتوێتەوە، پارچەپارچە بکرێت، هێشتا نرخ و درەوەشاوەیی لەدەست نادات و دەبێت بە خێروبەرەکەت و سەرچاوەی بزە بۆ خەڵکی و دەکرێت بە بازن و دەکرێتە مەچەکی بووک و پادشاکان لەسەر سەریان

هەڵی دەگرن، دەکرێت بە تەخت، دەکرێت بە تاج، بە دەوا... مرۆڤیش دەبێت وەک ئاڵتوون بێت، هەم ڕەق، هەم نەرم. نەرم بەرامبەر فرمانەکانی خودا و زوو بتوێتەوە. ڕەق و سەنگین بەرامبەر حەرامەکانی... دەبێت ئینسانیش وەک ئاڵتوون، تا زیاتر پارچەپارچە بکرێت و زیاتر پێیدا بکێشرێ و زیاتر لە چاوەڕوانیدا بهێڵرێتەوە، جوانتر و درەوشاوەتر و پتەوتر بێت و ئەو کات ئیدی وەک ئاڵتوون دەبێتە سەرچاوەی بزە و هێز بۆ مرۆڤ، گەلێ پێی دەگەن." عەلی باوکێکی دووربین بوو و منداڵەکانی بۆ داهاتوو ئامادە دەکرد و بەو جۆرە ئامۆژگاریی دەکردن و دەیگوت: "منداڵەکانتان بەپێی ئەو سەردەمە نا کە تێیدا دەژین، بەپێی ئەو سەردەمە پەروەردە بکەن کە ئەوان تێیدا دەژین." بینینی سەردەمی دوای خۆی تەنها لە کەسێکی نزیک پێغەمبەر دەوەشایەوە و بێ لێدان و ئازاردان و کەمکردنەوەیان بە 'قولی لین' 'وتەی نەرم'، تۆوی هەر ڕەفتارێکی بویستایە لە ڕۆحیاندا دەیچاند و دەیگوت: "منداڵ ئەمانەتە و کێڵگەیەکی بەتاڵە، هەرچیی تێدا بڕوێنی، ئەوەت دەداتێ." عەلی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا پەروەردەی دەکردن و وتەی جوانی دەڕشتە نێو ڕۆحی کوڕەکانی و دەیگوت: "کوڕم، ئایا دەزانیت گەورەترین تەنهایی ئەوەیە ئینسان غرووری هەبێت و خۆی لە هەمووان سەرووتر ببینێت!" بەم جۆرە فێری حەسەنی دەکرد با نەوەی موحەممەدی سەرداری ئەنبیاش بێت، با کوڕی فاتیمەی حۆریی سەرزەوی و عەلیی شێرەکەی خوداش بێت، بە غروور و خۆبەشتزانی ناگات بە هیچ و تەنها دەبێت.

حەسەن و براکەی بە پەروەردەیەکی لەم جۆرە ناسکدا تێپەڕیبوون، هەر بۆیە نە کەسیان بە کەم دەبینی، نە خۆیان بە زۆر و حەسەن زووزوو ئەو نزایەی دەکرد کە لە باپیریەوە فێر ببوو: "ئەی خودای گەورە، لە هیدایەتی خۆت بێبەشم نەکەیت و بمخەیتە ڕیزی ئەو بەندانەت کە بە دۆستی خۆتیان دەبینیت و هەرچیت پێ بەخشیوم بەرەکەتی تێ بخەیت و لە شەڕی ئەو شتانەش بمپارێزە کە حوکمت بەسەردا داون، چوون کەسێ دۆستی تۆ بێت، هەرگیز زەلیل نابێت."

## سفرەی خودایی

دڵتان با ماڵی سێ شت بێ:

ئیمان و هیوا و عەشق...

"حەزرەتی عەلی"

شەوەکان و ڕۆژەکان تێدەپەڕین و مانگ چەندین جار پڕ دەبوویەوە و هێشتا ئاگری نێو ماڵی نەبی خامۆش بوو و یەک دڵۆپ شۆرباشی تێدا لێنەدەنرا...

پێغەمبەر نە نانی هەبوو، نە خەو، نە پشوو، بەردەوام لە هەوڵی بڵاوکردنەوەی دینەکەی خودادا بوو.

ڕۆژێک برسێتی زۆری بۆهێنا و لە دەرگای ماڵی فاتیمەی کچی دا: "هیچ شتێکت هەیە بۆ خواردن بشێت کچەکەم! زۆرم برسییە..."

ماڵ هیچی تێدا نەبوو و فاتیمە شەرمەزار: "گیانم قوربانت بابە گیانم، ببەخشە ماڵەکەم هیچی تێدا نییە!"

شەرمەزاریی فاتیمە کزەی لە دڵی باوکی هێنا، ڕەنگی زەردی خۆی و منداڵەکانی دڵی پارەپارە کرد و بە دڵێکی پڕەوە دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و داوای ڕزقوڕۆزیی بۆ کردن و جوبریل هاتە حزوری و فەرمووی: "یا رسول

الله! سڵاوی خودام پێیە بۆت و داوای لێ کردووم ئالو بەیتی عەلی چییان دەوێت لە بەهەشتەوە بۆیان بهێنم. ئارەزووی چی دەکەن؟"

پێغەمبەر گوتەی جوبریلی لە ئەو ئاشکرا و لە ئەوان پەنهانی گەیاند و فاتیمە نوقمی شەرم و ڕێزێکی زۆر ببوو، بێدەنگ، هیچی نەدەگوت، عەلی بێدەنگ بوو، حەسەنەین بێدەنگ بوون و هیچکەس زاتی نەدەکرد بڵێت ئارەزووی چی دەکات لە ئاسمان بۆیان ئامادە بکرێت. تاکوو حوسەین بە پاکی و جوانییەکی منداڵانەوە گوتی: "دەتانەوێت من هەڵی بژێرم؟"

وەڵامیان دایەوە: "بێگومان! هەرچیی تۆ هەڵی بژێریت، خۆشبەختانە قبوڵمانە."

ڕێک لەو ساتەدا پێغەمبەر بۆ کارێکی گرنگ لە دەرەوە بانگ کرا. پاش ڕۆشتنی دراوسێیەک، دوو نان و پارچەیەک گۆشتی بۆ فاتیمە نارد، فاتیمە لەگەڵ ئەوەی خۆی برسیی بوو و عەلی برسی و حەسەنەین برسی، بەڵام خستنیە قاپێکەوە و سەرەکەی داپۆشی و گوتی: "سوێند بە خودا، فەزڵی پێغەمبەری خودا دەدەم بەسەر خۆم و منداڵەکانمدا"، پاشان باوکی بانگهێشت کرد بۆ نانخواردن.

ڕەسول گەیشت و فاتیمە بەدڵخۆشییەوە گوتی: "بابە گیان، خودا ڕۆزییەکی بۆ ناردووین و بۆم هەڵگرتوویت." دواتر سفرەی ڕاخست و نان و گۆشتەکەی لەسەر دانا و پاش چەند لەحزەیەک سەری سوورِ ما لەوەی بینیی. سەر سفرەکە پڕ بوو لە نان و گۆشت، ئەوەش ئاشکرا لە حورمەتی ڕەسول

ڕووی دابوو و هەر لە شەوی میعراجدا خودا موعجیزەی بەرەکەتی پێ بەخشیبوو، وەلێ خۆشەویست زەردەخەیەکی کرد و فەرمووی: "ئەمە لەکوێوە هات ئەی فاتیمە!"

"خودای گەورە ناردی بابە گیان! خودا هەرکێ بیەوێت، بێ حیساب ڕزقی نادات مەگەر!"

خۆشەویست پێکەنی و فەرمووی: "ئەی فاتیمە! سوپاس بۆ ئەو خودایەی تۆی وەک مەریەم بەرز ڕاگرتووە، چوون ئەویش هەرکات خودا ڕۆزییەکی بۆ دەنارد و دەیانپرسی لەکوێی بووە، دەیفەرموو: "لەلایەن خوداوە بۆم هاتووە و ئەو هەرکێ بیەوێت، بێ حساب ڕۆزیی دەدات."

خانەوادەی عەلی بۆ یەکەم جار دوای چەندین ڕۆژ نانێکی تێروتەسەلیان خوارد و هەمووان تێر بوون و سفرەکە دەتگوت هێشتا دەستی بۆ نەبراوە. هاوسەرانی پێغەمبەریشیان بانگ کرد و ئەوانیش تێریان لێ خوارد و لەگەڵ ئەوەی هەمووان تێر بوون، هێشتا سفرە وەک خۆی بوو و وەختێ فاتیمە بردی و دابەشی کرد بەسەر دراوسێکانیدا، جارێکی دیکەش بەرەکەتی نزای پێغەمبەری بینی...

## ملوانکەکەی فاتیمە

پێغەمبەری خۆشەویست و هاوەڵان نوێژی عەسریان کردبوو و حەڵقەی گوتاریان پێک هێنابوو و خۆشەویست قسەی بۆ دەکردن و ژیان وەک ئاو شیرین و بەهادار دەڕۆیشت بەڕێوە و گوێگرتن بۆ ئەو بە هیچ لەزەتێکی دیکەی دونیا نەدەگۆڕدرایەوە و لە هەر قسەیەکیدا ڕۆح و فیکری هەمووان دەیاندا لە شەقەی باڵ. لە کاتێکدا هەمووان سەرقاڵی نەخشاندنی وشەکانی نەبی بوون لەسەر دڵیان، گوێیان لە دەنگی پیرەژنێک بوو، ئاوڕیان دایەوە و دەبینن پیرەژنێکە جلەکانی بەری هەموو کون-کون ببوو و لە شەکەتی و ماندوویێتیدا خۆی بەپێوە ناگرێت. خۆشەویست دەستبەجێ چوو بەدەمیەوە و ژنەی بێچارە شەرمەزار لەئاست ئەو هەموو گەرموگوڕییەی نەبی گوتی: "ئەی نێردراوەکەی خودا! بیستوومە هەرکێ بێتە بەر قاپیت، دەستبەتاڵ ناگەڕێتەوە، هاتووم عەرزی حاڵمت بۆ بکەم." وشە لەرزۆکەکانی پیرەژن دڵی هەمووانی پارەپارە کرد و بەردەوام بوو: "حاڵم ئەمەیە! برسیم! هەژارم! پەرێشانم! هاتوومەتە بەر قاپییەکەت، پۆشاکم بدەرێ! تێرم بکە! دڵخۆشم بکە!"

خۆشەویست هەرچیی هەبوو دابووی بە خاوەن پێداویستیی

دیکە و هیچی لە دەستدا نەبوو و فەرمووی: "بەخێر بێیت بۆ قاپیم، لە ئێستادا هیچم نییە بتدەمێ، بەڵام ڕەوانەی لای کەسێکت دەکەم، چوون هەرکەس نێوەندگیری لە چاکەدا بکات، وەک ئەوە وایە خۆی کردبێتی، برۆ بۆ ماڵی کەسێ کە خودا و پێغەمبەری زۆر خۆش دەوێت و خودا و پێغەمبەرەکەشی ئەویان خۆش دەوێت. بچۆ بۆ ماڵی فاتیمە."

دواتر بیلالی بانگ کرد و داوای لێ کرد ژنەی بەتەمەن ببات بۆ ماڵی فاتیمە و بیلال لە پێشەوە و پیرەژنی شەکەت لە دواوە ڕێی ماڵی فاتیمەیان گرت و بیلال ماڵەکەی نیشان دا و جێی هیشت. پیرەژن لە دەرگاکەوە هاواری لە ژوورەوە کرد: "سڵاوتان لێ بێت ئەهلو بەیتی موحەممەد، ئەی ئەو ماڵەی فریشتان بەردەوام هاموشۆی دەکەن، ئەی ئەو ماڵەی جوبریلی فریشتەی بۆ دابەزیوە." فاتیمە خێرا بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت و سڵاوی لە پیرەژنەکە کرد و پرسیی کێیە و پیرەژن وەڵامی داوە: "پیرەژنێکی هەژار و نەدارم، کەمێک بەر لە ئێستا چوومە خزمەتی باوکت و ناردمی بۆ لای تۆ، جلم نییە و جلم دەوێت، برسیمە و نانم دەوێت، وەرە بەهانامەوە ئەی نوری چاوی نەبی، تا خوداش بێت بەهاناتەوە.»

فاتیمە بەرۆژوو بوو و سەیری هەرچیی کونوکەلەبەری ماڵەکەیە کردی و هیچی تێدا نەدۆزییەوە، لە کۆتاییدا بێچارە ئەو ڕاخەرەی حەسەن و حوسەین لەسەری نوستبوون، لەژێری دەر کردن و دای بە ژنە: "تەنها ئەم ڕاخەرەم هەیە بتدەمێ! هیوادارم بەکەڵکت بێت و خودا باشترت پێ ببەخشێت."

پیرەژنی کەمتەحەمول و برسی وەڵامی دایەوە: "ئەی کچەکەی ڕەسول، من پێت دەڵێم برسیمە و تۆ ڕاخەرم دەدەیتێ! ڕاخەر چی لێ بکەم، برسیمە من، برسی!"

فاتیمە غەمبار و بێچارە تەماشای ژنەکەی دەکرد و نەیدەزانی چۆن هاوکاریی بکات، تاکوو لەو نێوەندەدا دەستی بەر ملوانکە عەقیقەکەی ملی کەوت، کە دیاریی کچەکەی حەمزەی مامی شەهیدی بوو، لەسەرخۆ لە ملی داکەند و دایە دەستی پیرەژنەکە: "دەی کە وا بێ، ئەم ملوانکەیە ببە! بەڵکوو بیفرۆشی و جلوبەرگ و خۆراکیشی پێ بکڕیت."

"ئەم ملوانکەیە دیارییەکی زۆر گەورەیە بۆ کەسێکی وەک من بوودەڵە و ڕەشوڕووت!"

پیرەژنەکە ئەوەندەی گوت و موانکەکەی برد و بەرەو مزگەوت گەڕایەوە و هەرچیی ڕووی دابوو بۆ نەبی و هاوەڵانی گێڕایەوە و ڕەسول چاوەکانی پڕ بوون و عەماری کوڕی یاسر هەستایە سەر پێ و گوتی: "یا رسول اللە، گەر ئیزن بفەرموون، دەمەوێت من ئەو ملوانکەیەی لێ بکڕم."

"دەتوانیت بیکڕیت."

عەمار ڕووی کردە پیرەژنەکە و پرسیی: "دایە گیان، ملوانکەکە بە چەند دەفرۆشی؟"

"پیرەژنێکی وەک من چیی دەوێت لە دونیا! کەمێک نان و پارچەیەک گۆشت و عەبایەکی ڕێکوپێک نوێژی پێوە بکەم و ئەوەندە درهەم کە بتوانم پێی بگەڕێمەوە بۆ ناو کەسوکارم."

عەمار زۆر دەوڵەمەند نەبوو، بەڵام چەند ئاڵتوونێکی لە

غەنیمەتی جەنگ هەبوو و بێ دوودڵی وەڵامی دایەوە: "دەی کە وا بێ، ملوانکەکەت لێ دەکڕم و لەبەرامبەردا چل پارچە ئاڵتوون و دوو سەد درهەم و عەبایەکی یەمەنی و حوشترێک و بڕێک نان و گۆشتت دەدەمێ."

پیرەژن سەری سووڕما: "خودایە! چەندە پیاوێکی بەخشندەیت، هەر بەڕاستیتە!"

عەمار هەرچیی بەڵێنی دابوو بە پیرەژن، دایێ، پیرەژنەکە دوای ماوەیەک بەتێری و بە جلوبەرگی نوێوە هاتەوە بۆ مزگەوت و خۆشەویست فەرمووی: "دەبینم جلوبەرگی نوێ و پاکت لەبەردایە، ئەی سکت تێر کرد؟"

پیرەژن لەوپەری دڵخۆشی و ئارامیدا وەڵامی دایەوە: "دایک و باوکم فیدات بن، هەرچیم دەویست بەدەستم هێنا." پێغەمبەر وەڵامی دایەوە: "دەی کە وا بێ، چاکەی فاتیمە بدەرەوە."

پیرەژن دەستە چرچەکانی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان: "خودایە! تۆی تاکە پەرستراو و تاکە ڕۆزیدەر! یا ڕەب، وەک چۆن ئەو منی دڵخۆش کرد، لە قیامەتدا نیعمەتی وەهای پێ ببەخشیت، نە هیچ چاوێک بینیبێتی، نە هیچ گوێیەک بیستبێتی." خۆشەویست پاش ئەوەی ئامینی بۆ نزاکەی کرد، فەرمووی: "هەموو ئەو نزایانەی بۆ فاتیمەی کرد، خودا هەر لە دونیاشدا بە فاتیمەی بەخشیوە، چوون من باوکی فاتیمەم و لە هەموو دونیادا کەسی دیکەی وەک من نییە، عەلی هاوسەریەتی و گەر ئەو نەبووایە، هیچکەسێکی دیکە شاییستەی ئەو نەبوو و حەسەن و حوسەینی پێ بەخشیوە کە سەرکردەی گەنجانی

بەهەشتن، هەروەها کۆمەڵێک فریشتەشی بۆ فەراهەم کراوە کە بەردەوام پارێزگاریی لێ دەکەن."

عەمار چاو و دڵی پڕ بوو بە قسەکانی نەبی و ئەو ملوانەکەیەی کە بە مەبەستی گەڕاندنەوەی کڕیبووی، لە ئاوریشمێکی سەوزی پێچابوو و بۆنی میسکی لێ دابوو، دایە دەست سەهمی کۆیلەی و گوتی: "ئەمە بدە بە پێغەمبەری خودا و لەمڕۆ بەدواوە تۆش ئازادیت و پێشکەشی ئەوت دەکەم."

سەهم ملوانکەکەی دایە دەست ڕەسول و ڕەسول چاوەکانی پڕ بوون بەرامبەر ئەم ڕەفتارەی عەمر و فەرمووی: "ملوانکەکە ببە بۆ فاتیمە و خۆشت ئازادیت و پێشکەشی ئەوت دەکەم." سەهم بەهەڵەدەوان چوو بۆ ماڵی فاتیمە و بەهەناسەبڕکێوە گوتی: "ئەی کچەکەی ڕەسول، عەمری هاوەڵی پێغەمبەر ملوانکەکەت و منی پێشکەشی ڕەسول کرد و ئەویش هەردووکمانی پێشکەشی تۆ کرد." فاتیمە ملوانکەکەی لێ وەر گرت و وەڵامی دایەوە: "منیش لەبەر ڕەزامەندیی خودا ئازادت دەکەم ئەی سەهم! ئازادیت." سەهم وەخت بوو لە خۆشیدا باڵی دەگرت و لە خەتێکی باریکی نێوان دڵخۆشی و سەرسووڕماندا پێدەکەنی و قاقای لێدەدا و ئەوانەی دەیانبینی وایان دەزانی شێت بووە و چواردەوریان لێ دا و پرسییان: "چییە سەهم! چیتە، بۆ وا پێدەکەنیت!" سەهم، دوای ئەوەی هاتەوە سەر خۆی، وەڵامی دانەوە: "بە بەرەکەتی ئەم ملوانکەیە پێدەکەنم! لە ڕووکەشدا تەنها ملوانکەیەکی عەقیقە، بەڵام برسییەکی تێر کرد، ڕووتێکی داپۆشی، هەژارێکی

دەوڵەمەند کرد و کۆیلەیەکیشی ئازاد کرد و لە کۆتاییشدا گەڕایەوە دەستی خاوەنەکەی!"

ئەریٚ ئاوا بوو، زۆر جار ئەو چاکانەی دەکران، هەر لە دونیادا یەک بە هەزار پاداشتەکەیت وەر دەگرتەوە... ئەمە بوو نهێنیی بەخشین... فاتیمە زەردەخەنەیەکی کرد و سوپاسی ئەو خودایەی کرد کە کردوویەتی بە هۆکاری دڵخۆشیی بێسنووری سەهم و ملوانکە یادگارییە بەنرخەکەشی بۆ گەڕاندەوە...

## قەڵای غروور

«سَيَجْعَلُ اللَّهُ بَعْدَ عُسرٍ يسرًا»

«بێگومان پاش سەختی و تەنگانە، خودا خۆشی دێنی و دەرووی خێر دەکاتەوە»

سورەتی الطلاق/٧

ئەو ڕۆژانە ترۆپکی خۆشبەختیی موسڵمانان بوو و خۆشەویست لەگەڵ هەڵهاتنی خۆری هەر ڕۆژێکدا، مژدە و خۆشیی نوێی دەبیست. وەلێ زیادبوونی موسڵمانان بەم جۆرە و فراوانبوونی ئیسلام بێباوەڕانی گەلێ نارەحەت کردبوو و لەپاش ئەوەی لە جەنگی بەدر و ئوحوددا ئەوەی دەیانویست بەدەستیان نەهێنا، لە ئامادەکاریدا بوون بۆ جەنگی نوێ و سوێندیان خواردبوو کە لەپێش هەمووانەوە ڕەسول و تاکە موسڵمانێک بەسەر ڕووی زەوییەوە نەهێڵن و لەگەڵ هۆزی بەنوقورەیزەی یەهودی، کە لە سەردارانی مەدینە بوون، ژێربەژێر ڕێک کەوتبوون و سوپایەکی بەهێزیان پێک هێنابوو و بە چەک و زرێ و ئەسپ و حوشتری بەهێزەوە بەرەو مەدینە بەڕێ کەوتن و پەلامارێکی لەناکاو بوو و دەکرا هەرساتێک بگەن و پێغەمبەر هەواڵی هێرشەکەی پێ گەیشت.

ئەم هاتنەیان هاتنێکی جیاواز بوو، هەر بۆیە عەلی بەردەوام لە سەنگەردا و دەستەکانی فاتیمە لە ئاسماندا و موسڵمانان شەو تا بەیانی لە شەونوێژدا بوون و پاش کۆبوونەوەی دەستەی ڕاوێژکاری، لەسەر پێشنیاری سەلمان بڕیاریان دا خەندەقێک بەدەوری شاردا دروست بکەن و بەم جۆرە بێباوەڕان نەیاندەتوانی داخڵی شار ببن و بێدەرەنجام دەگەڕانەوە. هەمووان شەو و ڕۆژیان خستبوویە سەر یەک و سەرقاڵی هەڵکەندنی خەندەق بوون، پیاوان چاڵیان هەڵدەکەند و ژنان نان و ئاویان بۆ دەهێنان و پیاو و ژن و منداڵ بێوچان هەڵدەسووڕان و پاش نزیکی پازدە ڕۆژ، خەندەقەکە کۆتایی هات و دەنگی دەف و دەهۆڵی سوپای کافران لە دوورەوە بەگزی دەهات و بەنوقورەیزە لە ژوورەوە و سوپای مەککە لە دەرەوە بەنیاز بوون موسڵمانان تەفروتونا بکەن، بەڵام شتێکیان لەبیر کردبوو، هەرکێ خودا یاری بێت، ترسی لەناوچوونی نییە، ئایەتێک هەبوو نەیاندەویست ببیستن:

«أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ»

"مەگەر هەر خودا بەس نییە کە ئاگای لە عەبدی خۆی بێ؟" الزمر: ٣٦

ئەرێ، خودا کافییە بۆ بەندەکانی خۆی... دوژمن بەرەبەرە نزیک دەبوویەوە و لە کۆتاییدا گەیشتنە سەر سەریان و بە ئەسپە شاهانەکانیانەوە غاریان دەدا تا بە زووترین کات داخڵی مەدینە ببن، وەلێ کە نزیک بوونەوە، چی ببینن!

چاڵێکی قووڵ و گەورە بەدەوری شاردا هەڵکەنراوە و لەودیو چاڵەکەوە سوپای کافران و لەمدیوەوە موسڵمانان ڕووبەڕووی یەکدی وەستابوون. بێباوەڕوان لە پەستیدا ڕوخساریان مۆر هەڵگەڕابوو و نەیاندەزانی چۆن هێرش بکەن، سەرەتا دەستیان کرد بە تیرباران و عەمری سەرکردەی سوپای بێباوەڕان قاقای لێدەدا و هاواری دەکرد: "گەر ئازان، وەرنە بەرامبەرمان! ترسنۆکانە! خۆ بەحساب ئێوە شەهید دەبوون و دەچوونە بەهەشت! ئەوە چییە، لە ترساندا لەپشت ژنەکانتانەوە خۆتان حەشار داوە، کوا مەردێک بێتە بەرامبەرم دوو قسەی لەگەڵ بکەم!" عەلی بەرگەی قسەکانی عەمری نەدەگرت و لە جێی خۆی بەرز بوویەوە: "یا رسول اللە! ئیزن بفەرموون سنوورێک بۆ بێڕەوشتییەکانی دانێم!"

خۆشەویست هەرچیی دەکرد، دڵی نەدەهات، چوون دەیزانی هەرکێ بکەوێتە بەردەست عەمر، ملی دەپەڕێنێ و نەیدەویست هیچ هاوەڵێکی لەدەست بدات، عەمر کە سەرتاپا زرێی ئاسنی پۆشیبوو، بەردەوام بوو لە قسەکردن و لە کۆتاییدا عەلی لەسەر ئیزنی ڕەسول زرێ زەردەکەی پۆشی و شمشێری زولفیقاری لە کەمەر نا و بەرەو ڕووی ڕۆشت، وەختێ عەمر بینیی، قاقایەکێ لێدا: «ئەم منداڵەتان ناردووەتە بەرامبەرم!"

"باوکت دۆستم بوو! بڕۆ لا چۆ لە بەرچاوم عەلی، کەسێکی وەک خۆم بهێننە بەرامبەرم!"

ماڵ و موڵک و هێز وایان کردبوو عەمر لەنێو قەڵای غرووردا بژی و نەیدەزانی دونیا زۆری دیکەی وەک ئەوی

ناوەتە ژێر پێی... عەلی سوێندی خواردبوو لەو قەڵای غرووورە دای بگرێت و بەرامبەری وەستایەوە: "وەرە ئەی عەمرا! نزیک بەرەوە لێم، بە ئیزنی خودا سنوورت بۆ دادەنێم!" عەمر بە قاقا بێزارکەرەکانی و بە ئەسپەکەیەوە هێرشێکی کردە سەر عەلی و پەلاماری دا و شمشێرێکی بەهێزی لێ دا و زرێپۆشەکەی لە ناوەڕاستدا کرد بە دوو کەرتەوە و خەریک بوو شمشێری دووەمی لێ بدات، بەڵام عەلی وریایانە و بەپەلە خۆی نوشتاندەوە و شمشێرکی دا لە عەمر و لە ئەسپەکەی فڕێی دایە خوارەوە و عەمر نەیتوانی لە جێی خۆی بەرز بێتەوە و دەنگی دەف و دەهۆڵ و زوڕنا و شیعر و سرودی بەرەی بێباوەڕان بێدەنگ بوو و سوپای بێباوەڕان لەرزیان تێ کەوت...

لەدوای ئەوە جەنگ چەندین ڕۆژی خایاند و بێباوەڕان بە چەندین جۆر لە هەوڵی تێپەڕاندنی خەندەقەکە و داگیرکردنی مەدینەدا بوون و پەنایان بردە بەر چەندین فێڵ و تەڵەکە، بەڵام پلانی خودا لەپێش پلانی هەموانەوە بوو. تا لە کۆتاییدا گەردەلوولێکی بەهێز دەستی پێ کرد و پەرێشانی کردن و لە بەهێزیی گەردەلوولەکەدا ئەسپەکان دەیانحیلاند و حوشترەکان جێیان بە خۆیان نەدەگرت و چادر و دەفر و کاسەکان لە ئاسماندا دەفڕین و سەربازەکان چاویان پڕ ببوو لە لم و ماندوو و شەکەت سەریان کز کرد و ڕێی مەککەیان گرتەوە بەر و بەم جۆرە جەنابی حەق سەرکەوتنی بەخشی بە موسڵمانان و عەلیی قارەمانێتییەکەی مەزنی نیشان دا و پێغەمبەر خۆشحاڵ و

فاتیمە دڵخۆش و موسڵمانان کەیفخۆش بوون بەم دەرەنجامە. وەلێ لە ساتەکانی کۆتایی جەنگەکەدا تیرێک بەر قولەپێی عەلی کەوت و بە ئێسکەکەیدا چەقیبوو و لە ئازارێکی زۆردا بوو و هاوەڵان پێیان وا بوو ئەمە لەو تیرانەیە کە دەرهێنانی سەختە و حەکیمێکیان بۆ بانگ کرد و پاش وردبوونەوە لە برینەکە، حەکیم گوتی: "تیرەکە لەنێو ئێسکەکەدایە و برینەکەت زۆر قووڵە، دەتوانم دەری بکەم، وەلێ ئازاری زۆرزۆر دەبێت و بەرگەی ناگریت، دەبێت ئاوی چەند گیایەک بکوڵێنم و بتدەمێ تا لە هۆش خۆت بچیت، پاشان دەری بکەم." عەلیی حەیدەر وەڵامی دایەوە: "پێویست بە بێهۆشکردن ناکات، هەرکات وەستام بۆ نوێژ، تیرەکە دەر بکەن...! چوون من کە نوێژ دەکەم، ئاگام لە هیچی دیکە نامێنێت." زۆریان گوت، بەڵام عەلی لەسەر قسەی خۆی سوور بوو و هیچ چارەیان نەبوو و چاوەڕێیان کرد تا وەختی نوێژ هات. عەلی اللە اکبری کرد و بە هەموو بوونیەوە لە حزوری خودادا وەستا و نوقمی جیهانێکی هێندە قووڵ ببوو، هەرچیی ئازار و ناڵەیەتی بڕایەوە و حەکیم و هاوەڵان سەریان سووڕ مابوو بەرامبەر خۆڕاگری و بێناڵەیی... عەرش و عەرز نەفەسیان لە خۆیان بڕیبوو و تەماشای عەلییان دەکرد و نوێژێکی پڕ خشوع و ڕکوعێکی پڕ ڕێزی برد و وەختێ گەشتە سوجدە، تیریان لە قاچی دەر هێنا و نە ئاخێک، نە ئۆفێکیان لێ نەبیست و بەوپەڕی خشوعەوە بەردەوام بوو لە نوێژەکەی، چوون زەڕەیەک ئازاری پێ نەگەشت! ئەوە بوو جیاوازیی بەندایەتیی عەلی و ئێمە... هەر ئەوەندەش نا، عەلی

زۆر نموونـەی دیکـەی لـەو جۆرەی لێ بینرابـوو، بۆیـە پێغەمبـەر زووزوو ئاگاداری دەکـردەوە: "ئـەی عەلی! تۆ شـێرەکەی خودای، بەهێزی، بوێریت، نەترسـیت، وەلێ پشـت بە بەهێزیت مەبەسـتە و پشـت ببەسـتە بـە سـێبەری داری هیوای خودایـی..."

ئـەم وتـە بەنرخانـەی خۆشـەویست هەمیشـە لـە زەینی عەلیدا بـوون و ئـەوی جارێـک زۆر خـراپ پەلامـاری کافرێکـی دا کـە هێرشـی کردبوویـە سـەر و شمشـێرەکەی دەر کـرد و خسـتیە سـەر ملـی و پیـاوی کافـر لـەو کاتـەدا تـا هێـزی تیـا بـوو تفێکـی کـردە عەلـی، لـە کاتێکـدا ئـەو ڕەفتـارەی ئەوەنـدەی دی عەلیـی پەسـت و تـووڕە کـرد، بـەڵام شمشـێرەکەی دەسـتی فـڕێ دا، پیاوەکـە واقـی وڕ مـا و پرسـیی: "چـی بـوو؟ بۆچـی پەشـیمان بوویتـەوە لـە کوشـتنم؟"

"چوونکـە زۆر تـووڕە بـووم و دوای تفتێکردنەکـەت ئەوەنـدی دیکە تووڕە بووم و گەر بمکوشتیتایە، لە تووڕەییدا و لەبەر نەفسی خۆم دەمکوشـتی، نـەک لەبـەر خـودا! نەفسـم تێکەڵ بـە بابەتەکە بوو و دڵسـۆزییەکەی شـێواندم، بۆیە ناتکوژم، هەسـتە بڕۆ!"

پیاوەکـە بەسەرسـووڕمانەوە لـە جێی خـۆی هەسـتا و گوتـی: "ئێسـتا دڵنیـام کـە ئـەم دینـە دینـە ڕاسـتەکەیە! مـادەم دینەکەتـان هێنـدە پاکـە و بەرژوەندیـی تاکەکەسـیی تێـدا نییـە، ئـەوا منیـش موسـڵمان بـووم. "

ئەمـە بـوو عەلـی... ئـاوا بـوو شـێرەکەی خـودا... بۆیـە لـە پێشـینەکان و سـەردارانی جەنەتـی نەبـڕاوە بـوو...

# عەلیی فاتیحی خەیبەر

خەیبەر جێیەکی نیشتەجێبوون بوو لە باکووری مەدینە و لەسەر تەپۆلکەیەکی پتەو بوو، لەبەر ئەوەی لەسەر ڕێی شام بوو، خاوەن زەویی بەپیت و باخە خورمای زۆر بوو و جێی نیشتەجێبوونی یەهودییە دەوڵەمەندەکان بوو. قەڵایەکی هەبوو کە چەندی تیرهاوێژی بەتوانا پارێزگارییان لێ دەکرد، دانیشتووانی خەیبەر ئەو کەسانە بوون کە پەیمانی ئاشتیی مەدینەیان شێواند و بەردەوام موسڵمانانیان بێزار دەکرد و بەشوێن فێڵ و تەڵەکەوە بوون و بەردەوام بە مەبەستی لەناوبردنی موسڵمانان لەگەڵ بێباوەڕان ڕێک دەکەوتن و کۆتا جار کە هەوڵی کوشتنی پێغەمبەریان دا، موسڵمانان بڕیاریان دا کە تا ئەو جێیە بەس بێ و ڕووبەڕوویان ببنەوە، بە شمشێر و جەنگ لەگەڵیان بدوێن. عەلی لەدوای ئەو هەوڵە دەستبەجێ گەشتە حزوری ڕەسول و گوتی: "ئەمر بفەرمووون یا رسول اللە! ئەمر بفەرمووون با دوژمن پەرێشان بکەین." خۆشەویست ئیزنی فەرموو و لە ماوەیەکی کورتدا سوپایەک ئامادە کرا، کە لە هەزار و شەش سەد کەس پێک دەهات، کە دوو سەدیان ئەسپسوار بوون، هاوکات لەگەڵ بیست خانم و عەلی و فاتیمەدا

بەرەو خەیبەر بەڕێ کەوتن. بەدەم تەکبیرەوە ڕێیان دەکرد و پێغەمبەر نزای بڵاوبوونەوەی پەیامەکەی دەکرد بەسەر ڕووی زەویدا و دەیفەرموو: "خودایە، پەنا دەگرم بە تۆ لە خەمی داهاتوو و پەشیمانیی ڕابردوو و بێهێزی و تەمبەڵی و ڕەزیلی و ترسنۆکی و قەرز و ستەم و ستەمکاران!"

سوپای موسڵمانان بەدەم نزا و تەکبیرەوە گەیشتە خەیبەر و گەمارۆیان دا و ئەو شەوە لەوێ مانەوە و بەرەبەیان، وەختێ یەهودییەکان بەئاگا هاتن، دەبینن گەمارۆ دراون و بە ترس و لەرزەوە هاواریان دەکرد، " گەمارۆ دراوین!" شپرزە بوون و بەرەو نێو قەڵاکە ڕایان دەکرد بە هیوای ئەوەی پارێزراو بن لەوێ و وەختێ نەبی ئەو حاڵەی بینین، فەرمووی: "اللە اکبر! اللە اکبر!"

"خربت خیبر!"

"خەیبەر لەناو چوو!"

یەهودییەکان منداڵ و کەلوپەلیان بردە نێو قەڵاکانی دیکە و خۆیان لەنێو قەڵای نیتاتدا کۆ بوونەوە، کە بەهێزترینی قەڵاکانیان بوو و خۆشەویست کە ئەمەی پێشتر دەزانی، بارەگای لە بەردەم قەڵای نیتاتدا هەڵدابوو و جەنگێکی گەورە بەرپا بوو و بێڕەوشتییان گەشتبووە جێیەک، کە بەردبارانی هاوەڵێکیان کرد، کە لە ماندوویێتی و شەکەتیدا دانیشتبوو کەمێک بحەوێتەوە و لە جێی خۆیدا شەهیدیان کرد. جەنگکە ماوەی چەند ڕۆژێک بەردەوام بوو و ئاڵاکەی دەدایە دەست هەرکەسێک فەتحی قەڵاکەی بە نسیب نەدەبوو و ئەم جار

خۆشەویست دەمەوئێوارە هاوەڵانی کۆ کردەوە و فەرمووی: "بەیانی ئاڵاکە دەدەمە دەستی کەسێک کە خودا و پێغمبەری زۆر خۆش دەوێت و خودا و پێغەمبەریش ئەویان خۆش دەوێت و لەسەر دەستی ئەو خەیبەر فەتح دەکرێت." هەمووان کەوتنە مەراقێکی زۆرەوە و ئەو شەوەیان لەنێو ئەو مەراقەدا کردەوە، تۆ بڵێی کێ بێت؟ بەرەبەیان، لەگەڵ بانگی بەیانی، هەمووان هەستان و خۆشەویست داوای کرد ئاڵاکەی بۆ بهێنن، ئاڵەکەیان بۆ هێنا و هەمووی ئارەزووی ئەوەی دەکرد ئەو کەسەی ناوی دەهێنرێت خۆی بێت و خۆشەویست هەر چاوی دەگێڕا و لە کۆتاییدا فەرمووی: «عەلی لەکوێیە؟" هەمووان تەماشای ئەملاولای خۆیان دەکرد و کەس عەلیی نەبینی و لەدوای سۆراغکردن، تەماشا دەکەن عەلی لەنێو چادرەکەیدا لە حاڵێکی پەرێشاندا پاڵ کەوتووە و گەرما لێی داوە، بێهێز بووە و و چاوەکانی هێندە دەکزانەوە، نەیدەتوانی لە جێی خۆی بەرز بێتەوە و حاڵیان عەرزی ڕەسول کرد: "عەلی نەخۆشە!" "بانگی بکەن بۆم."

عەلی پەرێشان و لە ئازاردا لە چادرەکەی هاتە دەرەوە و چاوەکانی ئاوسابوون و سوور ببوونەوە و نەیدەتوانی بیانکاتەوە و خۆشەویست کە بینیی، زەردەخەنەیەکی کرد و بسم اللهی کرد و دەستی هێنا بەسەر چاوەکانیدا و لە خودا پاڕایەوە: "خودایە، دەردی سەرما و گەرما لەسەر عەلی بڕەوێنیتەوە." لە بەرەکەتی ئەم نزایەدا بوو کە لەو ڕۆژە بەدواوە عەلی نە بە گەرما ناڕەحەت دەبوو، نە بە سەرما و

لە هاویندا قەفتانی ئەستووری لەبەر دەکرد و ناڕەحەت نەبوو و لە زستاندا بە جلی تەنکەوە هەڵدەسووڕا و هەرگیز سەرمای نەدەبوو...

زۆری نەبرد، ئازاری چاوی عەلی ڕەوایەوە و وەختێ بەتەواوی هاتەوە سەر خۆی، خۆشەویست ئاڵاکەی دایە دەست و بە دەستەکانی خۆی زرێپۆشێکی بۆ لەبەر کرد و شمشێری زولفیقاری لە کەمەر بەست و فەرمووی: "بجەنگێ، نەترسیت! هەتا ئەو ساتەی خودا فەتحت بە نسیب دەکات بجەنگێ و نەکەی تەماشای دوای خۆت بکەیت و بوەستیت!" جوامێرەکەی عەرەب وەک شێر خۆی هەڵدایە مەیدانی جەنگ و وەڵامی دایەوە: "هیچ خەمت نەبێت یا رسول اللە، هەتا ئەو ساتەی خودا سەرکەوتنمان بە نسیب دەکات، دژیان دەجەنگێم!" گەورەترین سەرکردەی جیهان تاکتیکی جەنگی دەدا بە زاوەکەی و فەرمووی: "ئەی عەلیی شێرەکەی خودا، تا دەگەیتە قەڵاکەیان، هێواش و لەسەرخۆ بڕۆ و سەرەتا بانگهێشتیان بکە بۆ ناو ئیسلام و پێیان بڵێ گەر موسڵمان بن، ئەرکیان چییە، چوونکە وەڵاهی تەنها یەکێکیشیان موسڵمان ببێت، زۆر باشترە بۆت لەوەی چەندین حوشتر لەپێناوی خودادا قوربانی بکەیت."

عەلی ئاڵای سپیی هەڵگرت و پێشڕەویی سوپای کرد و لە بەردەم قەڵای نیتاتدا لەسەر قسەی ڕەسول ئاڵاکەی چەقاند و ڕۆشت بۆ لای سەرکردەکانی یەهود و دووبارە باسی ئیسلامی بۆ کردن و بانگهێشتی کردن بۆ ناو دینەکە، بەڵام

زۆر بەناشـرینی ڕەتیـان کـردەوە و مەرحەبـی سـەرکردەیان، کـە دوو زرێپۆشـی لەبـەردا بـوو و جەنگاوەرێکـی بەتوانـا بـوو، بەرامبـەر عەلـی وەسـتایەوە و گوتـی: "مـن ئـەو پیـاوەم کـە دڕندەترین شـێرم بە یەک شمشـێر داوە لـە زەوی، کێ دەتوانێ مـن ببەزێنـێ؟ کـێ دەتوانـێ خەیبـەرم لـە دەسـت دەر بـکات؟"

ئەمـە بانگهێشـتی مـەرگ بـوو مەرحـەب کـردی و داوای جەنگی دەکرد. عەلیی شـێری خـودا بـە ئـەو هێـزەی خـودا پێـی بەخشـیبوو، بڕیـاری تارومارکردنی سـوپای بێباوەڕانی دەر کرد و وەڵامـی دایـەوە: "مـن ئـەو کەسـەم دایکی بـە حەیـدەر بانگـی دەکات! لـە بوێریـدا بەهەیبەتتریـن شـێری دارسـتانم و ناهێڵـم بژین و لەسـەر زەوی ڕاتـان دەخـەم!" بە نـاوی خـودا شمشـێری زولفیقـاری دەر کـرد و شـەڕێکی یەکاویەکیـان لەگـەڵ مەرحـەد کـرد و بـە چەنـد شمشـێرێک دای لـە زەوی و هەڵنەسـتایەوە و پێغەمبـەر مژدەی دا بـە موسـڵمانان: "ئیدی فەتحی خەیبـەر زۆر ئاسـانترە."

ئاوازی تەکبیر و شـوکر تێکـەڵ بـوون و سـوپا ئەوەندی دی هێزی گەڕایـەوە بـەر و پەلامـاری سـوپای بێباوەڕانیـان دا و عەلی لـە پێشـی پێشـەوە و چاوەکانـی لـە فەتحی قەڵاکە زیاتر، هیچی نەدەبینـی. عەلـی لـە دەرگاکـە نزیـک بوویـەوە و قاپیـی قەڵاکـەی لـە جێی خۆی هەڵکەند و بـە ئـەو هێزەی خـودا پێی بەخشـیبوو، قاپیی ئاسـنین و قورسـی هەڵگرت و کردی بـە سـیپەر بۆ خـۆی و هەرکـێ دەیبینـی، چـاوی ئابڵـەق دەبـوو. یەهودییـەکان لـە ترسـاندا بـە ڕاسـت و چەپدا ڕایـان دەکرد و موسـڵمانان دەسـتیان

گرت بەسەر نەتات و هەرحەوت قەڵاکەی دیکەی خەیبەردا. یەهودییەکەیان ماڵ و موڵک و سەروەت و سامانیان لەدەست دا و هەمووی بووە غەنیمەتی جەنگ و موسڵمانان دەستیان بەسەردا گرت. بەو جۆرە مەحروم دەبوون لە هەموو شتێک، ئەوانەی لە جێی دین قینیان هەڵدەبژارد... جەنگ کۆتایی هات و خۆشەویست غەنیمەتی بەسەر هاوەڵاندا دابەش کرد لەگەڵ ئەوەی هەمووان لەبەر ڕەزامەندیی خودا لەوێ بوون، بەڵام بەو جۆرە پاداشتێکی بچووکی دونیاییش درانەوە و پاداشتی گەورە لەودونیا چاوەڕێیان بوو. خۆشەویستی دڵناسک ئەو بیست ئافرەتەشی بێبەش نەکرد کە بەشدار بوون لە تیمارکردنی برینداران و ئامادەکردنی خۆراک و ئاو و پێداویستیی جەنگاوەران و بەردی بەنرخ و ملوانکە و بازن و گوارەی ئەڵماسی پێ دان و بەو خۆشی و شادییەوە گەڕانەوە و عەلیی حەیدەر لە ڕێگا دەیگوت: "بە هاوکاریی پێغەمبەر گەیشتم بە نازونیعمەت و ڕەزامەندیی خودام بەدەست هێنا، لەوە زیاتر هیچم ناوێ و تاکە ئارەزووم ئەوەیە الله گیان لە بەهەشتدا لێم ڕازی بێت." لەوەبەدوا سەردەمێکی ئاسانتر بۆ موسڵمانان فەراهەم بوو. وەلێ فاتیمە و عەلی، لەگەڵ ئەوەی چەند پارچە زەوییەکیان وەک غەنیمەت وەر گرتبوو و ترخێکی زۆری هەبوو، بەڵام هیچ لە ژیانیان نەگۆڕا و نە پۆشاکی ئاوریشمیان دەپۆشی، نە مستیلە و بازنی ئەڵتوون و یەک پارچە کەلوپەلیان نەخستە سەر ئەو کەلوپەلانەی لە سەرەتای هاوسەرگیرییەوە کڕیبوویان و هەرچیی پارەیەک لە فرۆشتنی

ئەو زەوییانەوە بەدەستیان گەیشت، دایان بە هەژار و نەدار و لەپێناو زیاتر بڵاوبوونەوەی دیندا خەرجیان کرد. فاتیمە کچی خەدیجە بوو و سەرقاڵی بونیادنانی کۆشکی قیامەت بوو، نەک دونیا و عەلییش هیچ جیاوازییەکی نەبوو لەگەڵ ئەودا و لەسەر مستیلەکەی دەستی نووسیبووی: "الملک الله" "ماڵ و موڵک هیی خودایە.» عەلی و فاتیمە چاویان پڕ بوو و بەشوێن لەزەتی سێ ڕۆژەی دونیاوە نەبوون و دەیانزانی ژیان یەک جارە و لە گشت دەرفەتێکدا ماڵ و موڵکیان لەپێناو خاوەن جوانیدا دەبەخشی...

## حیكایەتی دەستبەنێک

«وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِنْهُمْ زَهْرَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَى»

"تۆ چاوەكانت مەبڕە ئەو نازونیعمەتانەی داومانە بە تاقم و دەستەیە لەوان (بێباوەڕان)، (چوونكە ئەوە) زینەت و جوانیی ئەم ژیانی دنیایە بۆ ئەوەیە تاقییان بكەینەوە تیایدا، دڵنیا بە ڕزقوڕۆزیی پەروەردگارت (لە دواڕۆژدا) چاكتر و بەردەوامترە."

سورەتی طه/١٣١

ڕۆژانی دوای فەتحی خەیبەر بوو و بە هۆی دەستكەوت و غەنیمەتەكانی جەنگەوە حاڵی موسڵمانان گەلێک باشتر ببوو. لەبەر ئەوەی هۆزی بەنی قەینوقەی یەهودی پەیمانیان شكاندبوو، لە مەدینە دەر كران و چەندین ماڵ و عەرزە بەتاڵ بوو و عەلی و فاتیمە لەبەر ئەوەی ئێستا دوو منداڵی دیكەشیان هەبوو، باریان كردە یەكێ لەو ماڵانە و ئەو ماڵەی پێشتر تێیدا دەژیان، كرا بە دیوەخانی پێشوازیی وەفد و میوان. پەیامی ئیسلام بەرەو دوورترین كون و قوژبنەكانی جیهان دەنێردرا و كۆتا پێغمبەر و هاوەڵان شەو و ڕۆژ لە ڕاكەڕاكدا بوون و

عەلی وەک هەمیشە لە ڕیزی پێشەوە و ماندووترینەکان بوو و فاتیمەش سەرقاڵی خانمان بوو و لە هەمان کاتدا کاروباری ناو ماڵ و منداڵیشی بەڕێ دەکرد.

وەختێ خۆشەویست و هاوەڵان بە مەبەستی بڵاو کردنەوەی دینی ئیسلام دەچوون بۆ گەشت، بەگشتی لە سەحەر و بەرەبەیاندا دەگەیشتنەوە مەدینە و خۆشەویست یەکەم شت سەرێکی لە ماڵی کچەکەی دەدا. فاتیمە هەواڵی گەڕانەوەی باوکی پێ گەیشتبوو و منداڵەکانی جوان شۆردبوو و بەسەرە قژی حەسەن و حوسەینی داهێنا و دواتریش پرچەکانی زەینەب و ئوموکەلسومی هۆنییەوە و بە مووررووی ڕەنگاوڕەنگی جوان ڕازاندیەوە و بۆنی خۆشی لێ دان. خۆشەویست گەیشتە ماڵی کچەکەی و نەوەکانی بەرەو ڕووی ڕایان کرد و بۆنی خۆشی نەوەکانی و عەمبەر و میسکی باپیر تێکەڵ بەیەک بوون و وەختێ ویستی بچێتە ژوورەوە، پەردەیەکی نەخشداری ئاوریشمی بینی بە دەرگاکەوە هەڵواسراوە و لەگەڵ بینینی ئەوەدا گەڕایەوە و نەچوویە ژوورەوە. فاتیمە هەرچیی دەکرد، نەیدەزانی بۆچی باوکی گەڕاوەتەوە و لە خەم و دڵتەنگیدا وەخت بوو دڵی دەتەقی و کاتێ ئێوارە عەلی هاتەوە ماڵەوە، هەستی بە دڵتەنگی و مەنگیی فاتیمە کرد و بە دەنگێکی پڕ موحیببەت و گەرمەوە پرسیی: "چیتە؟ بۆچی وا دڵتەنگی؟" فاتیمە بە ڕوویەکی کوژاوەوە وەڵامی دایەوە: "یا عەلی! ئەمڕۆ ڕەسول الله هات بۆ ماڵمان، بەڵام پێش ئەوەی بێتە ژوورەوە، گەڕایەوە!" عەلی دڵنیا بوو لەوەی خۆشەویست دڵی لە شتێک

ڕەنجاوە، بەڵام نەیویست وا بە فاتیمە بڵێت و دەستبەجێ لە ماڵ دەر چوو و چوویە حزوری ڕەسول: "دایک و باوک و گیانی شیرینم فیدات بێ یا رسول الله! ئەمڕۆ هاتوویت بۆ ماڵمان، وەلێ پێش ئەوەی بێیتە ژوورەوە، گەڕاویتەوە، فاتیمە گەلێ دڵتەنگە، چ کەموکووڕییەکمان هەبووە؟"

خۆشەویست بە تۆنێکی گلەییئامێزەوە وەڵامی دایەوە: "پەردەیەکی ئاوریشمی نەخشدارم دی بە دەرگای ماڵەکەتانەوە ئەی عەلی! من چ کارم بە دونیا و پەردەی نەخشدارە؟"

عەلی لە حاڵ و مەسەلەکە حاڵی بوو و گەڕایەوە و هۆکاری گەڕانەوەی ڕەسولی بۆ فاتیمە باس کرد. پەردەکە بەدیاری هاتبوو بۆ فاتیمە و نەیدەزانی چیی لێ بکات و گوتی: "چیی لێ بکەم، نازانم؟"

"باوکت فەرمووی با بیداتە کەسێکی موحتاج." فاتیمە دەستبەجێ پەردەکەی لێکردەوە و دایە دەست عەلی و کردیان بە دیاریی ماڵێکی هەژار و ژنەی خاوەن ماڵ زۆر خۆشبەختانە وەری گرت و پارچەپارچەی کرد و کردی بە کراس بۆ کچەکانی و هەم ئەوان، هەم فاتیمە ئێستا دڵخۆش بوون و بەو جۆرە ماڵەکەی بوویەوە بە سادەترین ماڵی مەدینە و ئیدی ئەو خانمانەی بۆ پرسیاری دینی و فێربوون دەهاتنە ماڵەکەی، بە نموونەی خراپ وەریان نەدەگرت.

ڕەسول دەمێک لە مزگەوت و دەمێک لەگەڵ میوان و دەمێک لە گەشت و دەمێک لە حوزوری جوبریلدا بوو و لەو وەختە کەمەی دەمایەوە و لای خێزانەکانی بوو، ئافرەتان بۆ

وەرگتنی وەڵامی پرسیارەکانیان سەردانیان دەکرد. جارێک فاتیمەی کچی حوبەیرە، کە خانمە هاوەڵێک بوو، بۆ کارێک سەردانی ڕەسولی کرد و چەند مستیلەیەکی گەورەی ئاڵتوون و چەند بازنێکی ئەستووری لەدەستدا بوو و خۆشەویست نارەحەت بوو کە ئەمەی بینی و هاوەڵە ژنەکە کە هەستی بەمە کرد، دەستبەجێ چوویە خزمەتی کچەکەی ڕەسول و لەلای ئەو نارەحەتیی ڕەسولی بە خشڵەکان باس کرد فاتیمەش دەستبەجێ بازنەکانی دەستی دەر کرد و دەستی برد بۆ زنجیرەکەی ملی و ئەویشی لێکردەوە و گوتی: "هەرچەندە ئەمە دیاریی عەلییە! بەڵام دەیبەخشم." زنجیرەکە هێشتا لەدەستی فاتیمەدا بوو وەختێ ڕەسول هاتە ژوورەوە و فەرمووی: "ئەی فاتیمە! حەزت دەکرد خەڵکی بڵێن کچەکەی ڕەسول زنجیرێکی ئاگرینی بە دەستەوەیە؟" فاتیمە زنجیرەکەی ناردە بازاڕ و فرۆشتی و بە پارەکەی کۆیلەیەکی کڕی و ئازادی کرد و خۆشەویست کە ئەمەی بیست، فەرمووی: "سوپاس بۆ ئەو خودایەی فاتیمەی لە ئاگر ڕزگار کرد." دواتر بە سەوبانی هاوەڵی گوت ملوانکەیەکی لە قوماشی یەمەنی نەخشێنراو و دوو دەستبەنی لە عاجی فیل دروستکراو بۆ فاتیمە بکڕێت و فەرمووی: "ئەمانە ئەهلی بەیتی منن! حەز ناکەم ئارەزووەکانیان لە ژیانی دونیادا بەفیڕۆ بدەن."

ئەم ڕووداوە جارێکی دی فاتیمەی لەرزاند و سوپاسی خودای کرد کە نەکەوتە نێو تەڵەکەی نەفسی بەدکار، هەڵبەت کە ئاڵتوون حەرام نەبوو بۆ خانمان و بگرە زینە و جوانییش

بوو، بەڵام ئەو کچی پێغەمبەر بوو و ویژدانی قبوڵی نەدەکرد لە کاتێکدا نیوەی ئومەت دەناڵێنن، ئەو دەستبەنی ئاڵتوون لەدەست بکات. ئینسان دەبووایە بە جۆرێ بژی، فیترەتی قەدیم نەشێوێنێ و دەماری ئیرەیی کەس نەجووڵێنێ و سادە، وەلێ گونجاو بە بارودۆخیش بژی...



# بەشی شەشەم

## «صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ»

«ڕێی ئەوانەی چاکەی خۆت بەسەردا ڕشتن، نەک ڕێی ئەوانەی بەر تووڕەیی کەوتن و نە ڕێی ونبووەکان.»

فاتیحە/٧

## عەشق جوانترین گوفتار بوو

ئـەوان پێش هاوسـەرگیری هێنـدە لەگـەڵ یەکـدا نەببـوون ئەزبـەری یەکدی بکـەن، هـەر بۆیـە ئێسـتا نوقمـی نهێنیی قەدیمی یەکدیناسـین و دەسـتبۆنەبراوی یەکـدی ببـوون، هـەر سـات و هـەر لەحزەیـەک نوقمـی زیاتـر شـارەزابوونی کونوکەلەبەرەکانـی یەکدی دەبـوون، بـەڵام بـە حەڵاڵـی و ڕێپێـدراوی...

ئـەوەی کـە کـەم دەدوان و زۆر گوێیـان بـۆ یەکدی دەگـرت، گشـت سـاتێکی ژیانـی مانادارتـر کردبوون، هەرگیز ئاگایانە دڵی یەکیـان نەدەشـکاند و پێیـان بـە دەمـاری توورەیـی یەکدیدا نەدەنا، هـەر بۆیـە ماڵیـان باخـی حـوزور و سـەرچاوەی خۆشەویسـتی بـوو. لای هەمـووان ڕوون بـوو کـە بەشـێکی زۆری بوێـری و سـەرکەوتووی عەلی خۆشبەختی و ئارامیی نێو ماڵەکەی بوو و ئـەوە یاسـایەکی ئینسـانی بـوو ئـەو ڕۆحـەی لـە ماڵـەوە سـکونەتی نەبـوو و ئـەو دڵـەی لـە ماڵـەوە دەسـت بەسـەریدا نەدەهێنـرا، لـە دەرەوە کز و کوژاوە و بێهێـز دەبـوو...

بـادەی دڵـی عەلـی بـوو فاتیمـە، شـنەبای فێنککـەرەوەی فاتیمـە بـوو عەلـی...

بەیانیی ڕۆژێکی ئارامبەخشی مەدینە، خۆشەویست و عەلی بەیەکەوە دانیشتبوون و ڕەسول پرسیارێکی لە عەلی کرد: "یا عەلی، تۆ خودات خۆش دەوێت؟"

"هەڵبەت خۆشم دەوێت،" عەلی وەڵامی دابوویەوە.

"ئەی پێغەمبەرەکەیشت خۆش دەوێت؟"

عەلی سەری سووڕ مابوو، ئەم پرسیارانە چین نەبی دەیانکات، مەگەر گومانی هەیە لە خۆشەویستی عەلی!

"بەڵێ یا رسول الله."

"ئەی فاتیمەشت خۆش دەوێت؟"

"بێگومان یا رسول الله."

"حەسەن و حوسەین ئەی؟"

"بەدڵنیاییەوە زۆرم خۆش دەوێن یا رسول الله."

پێغەمبەر زەردەخەنەیەکی کرد: "ئەی عەلی، چۆن پێنج خۆشەویست لە یەک دڵدا جێی دەبێتەوە...؟"

عەلی هەرچیی کرد، وەڵامی ئەو پرسیارەی بۆ نەدرایەوە، گەرچی دەرگای عیلم و زانست بوو! وەلێ وەڵامی پرسیارێکی لەو جۆرە سادەی بۆ نەدرایەوە و لەژێریا مایەوە و ئیزنی لە حەبیب وەر گرت: "ئیزن بفەرموون، دەبێت زۆر قووڵ بیر لە وەڵامی ئەو پرسیارە بکەمەوە."

کاتێ ئێوارە هاتەماڵەوە، فاتیمە هەستی بە مەنگی و ماتییەکەی کرد، بێدەنگ بوو، بیری دەکردەوە، خەیاڵی دەڕۆشت و فاتیمە بە موحیببەتەوە لێی نزیک بوویەوە و پرسیی: "مات و بێدەنگ دەتبینم، چییە وا دڵی ماندوو کردووی خۆشەویست؟"

عەلی باسی پرسیارەکەی ڕەسول و بێوەلامیی خۆی بۆ کرد، فاتیمە زەردەخەنەیەکی کرد: "قەیدی چییە دڵ یەک و خۆشەویست پێنج بێت گیانی من! دڵ ئاڕاستەی هەیە و هەر ئاڕاستەیەکی تیشکی خۆشەویستییەکی جیاواز دەداتەوە، بە باوکمت بگوتایە، یا رسول الله، من خودام بە زەین و ڕۆحم خۆش دەوێت و پێغەمبەر بە دڵم و هاوسەرم بە نەفەسم و حەسەن و حوسەینیش بە میهرەبانیم!"

عەلی لە وەڵامەکەی فاتیمەوە تەماشای گشت جیهانی کرد، لە ناوچاوی فاتیمەدا گوڵی بەهەشتی دەبینی خونچەیان دەکرد و قوم-قوم لە ئاوی کەوسەری چاوەکانی دەخواردەوە و فاتیمە بەردەوام بوو: "عەشق پیت-پیت ناکرێت ئەی عەلی! عەشق شەوی تاری نییە، عەشق پارچەپارچە ناکرێت و عەشق بێکۆتایە و ئەوانەی لە خاڵی جووڵەی عەشقدا بەیەک دەگەن، هەر وا ئاسان لەیەک دانابڕێن. عەشق دۆزینەوەی خودا و بە خاتری ئەو خۆشویستنی ئەوانی دییە. عەشق لە نەبوونیدا باڵ و لە هیچدا هەموو و سەرچاوەی هێزی دڵە. ئەوانەی عەشق ناچەژن، لە ئاوی تەنکی دونیادا دێن و دەچن." عەلی بەم وەڵامەی فاتیمە سوکنایی هات و بێدەنگییەکی شیرین کەوتە نێوانیان و تەماشایەکی یەکدییان کرد، ئای لە بێدەنگی، کە تێکەڵ بە عەشق و خۆشەویستی و نیگا دەبوو، چەنێ جوان بوو...

عەلی بەو نەفەسەوە هەستایە سەر پێ و ڕۆیشتەوە بۆ لای ڕەسول: "سڵاو لە جوانیت ئەی نەبی، خۆشەویستیی نێو دڵ و فیکرە ئاڵۆزەکانم کۆ کردووەتەوە و هاتوومەتەوە خزمەتت."

"دڵ چەند ئاڕاستەیەکی هەیە، لای ڕاست و چەپ و پێش و پشت و چەندین جێی دیکەی هەیە، من خودام بە فیکر و ئیمانم خۆش دەوێت، ئێوەم بە ئیمان و ڕۆح، فاتیمە بە نەفەسم و حەسەن و حوسەینش بە هەستی باوکایەتیم." خۆشەویست زەردەخەنەیەکی کرد: "ئەی عەلی، ئەم وتانەت گوڵن و لە داری پێغەمبەرایەتی لێکراونەتەوە، میوەن بە لقەکانیەوە پێگەیشتوون."

عەلی ئاسوودە و ئارام خۆشەویستی جێ هێشت و لە گشت جێیەک، تەنانەت لە ئاوازی نێو بای مەدینەشدا هەستی بە عەشق و بوونی فاتیمە دەکرد و بیری لە وتەکانی دەکردەوە: "مەرکەزی جووڵەی عەشق موحەممەدی موستەفایە و کەون لە حورمەتی ئەو خاڵەدا دەسووڕێت. یەک سات نوری ئەو بکوژێنرێتەوە، دونیا دەبێت بە تاریکستان و ئاو زویر دەبێ و گوڵ دەژاکێ و ڕووناکی بزە ناکا و خۆر دەکوژێتەوە و هیچ شتێ چێژی نامێنێ. گەر فرمێسکی عاشقان نەبێت، دونیا دەبێتە بیابان و پەڕەی ڕەنگاوەڕەنگی گوڵان دەبنە خەڵووز."

عەشق لە دڵی هەرکەسێکدا ئەو نەناسێت، گوڵێکی ئاگرینە، نە دەخورێتەوە و نە تف دەکرێتەوە، گەر زەڕەیەک لە عەشق بکەوێتە سەر ڕووی زەوی، دونیا دەسووتێ. ئێمە عاشقی سێبەری سێبەرەکەی ئەو زەڕەیەین...

هێندەی ژمارەی فرمێسکی عاشقان و گەڵای دارەکان و گوڵ و خونچەکان و پەپوولەکان و باڵندەکان سڵاوت لێ بێت ئەی سوڵتانی عەشق! سڵاو لە گیانی پاکت یا حبیب الله، ئێمە عەشق و ژیان و بوونیش لە تۆوە فێر بووین ئەی خۆشەویست...



## حیکایەتی هەنارێک

فاتیمە خانە و فاتیمە دانە و فاتیمە وا نەبوو... فاتیمە دایک و فاتیمە تۆو و فاتیمە لقوپۆپ و خونچە بوو... فاتیمە تایبەترین میوەی نوری موحەممەد بوو و... خۆشەویستییەکەی لەنێو دڵی عەلیدا ڕۆژبەڕۆژ زیادی دەکرد و فاتیمە لەنێو عەلیدا شێوەی ئاسمانێکی پان و بەرین و بێسنووری وەر گرتبوو. عەلی بەرگەی یەک ساتیش کزی و لاوازی و دڵتەنگیی نەدەگرت و دیسان فاتیمە ماندوو و شەکەت و نەخۆش بوو، تایەکی بەرزی هەبوو و وڕێنەی دەکرد. عەلی لەتەنیشتیدا ڕاکشابوو و تەماشای برژانگە درێژە ڕەشەکانی و کوڵمە سوورهەڵگەڕاوەکانی دەکرد و دەیویست فاتیمە داوای شتێکی لێ بکات و بۆی بهێنێت، وەلێ لە ماوەی نۆ ساڵی هاوسەرگیرییاندا فاتیمە هەرگیز داوای هیچی لێ نەکردبوو و نەیویستبوو لە نەبوونی و نەداریدا شەرمەزاری بکات و بیکاتە حاڵێکی ناخۆشەوە. بەڵام عەلی ئەم جارە سوور بوو: "ئەوەندە ساڵە هاوسەرین، تا ئێستا داوای هیچت لێ نەکردووم ئەی فاتیمە، بۆ جارێکیش بێت ئەو هەستەم پێ ببەخشە، ئارەزووی چی دەکەیت بۆت بێنم؟" زەهرا نەیویست دڵی عەلی بشکێنێ و بە نازێکەوە، کە تەنها

یار بەسەر یاریدا دەکات، گوتی: "هەنار هەبووایە، ڕەنگە ئەم تایەی دابەزاندمایە و باش ببوومایە، بەڵام بەم وەرزە لەکوێ هەنارم بۆ دێنی؟" بە هیچ جۆرێ وەرزی هەنار نەبوو، بەڵام عەلی بەو زانینەوە ڕێی بازاڕی گرت و بە بەقاڵەکانی گوت: "نەخۆشێکم هەیە داوای هەنار دەکات، لە هەرکوێ دەستم بکەوێت، نرخی چەند بێت، دوو ئەوەندە دەدەم، بەس بۆم پەیدا بکەن!"

هەمووان بە یەک دەنگ وەڵامیان دایەوە: "وەرزی هەنار دەمێکە بەسەر چووە، لەکوێ پەیدای بکەین!"

گەنجێک لە پشتەوە هاواری کرد: "ئەو ماوەیەی پێشوو شەمعونی یەهودی لە تائیفەوە هەناری بۆ هات، بڕۆ بپرسە بەڵکوو ئەو لای مابێت."

عەلی دەستبەجێ چوو بۆ لای شەمعون: "بیستوومە لە تائیفەوە هەنارت بۆ هاتووە، گەر تکا بکەم دانەیەکم دەدەیتێ بۆ نەخۆشەکەم! نرخی هەرچەندە، چەند ئەوەندەت دەدەمێ."

"ڕاستە لە تائیفەوە هەنارم بۆهات، وەلێ منداڵەکان هەر زوو تەواویان کرد." ژنەکەی شەمعوون لە پشتەوە هەڵی دایە: "یەک دانەم بۆ خۆم هەڵگرتبوو، مادەم نەخۆشی هەیە، با بیدەینێ." هەنارەکەیان دایە و عەلی پارەکەی دا و خۆشبەختانە بەرەو ماڵەوە دەڕۆیشتەوە و لە ڕێگا پیاوێکی پیری بینی بەدەم خۆیەوە وڕێنەی دەکرد و دیار بوو زۆر نەخۆش و ناساغ بوو، عەلی لە بەردەمیدا چۆکی دادا و پرسیی: "چیتە! پێم بڵێ با چارەت بۆ بدۆزمەوە."

پیرەمێردەکە بە دوو چاوی کوژاوە وماندووەوە تەماشای کرد و دڵخۆش بوو بە بینینی عەلی و گوتی: "پێنج ڕۆژە لەم حاڵەدام! نەخۆش و دەردەدار و ناساغم، تایەکی بەرزم هەیە، خۆزگە هەنارێکم دەست دەکەوت!"

ئای لەو ڕێکەوتە سەیرە! چەندین ساڵە فاتیمە داوای یەک هەناری لێ کردووە و ئێستاش ئەم پیاوە ئەو هەنارەی دەوێ! نەیدەزانی چی بکات، هەنارەکەی بدایە بە پیرەپیاو، بە دەستی بەتاڵ دەگەڕایەوە لای فاتیمە گیانی و بیبردایە بۆ ئەو، ئەم پیرەمێردە ئاوا پەرێشان دەبوو، ئایەتێکی سورەتی الضحی هاتە فیکری: وَأَمَّا السَّائِلَ فَلَا تَنْهَرْ (هەڵمەشاخێ بە هەژار و داماو و سواڵکەراندا.) بێ دوودڵی هەنارەکەی دەستی دایە پیرەپیاوەکە و گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و شەرمەزار و بێدەنگ سڵاوی لە فاتیمە کرد و فاتیمە بەزەردەخەنەوە تەماشای دەکرد و لەو ژنە نەخۆشە نەدەچوو کە جێی هێشتبوو و تایەکەی نەمابوو و بەخێرهاتنەوەی عەلیی کرد. عەلی ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە و دەیزانی فاتیمە ئەهلی بەخششە و لێی تێدەگات: "چاکت کردووە! سوێند بە خودا نە حەز، نە ئارەزووی هەنار لە دڵمدا نەماوە و دەڵێی خواردوومە!" عەلی دەبارە عاشقی فاتیمە بوو و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "فاتیمە چەند لە هەنار دەچیت! لە دەرەوە بوونێکی بێدەنگ و مەنگ، لە ناوەوە پڕ لە هەزار زەردەخەنە و جوانی و ئاهەنگ، وەک هەنار ڕەنگدار و بۆندار و شیفابەخشە فاتیمە، هەر زەڕەیەکی وەک دەنکی هەنار دەوایە و وەک هەنار لە ڕووکەشدا یەک

و لە ناوەوە هەزارانە فاتیمە." عەلی لەدوای پێغەمبەر کەسی دیکەی نەدیبوو ئەوەندەی فاتیمە بە بەخشین تێر ببێت و لەم بیرکردنەوانەدا بوو لە تەقەی دەرگا درا: "کێیە ئەوە؟"

"سەلمانی فارسیم، دەرگاکە بکەرەوە ئەی عەلی."

زاوەکەی ڕەسول دەرگای کردەوە و سەلمان بە سەبەتەیەکی داپۆشراوەوە لە بەردەمیدا وەستابوو: "بەخێر بێیت، خۆشیت هێنا ئەی سەلمان، ئەمە چییە؟"

"ڕەسولەڵڵا بۆی ناردوون."

عەلی سەبەتەکەی هەڵدایەوە و دەبینێ نۆ هەناری ئاڵ بەرەو ڕووی پێدەکەنن و بەزەردەخەنەوە گوتی: "ئەی سەلمان، خودای گەورە یەک بە دە پاداشتی بەخشش دەداتەوە و ئەمە یەک بە نۆیە." سەلمان پێکەنی و ئەو هەنارەی شاردبوویەوە خستیە نێو سەبەتەکە و گوتی: «دیسان بردتەوە ئەی عەلی! سەبەتەکە دە هەناری تێدا بوو و بۆ ئەوەی تاقیت بکەمەوە، دانەیەکیانم شاردەوە و دیسان بۆم دەر کەوتەوە کە هیچت لێ ناشاردرێتەوە!"

هەردووک پێکەنین و سەلمان ماڵئاوایی لێ کردن و فاتیمە و عەلی چاویان کەوتە سەر یەک و دەستیان کرد بە پێکەنین...

## وەک خاک پڕ نهێنی بوو عەلی

«خۆشەویست تا دڵی خۆشەویستەکەی
نەهێنێتەوە، ئاویش ناخواتەوە...»
"حەزرەتی فاتیمە"

عەلی تازەکی لە گەشت هاتبوویەوە و ماندوو و شەکەت گەڕابوویە ماڵەوە و لەگەڵ فاتیمەدا سووکە موناقەشەیەکیان ببوو. ئەوان دڵڕەنجانەکانیشیان لە خەڵکی جیاواز بوو و عەلی بۆ ئەوەی دڵی فاتیمە ئازار نەدات، لە ماڵ ڕۆشتبوو و خۆشەویست وەک خووی ڕۆژانەی سەردانی کچەکەی کردبوو و کە عەلیی نەدیبوو، لە فاتیمەی پرسیبوو: "عەلی لەکوێیە؟"

فاتیمە زۆر دڵتەنگ بوو و نەیدەزانی چۆن ڕوونی بکاتەوە و گوتی: "دەنگەدەنگێکی بچووکمان بوو و عەلی لەگەڵ ئەوەی زۆر ماندوو بوو، سەرخەوی نیوەڕوانی نەشکاند و لە ماڵ دەر چوو، نازانم لەکوێیە."

دڵشکاندنی یەکدی شتێکی نامۆ بوو بەوان و هەرگیز پێی ڕانەهاتبوون و خۆشەویست چوویە دەرەوە بەشوێن زاواکەیدا بگەڕێ و لە ڕێگا سەهلی بینی: "عەلیت نەبینیوە ئەی سەهل؟"

"بەڵێ، لە مزگەوت بینیم یا رسول الله، لە سووچێکدا پاڵ کەوتبوو."

پێغەمبەر چوو بۆ مزگەوت و بینیی لە سووچێکدا ڕاکشاوە و عەباکەی لە شانی کەوتووەتە خوارەوە و پرچەکانی ئاڵۆزکاوە و لەسەر خۆڵەکە خەوی لێ کەوتووە. خۆشەویست تەماشای دەکرد و چاوەکانی پڕ بوون بۆی و وا ڕاکشابوو، وەک ئەوەی بڵێت، "دەبێت پێش ئەوەی بمرین، بچینەوە ئامێزی خاک!"

ئەوانەی دەیانناسی ئەم خووەیان دەزانی، عەلی کە تووڕە دەبوو، دەچوو لەسەر خاک و قوڕ ڕادەکشا. دەیزانی قوڕ لە هەموو شتێ زیاتر نارەحەتیی ئینسان هەڵدەمژێ، لە هەموو کەس زیاتر نهێنیی ئینسان دەپارێزێ. ئینسان بۆ ئەوەی خۆی لا بچووک ببێتەوە و ببێتەوە بە هیچ، دەبووایە زووزوو پەیوەندیی لەگەڵ قوڕدا تازە بکاتەوە. ئای کە لە خاک دەچوو عەلی، بەڕووکەش ئەسمەر و سەرسەخت و جەنگاوەر، لە ناوەوە وەک پەموو نەرمونیان. عەلی بۆنی خاکی لێ دەهات، عەلی وەک خاک خاکی بوو... عەلی هەرکات نارەحەت و دەردەدار و دڵتەنگ دەبوو، دەچوویەوە ئامێزی خاک، وەک بڵێی لەنێوان عەلی و خاکدا پەردەیەکی ڕوون هەبێت و ئەودیو بوونی لێوە ببینێت و بە نهێنییەکانی بوون گەیشتبێت. عەلی ئەمجارەش هەوڵیدابوو بە ئامێزکردن بە خاکدا خەمەکانی لەبیربکات و خەویلێکەوتبوو. خۆشەویست نوشتایەوە و خۆڵی سەر جلوبەرگەکەی عەلیی تەکاند و فەرمووی: "قم یا ابا تراب!" "هەستە ئەی باوکی خۆڵ!"

عەلی لەگەڵ بیستنی ئەو دەنگە ئاشنایە بە ڕۆحی لە خەو ڕابوو و خۆشەویست داوای لێ کرد لەگەڵیدا بچێتە ماڵەوە و لە ڕێگا لێی پرسیی: "ئەی عەلی، گەر ببینیت جگەرم بەسەر زەویدا دەڕوات، چی دەکەیت؟" عەلی هاتەوە سەر خۆی، مەگەر خۆشەویست نەیفەرمووبوو: "فاتیمە پارچەیەکە لە من، هەرکێ ئەو بڕەنجێنێ، منی ڕەنجاندووە!"

عەلی لە خەجاڵەتیدا نەیتوانی وەڵامی ئازیز بداتەوە و لەناو خۆیدا دووبارەی دەکردەوە: "یا لیتنی کنت ترابا" (خۆزگا خاک و خۆڵ دەبووم!)

عەلی هەرچیی کرد، نەیتوانی وەڵامی بداتەوە و تەنها گوتی: "نازانم! جوانترینی وتەکان پێغەمبەری خودا دەیزانێت."

خۆشەویست زەردەخەنەیەکی کرد و وەک خووی هەمیشەیی، بێ ئەوەی بەرامبەر بشکێنێت، نەرمونیان و میهرەبان وەڵامی دایەوە: "منداڵەکانمان جگەری ئێمەن و بەسەر زەویدا دەڕۆن ئەی عەلی! بزانە فاتیمە پارچەیەکە لە جگەرم و بەو جۆرە مامەڵەی لەگەڵ بکە." عەلی لەژێر تەماشا نەرم و پڕ میهرەبانییەکانی ڕەسولدا زەردەخەنەیەکی کرد و گەڕایەوە ماڵەوە و خۆشەویست ماڵی کچەکەی کەیفخۆش و شاد جێ هێشت و دواتر سەهل لە هۆکاری ئەو دڵخۆشییەی پرسی و ڕەسول وەڵامی دایەوە: "چۆن دڵخۆش نابم، دوو خۆشەویستترین کەسمم ئاشت کردەوە."

عەلی و فاتیمە گەرچی جارجار بیروبۆچوونیان نەدەگونجا و حەزەکانیان دەیکێشا بەیەکدا و هەستی جیاواز بە دڵیاندا

گوزەری دەکرد، وەلێ یەکدییان زۆر خۆش دەویست و لەسەر زویریی بچووک و دڵشکانی ساتی نەدەوەستان و بەردەوام بوون لە حیکایەتەکەیان. تاکە بابەتیش کە بەردەوام لەسەری کۆک بوون، خۆشەویستیی خودا و ڕەسولەکەی بوو و ئەوەش خۆی لە خۆیدا بەس بوو...

## فاتیمە لە ڕۆژی فەتحدا

«خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ»
"دەست بگرە بە لێبوردەییەوە (چاوپۆشی بکە)،
فەرمانیش بدە بە چاکە و چاکەکردن و ڕووو وەر
گێرە لە نەفامان و نەزانان (واتە وازیان لێ بێنە).
الاعراف/١٩٩

ساڵی حەوتەمی کۆچ، ساڵی خۆشی و وەرزی گوڵ و گوڵزار بوو. لە ڕۆژێکی گەرمی ڕەمەزاندا خۆشەویست گەشتێکی نوێی دەست پێ کرد و کچەکەی و زاوەکەی و نەوەکانی و هاوەڵانی لەگەڵ خۆی برد و بەرەو مەککە بەڕێ کەوتن! بۆ ئەو مەککەیەی لە شەوێکی تاردا و لەگەڵ یەک هاوەڵیدا جێی هێشت، ئێستا بە سوپایەکی دە هەزار کەسییەوە دەگەڕایەوە ناوی. خۆشەویست زۆر بیری کەعبە و تەوافی دەوری ئەو ماڵە پیرۆزەی دەکرد. موسڵمانان بە حەسرەت و ئیشتیاقێکی زۆرەوە دەگەڕانەوە بۆ ئەو مەککەیەی بە تێهەڵدان و ستەملێکردن و کوشتار دەربەدەر کرابوون لێی. لە ماوەی حەوت ساڵی پێشوودا زۆر شت گۆڕابوو و ژمارەی موسڵمانان گەلێ زیادی کردبوو، هەر بۆیە زۆر کەیفسازانە ڕێیان دەکرد و عەلی ئاڵای

ئیسلامی بە دەستەوە، پێشڕەویی سوپاکەی دەکرد. ڕەنگی هەنگوینیی تیشکی خۆر هێواش-هێواش ڕەنگی گوڵەهەناری وەر گرت و ئێوارە داهات و یەکەم پشوویان دا و دواتر دیسان بەردەوام بوون. دەریای لم لەژێر پێی حوشترەکاندا سەمای دەکرد و هەوری لمینی گەرم بە هەوادا دەهات و دەچوو و حوشترەوانەکان بە ئاوازێکی چوونیەک حوشترەکانیان تاو دەدا و بولبولی عەرەب بەسەر سەری کاروانەکەی ڕەسولەوە حەڵقەحەڵقە کۆ بوبوونەوە و دەیانخوێند و جارجار هۆنراوەی ئیمرەئول قەیس و جاروباریش هۆنراوەی کولتوورییان دەخوێند و بەمەش ڕێ کورتتر دەینواند و کاروان خێراتر. ڕەسولەڵلا جاروبار ئاوڕی دەدایەوە و سەیرێکی کاروانەکەی دەکرد و موسڵمانان بە جۆشوخرۆشێکی زۆرەوە تەکبیریان دەکرد و ئاسمان تا بڵێی شین و بیابان تا بڵێی زەرد بوو و خۆر تا بڵێی دەدرەوشایەوە. ئەسپەکان دەیانحیلاند و زەنگۆڵەی ملی حوشترەکان دەلەرایەوە و کاروان خێراتر و خێراتر ڕێی دەکرد، بەڵام خانمان و منداڵان ناڕەحەت بوون و جەستەی نارین و ناسکیان زۆر بەرز و نزم و سەروخواری دەکرد لەسەر حوشترکان و پێغەمبەر کە هەستی کرد حوشترەکانی ئەوانیش بە هەمان خێرایی حوشتری پیاوان تاو دەدرێن، بانگی لە عەنجەشە کرد کە بە سرود و ئاوازی خۆش حوشترەکانی تاو دەدا و فەرمووی: "کەمێک هێواشتر ئەی عەنجەشە! ئاگادارتر حوشترەکانت تاو بدە، چوون جەستەی کریستاڵئاسا ناسکیان لەسەرە!"

لەوەبـەدوا حوشـترەکان هێواشـتر هەنگاویـان دەنـا و ئێسـتا ئیـدی کاروان کەمـێ ئارامتـر ڕێـی دەکـرد و ژنـان دڵخـۆش و منـداڵان کەیفسـاز بـوون و تەکبیـر و سـەڵاوات و هۆنـراوە و سـرود بـەردەوام بـوو:

"ڕێی موحیببەتە ڕێی ئەم کاروانە...

خۆشی و شادی و بەخت یاوەرمانە."

حەسرەتی مەککە هەنگاوبەهەنگاو زیادی دەکرد لەناویاندا و ڕەنگـە شـادترین ڕۆژی کۆچبـەران ئـەو ڕۆژە بوو بێت. سـوپا و کاروان بـە سـەرکردایەتیی پێغەمبەرێـک ڕێیـان دەکـرد کـە لـە ڕێگـە چـاوی بـە سـەگێک و بەچکەکانـی کەوتبـوو و دەسـتبەجێ ڕێـی سـوپاکەی گۆڕیبـوو تـا نارەحەتیـان نـەکات، سـوپایەکی دە هـەزار کەسـی لەبـەر سـەگێک و بەچکەکانی ڕێیـان گۆڕی...! ئـای لـەو نرخـەی موحەممـەد و دینەکـەی بـە هەمـوو بـوون و گیانلەبەر و ئینسـان و ئاژەڵێکیـان دەدا...

ڕێیـان بـڕی و ڕێیـان بـڕی و لـە کۆتاییـدا گەیشـتنە سـنووری شـاری قەدیم. تەنهـا ئـەوان بیـری شـار نـا، شـاریش بیـری ئەوانـی دەکـرد. بـەردەکان و کێـوەکان مـژدەی هاتنیـان بـە یەکـدی دەدا، گۆڕسـتانی حەجـوون ئەشـکی حەسـرەتی دەڕشـت. سـوپاکەی موحەممـەد وەک دە هـەزار ئەسـتێرە بەسـەر زەویـدا ڕژابـوون و دەگەڕانـەوە شـاری شـاران. گەیشـتبوونە کۆتایـی ئـەو ڕێیـەی خۆشـیان نەیانزانـی چـۆن تـەواو بـووە. هەمـووان نوقمـی وەفـای نێـو دڵـی ڕەسـول بـوون وەختـێ لـە نزیـک گۆڕسـتانی حەجـوون

چادری دادا و یەکەم کەس مژدەی بە ئەو دا... موحەممەد مەملەکەتی موحیببەت و ئامێزی وەفا بوو، چۆن خەدیجەی لەبیر دەکرد! با لەگەڵ جوانترین و ناسکترین و گەنجترین و زیرەکترین ژنانی دونیاشدا هاوسەرگیریی کردبێت ئازیز بۆ ساتێکیش خەدیجەی لەسەر عەرشی دڵی دانەگرتبوو... فاتیمەش وەک باوکی چاو و دڵی پڕ بوو، حەوت ساڵی ڕەبەق نەیتوانیبوو زیارەتی دایکی بکات و ئەشکی حوزن و ئیشتیاق و خۆشی تێکەڵ بەیەک ببوون و فرمێسکی وەفا و ویساڵ یەک لەدوای یەک دەتکان. هەمووان بە چاوی پڕەوە تەماشای خۆشەویست و فاتیمە و عەلییان دەکرد لەسەر گۆڕی خەدیجە و چاوەڕێ بوون... چاوەڕوانی شتێ بوو لەدوای جەنگی حودەیبییەوە زۆر جوان فێری ببوون... کەسانێ بوون دەیانزانی چاوەڕێ بن و دواتر میوەی شیرینی بچەژن.

چاوەڕوانی کۆتایی هات، ئەو ڕۆژە ئیدی دەگەڕانەوە ئامێزی ئەو شارەی بە ترس و لەرزەوە جێیان هێشتبوو. زۆر بیری کەعبەیان کردبوو، زۆر بیری جێپێکانی ئیبراهیم و زۆر بیری تەوافیان کردبوو، زۆر بیری زەمزەم...

هەمووان لە یەک ساتدا دە هەزار مەشعەلەیان داگیرساند و چواردەوری مەککەیان بەتەواوی ڕووناک کردەوە و ترس و لەرزیان خستە دڵی بێباوەڕان. هاوەڵان و نەبی وەک مانگ و دە هەزار ئەستێرە دەدرەوشانەوە و وەختێ قورەیش ڕووناکیی چواردەوەری مەککەیان دی، زانییان درەنگ بووە و بەتەواوی

گەمارۆ دراون. بەو جۆرە لە ڕۆژی بیستەمی ڕەمەزاندا و لەگەڵ گزنگی بەرەبەیاندا داخڵی شار بوون. خۆشەویست بە سواری قەسوەی حوشترەوە لەپێش هەموانەوە بوو و عەبایەکی یەمەنیی ڕەشی لەبەردا بوو، کە بەوپەڕی هەیبەتەوە بەسەر شانەکانیدا هاتبووە خوارەوە و سوپاسگوزاریی خودای دەکرد و سورەتی الفتحی دەخوێند.

بێباوەڕان لە ترساندا چووبوونە سەر کێوەکان و لەنێوان بەردەڵان و بەرزاییەکانی مەککەوە تەماشای ناوازەترین وێنەیان دەکرد. فاتیمە هەتا ئەو ڕۆژە لە زۆرینەی جەنگەکاندا لەگەڵ باوکیدا بوو و ئەمێستاش شانبەشانی باوکی داخڵی مەککە دەبوو. مەککە ئامێزی بۆ موسڵمانان کردبوویەوە و کەعبە بەحەسرەتەوە چاوەڕێی دەکردن و دەنگی تەکبیر لەنێو کەعبەدا دەزرنگایەوە. بە ئاوی زەمزەم ناوەوە و دەرەوەی کەعبەیان جوان شت. ئەو کەعبەیەی کە مانای مەعنەوی لە عەرشی عەزیم بوو و لەگەڵ ئینسان دەدوا و دەردەدڵی دەکرد. کەعبە و نەبی حەسرەتی چەند ساڵەیان ڕەواندەوە و ئامێزیان کرد بەیەکدیدا. پێغەمبەر لەوپەڕی خشوعدا تەوافی دەکرد و بێباوەڕان ترسی گیانیان لێ نیشتبوو و نوێنەرەکانیان بە ترس و لەرزەوە ناردە حوزوری نەبی: "دەزانین بڕیارێکی خێردار دەدەیت دەربارەمان! چوونکە تۆ برایەکی بەنرخی ئێمەیت و کوڕی برایەکی بەنرخمانی و ئێستا هێز لە دەستی تۆدایە."

ئەم وتانە بە مانای تەسلیمبوون دەهات و خودا فەتحی زۆر بۆ ئاسان کردبوو و لە کاتی بەهێزیدا لێخۆشبوون تەنها لە ئەو دەوەشایەوە و فەرمووی: "ئەمڕۆ ڕۆژی برایەتییە! خودا لێتان خۆش بێت، بەڕاستی ئەو میهرەبانترینی میهرەبانەکانە و حاڵی من و ئێوە وەک یوسف و براکانیەتی، ئەمڕۆ ڕۆژی برایەتییە، بڕۆن هەمووتان ئازادن!" قاڵەقاڵێکی زۆر لەنێو قەرەباڵغییەکەوە بەرز بوویەوە و خۆشی و شادی باڵی بەسەردا گرتن و ئەوانەی خۆیان شاردبوویەوە، هاتنە دەرەوە و دەستەدەستە و کۆمەڵبەکۆمەڵ بەیعەتیان دەدا و موسڵمان دەبوون.

بەو جۆرە مەککە فەتح کرا بێ ڕژاندنی دڵۆپێ خوێن...

عەلی بە هاوکاریی ڕەسول بتەکانی لە جێی خۆی هەڵکەند و لەژێر تیشکی گڕگرتووی خۆردا بیلال لەسەر کەعبەوە یەکەم بانگی دا و مووچڕکەی هێنا بە گیانی هەمووواندا، خودایە، ئەوە چ دەنگ و سەدایەک بوو!

پێغەمبەر لە نزیکترین جێوە لە کەعبە چادرەکەی هەڵدا و هاوسەرانی و عەلی و فاتیمە و نەوەکانی لەتەنیشتیدا. تاکوتەرا خەڵکی دەهاتن بۆ لای و پرسیاری حوکمەکانیان لێ دەکرد و ژنێکی ناوداری هۆزی مەحزوم، کە دزیی کردبوو، هاتبوو داوای دەکرد حوکمەکەی لەسەر لا ببرێت و فەخری کائینات بەرپەرچی دایەوە: "وەڵاهی فاتیمەی کچمیشم ئەو تاوانە ئەنجام بدات، هەمان سزای هەیە." بێباوەڕان سەریان سووڕ

مابوو لە دادپەروەریی نێو ئەم دینە، لەلای ئەوان دەوڵەمەند و خاوەن پایە هەرچییان بکردایە لێخۆشبوونیان بۆ دەر دەچوو و هەژاریش لە زینداندا دەڕزا، بەڵام ئیسلام ئەم یاسایەی لە بنچینەوە هەڵکەند. فاتیمە لە هەموو ئەم ساتانەدا زۆر بەختیار و سوپاسگوزار بوو و ئەو ڕۆژانەی دەهاتەوە یاد کە پیسی و خاشاکی لەسەر پشتی باوکی دەتەکاند و ئێستا لەگەڵ دە هەزار کەسدا تەوافی دەکرد و پیرۆزترین جێی جیهان میوانداریی عەزیزترین میوانەکانی دەکرد و فاتیمە شایەتحاڵی شیرینترین ڕۆژەکانی نەبی بوو...

## تاقیکردنەوەکەی فاتیمە

«هەرکەسێک سەبر لەسەر نارەحەتیەکانی دونیا نەگرێت، ناگات بە نازونیعمەتەکانی ئاخیرەت.»
حەزرەتی عەلی

موسڵمانان لەدوای فەتحی مەککە گەڕانەوە بۆ مەدینە، چوون خۆشەویست زۆر لەوە وەفادارتر بوو ئەو کەسانە جێ بهێڵێت کە لە نارەحەتترین ڕۆژەکانی ژیانیدا ئامێزیان بۆ کردبوویەوە! لەگەڵ ئەوەی بە حەسرەتی کەعبەوە دەسووتا، بەڵام گەڕایەوە... وەک چۆن لە میعراجدا گەیشتە حزوری خودا و گەڕایەوە، بەو جۆرە کەعبەشی لە دڵیدا حەشار دا و گەڕایەوە... بەڵام تاقیکردنەوەکانی دونیا بەردەوام بوون و گەورەترین جەنگی ئینسان لەگەڵ نەفسی خۆیدا بوو و کۆتا تەڵەکەی بێباوەڕان دارمانی ماڵی فاتیمە بوو و دەیانویست هەمەئاهەنگی و بەیەکەوەبوونی جوانی لەگەڵ عەلی بشێوێنن. لە پلانی ئەوەدا بوون جوەیریەی کچی تازە موسڵمانبووی ئەبوجەهل بدەن بە عەلی و چەندین ڕۆژ بەشوێنیەوە بوون، بەڵام عەلی لەگەڵ نەبیدا هێندە سەرقاڵی گەیاندنی ئیسلام و کاروبارەکانی دەوڵەت بوو، دەرفەتی قسەکردنیان دەست نەکەوتبوو. جوەیریە لە جوانترین کچەکانی قورەیش بوو جەستە و ئەندام و باڵا و

زیرەکی و ناسکیی بێوێنە بوو و لە گشت لایەک ناوبانگی دەر کردبوو و تەنها عەلیی شێری مەیدانی جەنگیان بە شایستەی دەزانی و دەیانگوت: "عەلیی لێ دەر بچێت، ببێت بە هاوسەری هەرکەسێک، زیانە." ئەمە چ بوێرییەک بوو! هەوڵدان بۆ شێواندنی خۆشبەختیی عەلی و فاتیمە! ئەهلی مەککە تا مەدینە هاتبوون بۆ ئەم مەبەستە و داوای ئیزنیان دەکرد بۆ خواستنی جوارییە بۆ عەلی و قسە زوو بڵاو بوویەوە و گەیشت بە گوێی فاتیمەی جوانی جوانان: "عەلی جوارییەی کچی ئەبوجەهل دەخوازێت."

ئەی لەم تاقیکردنەوە سەختە! فاتیمە پەنای بە خودا گرت و داوای مەدەدی لێ کرد...

بەپێی هەلومەرجی ئەو سەردەمە بوونی زیاتر لە ژنێک بۆ پیاوان شتێکی تا بڵێی ئاسایی بوو و هەمووان پێیان وا بوو بە هاوسەرگیریی ئەو دووانە ئیسلام بەهێزتر دەبێت، وەلێ بەیەکەوەبوونی فاتیمە و عەلی زۆر لەوە جوانتر بوو پێویست بە کەسێکی دی بکات بێتە نێوەندەوە! فاتیمە هەتا ئەو ڕۆژە بیری لە شتی لەو جۆرە نەکردبوویەوە و سەختترین تاقیکردنەوەی ژیانی بوو. قسەوقسەڵۆک ڕۆژبەڕۆژ زیادی دەکرد و فاتیمە لەوە زیاتر خۆی بۆ نەگیرا و شەکوای دڵی بردە لای ڕەسول: "بابە گیان! قەومەکەت پێیان وایە هەرچی لە کچەکانت بکەن تووڕە نابیت، دەڵێن گوایە عەلی لەگەڵ کچەکەی ئەبوجەهلدا هاوسەرگیری دەکات، تۆ دەڵێیت چی!"

خۆشەویست بێدەنگ بوو، دەیزانی دڵی ئاوریشمئاسا ناسکی فاتیمە بەرگەی شتێکی لەو جۆرە ناگرێت، ناتوانێت لەگەڵ کچی

دوژمنەکەی پێغەمبەردا لەژێر هەمان بنمیچدا بژی. دەیزانی فاتیمە دایک و خوشکی نییە، دەرد و تاسەی لەنێو خۆیدا زیندانی دەکات، تەنهایە، بەرگە ناگرێت فاتیمە... بەرگەی بەشکردنی عەلی ناگرێت، ناتوانێت لەگەڵ ژنێکی دیکەدا ماڵئاوایی و پێشوازی لە عەلی بکات... ئەم تاقیکردنەوەیە زۆر سەختە بۆ فاتیمە و ڕۆژبەڕۆژ دەیتوێنێتەوە و لەناو دەچێت...

بیری لە کۆتا ڕۆژەکانی خەدیجە کردەوە، ئەو وەختەی لەسەر تاشەبەردە ڕەقوتەقەکانی ئەبوقوبەیس و بە جلێکی شڕ و ڕەنگڕۆیشتووەوە کۆتا نەفەسەکانی دەدا و شاژنێک ماڵئاوایی لە جیهان دەکرد و خۆشەویست بە ڕاسەریەوە دانیشتبوو و فەرمووی: "دەزانیت ئەی خەدیجە؟ لە بەهەشتدا جگە لە تۆ، چوار ژنی دیکەم هەیە." خەدیجە، کە تا ئەو ڕۆژە غیرەی لە هاوسەری نەکردبوو غەم دایگرت و فرمێسکەکانی بۆ نەگیرا و گوتی: "هەر بەڕاستی وایە؟" فاتیمە ئەو ڕۆژانە دە-دوازدە ساڵێک دەبوو و بە باوکی گوت: "بابە گیان، بۆچی بەو جۆرە دایکمت دڵتەنگ کرد، لە کاتێکدا دەزانیت کۆتا ساتەکانی ژیانیەتی؟"

خۆشەویست تەماشای کچە فریشتەئاساکەی کرد و فەرمووی: "کچەکەم، منیش نەمدەویست دڵتەنگی بکەم، وەلێ کەمێک لەمەوپێش دەفتەری کردەوەکانی دایکتم نیشان درا و دەبینم یەک کردەوەی لێ دەر بچێت، لە هەموو کردارێکی دیکەدا پاداشتی خۆی وەر گرتووە و ئەوەی کەم بوو، هەستی غیرەکردن بوو لە هاوسەری، دایکت تا ئەم لەحزەیە بۆ ساتێکیش غیرەی لە من نەکردووە، ویستم لەو پاداشتە بێبەش نەبێت، بۆیە ئەو قسەیەم

کرد تا غیره بکات، کەمێک بێتاقەت بوو، بەڵام سوپاس بۆ خودا پاداشتی ئەوەشی وەر گرت." هەر وا بوو، لە قەدیمەوە لەنێو ڕۆحی پیاودا ململانێ و ڕۆحی ژن مۆری غیرەی لەسەر بوو و گەر ژنان بەرگەی ئەو هەستەیان بگرتایە، پاداشت دەدرانەوە لەسەری. خۆشەویست دڵی نەهات کچەکەی لەوە زیاتر خەفەت بخوات و کە زانیی بابەتەکە ڕۆژبەڕۆژ گەورەتر دەبێت، هاوەڵانی کۆ کردەوە و لەسەر مینبەری مزگەوتەوە ڕوونکردنەوەی لەسەر بابەتەکە دا و خاڵی کۆتایی بۆ دانا: "خانەوادەی ئیبنو موغیرەی بەنی هیشام ئیزنی ئەوەیان لێ وەر گرتووم کچەکەیان بۆ عەلی بخوازن، منیش ئیزنم نەداوە و نایدەم! مەگەر کوڕەکەی ئەبوتالیب لە کچەکەم جیا ببێتەوە و ئەو بخوازێت! ئەوەیان ئیدی پەیوەندیی بە منەوە نییە و ئەوە باش بزانن فاتیمە پارچەیەکە لە من و هەرکێ ئەو بڕەنجێنێ، منی ڕەنجاندووە و هەرکێ ئازاری بدات، ئازاری منی داوە و من ئەوەی حەڵاڵە حەرامی ناکەم و ئەوەش حەرامە حەڵاڵی ناکەم، وەڵاهی کچی ڕەسول لەگەڵ کچی دوژمنەکەی خودادا لەژێر بنمیچێکدا ناکرێت بژین!"

خاڵی کۆتایی دانرا و ئەوانەی دەیانویست عەلی جگە لە فاتیمە گوڵێکی دی بۆن بکات، لێی گەڕانەوە و عەلی نەک نیازی هاوسەرگیریی دیکەی نەبوو، تەنانەت جاریەشی نەبوو و عەلی فاتیمەی لێ دەر بچێت، چاوی لەسەر هیچ ئافرەتێکی دیکەی جیهان نەبوو و خۆشحاڵ بوو بە بڕیارەکەی ڕەسول...

## کوژانەوەی کۆتا نور

«إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُمْ مَيِّتُونَ»

«تۆش دەمری و ئەوانیش دەمرن.»

الزمر/٣٠

دەیەم سالّی کۆچ بوو و دینی ئیسلام بە شێوەیەکی بەرچاو گەورە دەبوو و قورئان بەتەواوی دابەزیبوو و خۆشەویست، کە لە حەج گەڕابوویەوە، بە جۆرێ لە جۆرەکان هەواڵی کۆچی خۆی دابوو: "نازانم! ڕەنگە لەپاش ئەمساڵ لێرە لەگەڵتان نەبم ئیدی." گەرچی ئیمانداران دڵیان کەوتە لەرزین، خۆشەویست بەردەوام بوو لە وەسیەتەکەی: "دوو ئەمانەتتان لەدوای خۆم بۆ جێ دەهێڵم و تا ئەو وەختەی شوێن ئەو دوو ئەمانەتە بکەون، ڕێ ون ناکەن و ئەو دوو ئەمانەتەش قورئانی کەریمی کتێبی خودا و سوننەتی پێغەمبەرە."

خۆشەویست لە سالّی کۆتایی تەمەنیدا تەندروستیی بەرەو خراپی دەڕۆیشت و لەپاش ئەوەی لە فەتحی خەیبەردا خواردنی ژەهراویکراوی دەستی ژنە یەهودییەکی خوارد جاروبار تووشی سەرئێشەیەکی زۆر بەهێز دەهات و پێشتریش جارێکی دی تووشی ڕووداوێکی لەو جۆرە بووبوو، وەختێ لەبیدی بێباوەڕ

تاڵێ قژی پێغەمبەری دەست کەوتبوو و لە شانەیەکی ئاڵاندبوو و سیحری لێ کردبوو و خستبوویە نێو بیرێکی قووڵەوە و لە ڕێی وەحییەوە خۆشەویست شوێنی سیحرەکەی دۆزیبوویەوە و عەلی دەستبەجێ شانەکەی هێنابوو و سورەتی فەلەق و ناسیان بەسەردا خوێندبوو، بەوە نەبی ئیسراحەتی کردبوو. بەڵام ئەم جارە ئازارەکەی زۆرزۆر بوو، بە هیچ نەدەڕەوایەوە و فاتیمە زۆر خەفەتی لە باوکی دەخوارد و هیچیشی لەدەست نەدەهات. فاتیمە یەکێک لەو شەوانە خەونێکی دی، لە خەونیدا قورئانی دەخوێند و لەپڕ کەسێک هات و قورئانەکەی لە دەست ڕفاند، فاتیمە بە ترس و لەرزەوە لە خەو ڕاچڵەکی و بۆ بەرەبەیان دەستبەجێ خەونەکەی بۆ باوکی گێڕایەوە و خۆشەویست زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی: "ئەو قورئانە منم نوری چاوم! زۆری نەماوە کۆچم..."

لەو ساتەوە ئیدی قیامەتی فاتیمە هەستا... جیابوونەوە لە ئەو بە واتای بڕینی هەناسەی دەهات، ئەو گەر ڕۆژێکیش باوک و پێغەمبەرەکەی نەبینێ، ئەو شەوە بە هەزار ئەملاولا خەوی لێ دەکەوێت، جا بگات بە کۆچی ئەبەدی! نا، بەرگە ناگرێت... ئەشک وەک دوو دەریا بە چاوەکانیدا دەهاتە خوار، پەیوەندیی نێوان فاتیمە و باوکی وەک پەیوەندیی کچ و باوکێکی ئاسایی نەبوو، فاتیمە هەم وابەستەی باوکی بوو، هەم هیی پێغەمبەر و گەر هەموو موسڵمانان هێندەی فاتیمە پێغەمبەریان خۆش بویستایە، شتێک نەدەما لەسەر ڕووی زەوی بە ناوی خۆشنەویستن. فاتیمە پەرێشان بوو، حورمەتی بۆ قەدەری ئیلاهی بێسنوور

بوو، وەلێ تەنانەت بیرکردنەوەش لە ڕۆیشتنی باوکی وەک ڕەشەبایەکی سارد ناخی دەتەزاند. خۆشەویست ماوەیەک تەماشای حاڵی پەرێشانی کچەکەی کرد و هیچی نەگوت، حاڵی ڕێک لە گەشتیارێکی سەر کەشتییەکی جێهڵراوی ناوەڕاستی دەریایەک دەچوو، بێچارە، بێدەنگ... مەنگ... خۆشەویست کە لەوە زیاتر بەرگەی پەرێشانیی کچەکەی نەدەگرت، فەرمووی: "نزیک بەرەوە!" فاتیمە سەری خستە سەر سنگی باوکی و باوکی شتێکی پێ گوت و فاتیمە وەک منداڵ هەنسکی دا و هەنسک و فرمێسکەکانی خوێناوی جگەری بوون دەڕژانە سەر گۆنای و باوکی بەوپەڕی ئارامییەوە دیسان فەرمووی: "نزیک بەرەوە!" فاتیمە نزیکتر بوویەوە و خۆشەویست بە دەستە بەهەشتییەکانی فرمێسکەکانی کچەکەی سڕی و خۆشەویست شتێکی دیکەی چپاند بە گوێیدا و فاتیمە زەردەخەنەیەکی کرد و ڕووی لەفرمێسکداخووساوی ئەم جار دەگەشایەوە، تا ئەو ڕۆژە ڕووی فاتیمە هێندە ئاسوودە و خۆشحاڵ نەبینرابوو، هەرکێ لە ژوورەکەدا بوو، سەری سووڕ ما، ئەمە چ حاڵێکە فاتیمەی تێ کەوتووە! کەسێکی وەک ئەو سەنگین و بەشکۆ ئاوا ئاسان هەست ناگۆڕێ و لە جێیەکی ئاوادا زەردەخەنەی لەو جۆرە ناکات! عائیشە لەوە زیاتر خۆی پێ نەگیرا و پرسیی: "چی بوو ئەی فاتیمە! هیچ ساتێکی دیکەم نەدیوە لە ژیانمدا خەم و خۆشی هێندە نزیک بن لەیەک! هۆکاری چی بوو؟"

"نهێنییەکە لەنێوان من و باوکمدا! ناتوانم نهێنییەکەی بدرکێنم."

خۆشەویست سەرەتا هەواڵی کۆچی خۆی بە فاتیمە دابوو، هەر بۆیە فاتیمە وا بەکوڵ گریابوو، جاری دووەمیش مژدەی ئەوەی پێ دابوو کە فاتیمە یەکەم کەس دەبێت لە ئەهلول بەیت کە پێی شاد دەبێتەوە! هەر بۆیە زەردەخەنەی کردبوو و پێکەنیبوو، هاوکات ئەو پێکەنینە کۆتا پێکەنینی فاتیمە بوو لەسەر ڕووی زەوی... کۆتا شت کە لە دونیادا بە شایانی ئەوەی زانی زەردەخەنەی بۆ بکات، مژدەی گەیشتنەوە بوو بە باوکە گیانی...

لە ڕۆژانی داهاتوودا خۆشەویست حاڵی زیاتر شێوا و ئیدی نەیدەتوانی لە جێ هەستێ و ماڵەکەی یەک پارچە خەم بوو و فاتیمە کە بەو جۆرە دەیبینی، دڵی کزەی دەکرد و بۆ ساتێکیش جێی نەدەهێشت و زۆر جار ژوورەکە بێ دەنگ و سەدا باوک و کچ تەماشای یەکیان دەکرد و لە نیگاکانیاندا هەزار هەستیان مشتوماڵ دەکرد: "کەون و کائینات بە خاتری تۆ هەڵدەسووڕێ، بە خاتری تۆ خۆر هەڵدێ، بە حورمەتی تۆ باران دەبارێ، بابە گیانم، خۆشەویست گیان، کێ چۆن بەرگەی دووریی تۆ بگرێت؟"

"کچی خۆم، گیانەکەم! لەبیرت نەچێ من تەنها پێغەمبەرێکم و پێش موحەممەد زۆر پێغەمبەر هاتووە و چووە، ئێستا گەر ئەو بمرێ، پەشیمان دەبنەوە و دەگەڕێنەوە؟"

"چاوێ تۆی نەدیبێ، با نەڵێ ژیاوم... بە بوونی تۆ دونیا پڕ دەبێت لە شادی، دونیا بێ تۆ جەهەنەمە بۆ من، من قەینا، ئەی حەسەن و حوسەین! ئەوان چی بکەن بێ تۆ!"

"سەرکردەیی و شەهامەتم بۆ حەسەن و بوێری و بەخشندەییشم بۆ حوسەین جێ دەهێڵم."

"گیانم فیدات! تەماشام بکە تۆو خودا! تەماشام بکە و شتێ بڵێ!"

"ئارام بگرە کچم! مەگری، تەماشا فریشتان چۆن لەگەڵ گریانی تۆدا دەگرین!"

"چۆن بەرگەی زیندانی بێتۆیی بگرم بابە گیان!"

فاتیمە یەک-یەک سەردانی ماڵی هاوسەرانی ڕەسولی کرد: "باوکم زۆر ناڕەحەتە و ئیدی ناتوانێ سەردانتان بکات!"

هەمووان هەمان وەڵامیان دایەوە، "خودا دەکات ئەو باش دەبێت، ئێمە لە بەشی خۆمان خۆش دەبین."

کۆتا ڕۆژەکانی نور بوو لەسەر زەوی و جارجار لە ئازاردا لە هۆش خۆی دەچوو و دواتر دەهاتەوە هۆش خۆی و عەلی بەردەوام بە ڕاسەریەوە بوو و قورئانی دەخوێند و فاتیمە بەرگەی ئازار و ناڕەحەتییەکانی باوکی نەدەگرت: "ئاە بابە گیان... ئاە چەند سەختە بینینی تۆ بەم جۆرە..."

ڕۆژێک عەلی قورئانی دەخوێند و بەهێواشی سەری خۆشەویستی خستە سەر ڕانی و خۆشەویست لەو ساتەدا بورایەوە و فاتیمە هاواری کرد: "باوکە گیاااان! تۆو خودا مەڕۆ، پارێزەری ستەملێکراو و پشتوپەنای بێکەسان دەردت لە من، بەلات بۆ من، باوکی عەزیزم!..."

هاوار و لاواندنەوەکانی فاتیمە دڵی پارچەپارچە دەکرد، خۆشەویست هاتەوە هۆش خۆی و بە دەنگێکی کز فەرمووی:

"کچم، ئەوەندە مەگری بۆم! نەکەی بکێشی بە سنگوبەرۆکتدا و قژت بڕنی و واوەیلا و ئاهـ و فیغان بکەیت، پەنا بگرە بە خودا و داوای سەبر لە ئەو بکە."

فاتیمە بەشوێن چارەی جوداییدا دەگەڕا، بەڵام مەرگە ئەمە، چارەی کوا...! مەدینە چاوبەگریان و هاوەڵان دەستلەئاسمان چاوەڕێ بوون... هەمووی ئامادە بوو گیانێک نا، هەزار گیان بکات بە فیدای پێغەمبەر، وەلێ ملیان لە موو باریکتر بوو بەرامبەر قەدەر... خۆشەویستترین بەندەی خوداش بێت، دەبێت تاڵاوی مەرگ بچەژێ... فاتیمە دەگریا، هەنسکی دەدا، هاواری دەکرد:

"ئاە باوکی عەزیزم!"

"ئاهەە باوکی میهرەبانم!"

"ئاە باوکی نەرمونیانم..."

خاتەمولئەنبیا دڵی کچەکەی دەدایەوە: "مەگری کچەکەم! لەمەبەدوا باوکت خەم و نارەحەتی ناچەژێت! ڕزگاری دەبێت لە جیهانی فانی و جێی میحنەت."

خۆشەویست کۆتا ئامۆژگاریی جێ دەهێشت: "نوێژەکانتان... ئاگاداری نوێژەکانتان بن... نوێژەکانتان..."

کەمێکی دی دونیا ئیدی بۆ هەتاهەتا بێبەش دەبوو لە بۆنی موحەممەد! جوبریل تا هەتایە دانەدەبەزییە سەر ڕووی زەوی... فریشتەی مەرگ بەوپەڕی ئاگاییەوە کاری خۆی ئەنجام دەدا، یەکەم جاری بوو بلەرزێت، پیرۆزترین ئەمانەتی زەویی دەبردەوە... فریشتەی مەرگ سەری سووڕ مابوو

لە جەستەی لاواز و بێهێزی ڕەسول و لە ڕۆحەکەی جودا نەدەکردەوە! نەیدەزانی کامە جەستەیە و کامە ڕۆح، جەستەی نوری لێ پەخش دەبوو و ڕۆحی هەر نور! کامیان کامیانە ئیلاهی...! لە کۆتاییدا جودای کردەوە و ڕۆحی برد! قیامەتی دونیای هەڵدەستاند... مەدینەی ڕووخاند... جەوهەرەکەی ناو ناخی زەویی بردەوە و فاتیمە بوو بەژێر داروپەردووی هەموویەوە... گیان پەرێشان، ڕۆح غەمبار، هاوەڵان هەتیو... عەلی تاکە وشەیەکی بۆ نەدەگوترا... بیلالی دەنگخۆش لاڵ بووبوو... عائیشە فرمێسک لە چاوانی نەدەوەستا... ئەبوبەکر سەری بەرەو زەوی نەوی کردبوو... ئای لەو ساتە... وای لەو لەدەستدانە...

بەڵام ژیان ئەمەیە و ڕاستی ئەوەیە هەموو نەفسێک مردن دەچەژێ! ئەو ساتەش کۆتا سات و کۆتا نەفەسی سەروەری جیهانییان بوو... هاوەڵان دەگریان... شارەکەی پێغەمبەر شەپۆل-شەپۆل نوقمی خەم بوو... عومەر شمشێرەکەی دەر دەکرد: "ئەوەی بڵێت موحەممەد مردووە، سەری دەپەڕێنم!"

ئەبوبەکر ئارامی دەکردەوە: "موحەممەد چوو بۆ لای خودا" و ئایەتی «وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىَ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللّهُ الشَّاكِرِين» «موحەممەد پێغەمبەرێکە و چیی تر نییە؛ لەپێش ئەویش زۆر پێغەمبەر هاتوون و چوون. ئەگەر بمرێ یان بکوژرێ، لە ئیسلام پاشگەز دەبنەوە؟ هەرکەس پاشگەز ببێتەوە، زیانێک بە خودا

ناگەیەنێ. خودا پاداشی سوپاسگوزارانی دەدا." دەخوێنێ و دەڵێی ڕێک بۆ ئەو ساتە دابەزیوە...

فریادێک دەکەوێتە ئامێزی زەوی، هاوارێک کە سەداکەی تا هەتایە دەزرنگێتەوە لە گوێی جیهاندا، فریاد و هاواری فاتیمەیە... فاتیمە کە بە ڕۆشتنی دایکی مانگی ئاسمانی کوژایەوە، ئەم جار خۆری ژیانیشی دەکوژێتەوە... هەر ئەو نا... گوڵ ڕەنگی دەبڕێت... ژیان ژیانی لێ دەبڕێت... ڕەشەبا دەکەوێتە هەڵەرزین... خۆر لەسەر ئوحود ئاوا دەبێت و مەدینە دەبرژێ و دڵی فاتیمە دەکوڵێت بەو ئازارەوە... ئەو ئێوارەیە بولبول ناجریوێنێ، ئاسکەکان دەنگ ناکەن، شەو مات و بێدەنگ خۆی دەدات بەسەر مەدینەدا و ماتەمی بەسەردا دێنێت، ئاسمان هەنسک دەدات ئەو شەوە ئوحود ئاگر بەر دەبێتە هەناوی، تەنها خاک نەبێت خۆشحاڵە، چوون ئەو ئازیزە دەخەنە ئامێزی...

***

عەلی ڕێوڕەسمی ناشتنی ڕەسولی گرتە ئەستۆ و فاتیمە ئاوی بۆ گەرم دەکرد، بە ئاگری نێو دڵی ئاوی بۆ گەرم دەکرد... ئیماندار دەبێت بەهێز بێت و فاتیمە بەهێز بوو، گریانی ئەو بۆ مردن نەبوو، ئەو مەرگی خۆش دەویست، وەلێ بۆ دونیای تاریکی دوای ئەو دەگریا... ئەوانەی موحەممەدیان بینیبوو، دەیانزانی چی ڕۆشتووە... دەیانزانی دونیا کێی لەدەست داوە... عەلی خۆشەویستی دەشۆرد و قەسوەی حوشترەکەی نەبی هۆن-هۆن فرمێسکی دەڕشت و بیلال

دەنگی دەلەرزی و نەیدەتوانی بانگ بدات... زۆر هەوڵی دا، وەلێ هەر کە گەیشتە 'محمد رسول الله'، نوقمی هەنسک و گریان بوو و نەیتوانی بیڵێت... زەمینلەرزە لەنێو دڵی فاتیمەدا ڕووی دابوو و تاماشای عەلیی دەکرد و دەیگوت: "چۆن! چۆن دڵتان هات بینێژن عەلی! چۆن خاکتان دا بەسەریدا! چۆن باوکمتان بەتەنها جێ هێشت و هاتنەوە!"

عەلی جگەری هەزار پارە ببوو و هەوڵی دڵدانەوەی فاتیمەی دەدا، وەلێ بێفایدە بوو... حەسەن و حوسەین و زەینەب و ئوموکەلسوم بە چواردەوری دایکیاندا کۆ ببوونەوە و دەگریان. خەڵکی پەرێشان و دونیا تاڵترین ڕۆژی دەژیا. یەکەم کەس سەردانی گۆڕی خۆشەویستی کرد، فاتیمە بوو... لەوەبەدوا بە مژدەی شادبوونەوەی ئەوەوە دەژیا، وای نیشان دەدا و کاری ڕۆژانەی وا دەکرد کە هەرگیز نامرێت، بەڵام لەنێو خۆیدا بەو هیوایەوە دەژیا... خۆشەویست ڕۆیشت و سەدای خەمئامێزی بولبولەکانی مزگەوتی لەدوای خۆی جێ هێشت... پەپوولەی ئاگرینی خەم بوو بە میوانی سفرەکانی مەدینە... بێدەنگی تێکەڵی هاوار و هاوار تێکەڵ بە سکوت بوو... زەمەن جوانیی خۆی لەدەست دا و زمانەکان هیچی خۆشیان نەما بۆ گوتن و دڵەکان پایەی خەمیان تێدا بونیاد نرا و فاتیمە هەرگیز نەبوویەوە بە فاتیمەکەی جاران...

فاتیمە وەک یوسف لەنێو بیرەکەدا دەپاڕایەوە و چاوەڕێی هاتنەدەرەوە و شادبوونەوە بوو. لە ناخیدا مەحشەری غەم

بوو و بە ڕووکەش بێدەنگ... وەک ئاسک دوور و خەمبار دەیڕوانی و عائیشە ڕۆژێک هاتە سەردانی: "ئەی فاتیمەی سەرچاوەی شادیی پێغەمبەر، ئەو نهێنییە چی بوو کە باوکت لە کاتی نەخۆشییەکەیدا پێی دایت؟ ئێستا پێم دەڵێیت؟"

فاتیمە بەدەم گریانەوە وەڵامی دایەوە: "باوکم ئەو ڕۆژە دوو نهێنیی پێ دام، یەکەمیان گوتی، 'کچم، جوبریل هەموو ساڵێک یەک جار خەتمی قورئانم پێ دەکات و ئەمساڵ دوو جار و پێشی ڕاگەیاندووم کە هەر پێغەمبەرێک نیوەی ژیانی پێغەمبەریی پێش خۆی دەژی و عیسا سەد و بیست ساڵ ژیاوە و منیش لە تەمەنی شەست ساڵیدام!' هەر بۆیە زۆر گریام، دواتریش فەرمووی، 'یەکەم کەس لە ئەهلی بەیت پێم شاد دەبێتەوە، تۆیت و لە بەرزترین ژنانی بەهەشتیشیت.› بۆیە پێکەنیم...

مردن بە مانای کوژانەوە و نەمان نەدەهات، وەلێ ژیان دوای ڕەسول بۆ فاتیمە هەمیشە شەو بوو...

شەو... دیسان شەو... لەوەتەی ئەو ڕۆشتبوو، ڕۆژ نەبوویەوە و تاکە دڵدەرەوەی خوێندنەوەی قورئان بوو.

فاتیمە لەپاش مەرگی باوکی هەرگیز پێنەکەنی... دەیویست، بەڵام نەیدەتوانی... ژنانی مەدینە چەندین سەتڵە ئاویان کرد بە ئاگری دڵی فاتیمەدا، وەلێ تازە نوری نێو دڵی کوژابوویەوە و دونیای تاریک ببوو و لەگەڵ ڕۆشتنی ڕۆژدا حەسرەتی نەبینینیشی دەچوویە سەر خەمی فیراقی و دەبوو بە وشە و دەڕژایە سەر زاری:

ئەی سەوزیی هەرچی دار و گوڵ و گیایە!
ئەی بەهاری ناسکی و جوانی!
ئەی دەوڵەت و بەخت و گەورەییم!
ئەی خۆری تاریکیڕەوێنم!
ئەی تەنهاییم، ئەی دڵسۆزیم، ئەی ئارامیم!
وەرە... توو خودا وەرەوە...
لە نەبوونتا خۆر هەڵنایە!
ئاه و گریانم هەموو لە حەسرەتی تۆدایە!

## هەیوانی غەم

"بمنووسەرەوە ئەی قەڵەم، بمنووسەرەوە!
دڵم هێندە نوقمی دەریای غەم بووە، دڵ
قەڵەم و دەریا مورەکەبە ئێستا."

لە ئیسلامدا ماتەمینی بوونی نەبوو، وەلێ ڕەشەبای جودایی نێو دڵی کچەکەی ڕەسول دانەدەمرکایەوە و لە جێی ئەوەی کەم بکات، ڕۆژبەڕۆژ زیادی دەکرد. بەدەست خۆی نەبوو، نەیدەتوانی بخەنێ، بخوا، بخواتەوە. بێئەوی مەرگی فاتیمە بوو، ئاسمانی شینی خۆڵەمێشی ببوو و زووزوو نەخۆش دەکەوت و لە جێگادا دەکەوت. نە عەلی ئارامیی دڵ و نە منداڵە چاوگەشەکانی و نە دڵدانەوەی ئازیزان سوکناییان نەدەدایەوە. هەر ئەو نا، ئاسمانی مەدینەش چەندین ڕۆژ بە خوڕ بارانی باراند و فرمێسکی ئاسمان و فاتیمەش هەردووک لەبەر کۆچی موحەممەدەل موستەفا بوو و فاتیمە بەدەم خۆیەوە دەیگوت: "بابە گیان! با هەموو دونیا بۆ کۆچت بگری، بە چی دەچێت کە من نەگریم! شەو و ڕۆژم جیاوازیی نییە! بگرین چاوەکانم، بگرین... ڕەزیلی مەککەن لە فرمێسکڕشتندا."

خەڵکی نەیاندەزانی فاتیمە بۆ هێندە دەگری، بەڵام فاتیمە بۆ حاڵی دونیا دەگریا دوای ئەو. بۆ ئەو ستەمانەی دوای ئەو دەکرا، بۆ ئەو خوێنەی بەناحەق دەرێژرا، ئەو فیتنانەی سەریان هەڵدەدا، بۆ ئەو جوانییانەی لەناو دەچوون دەگریا... تەنها عەلی ئاگاداری ئاگری ناخی بوو... تەنها ئەو شایەتی ئەشکی نەبڕاوەی بوو...

فاتیمە لە قەدەریدا نووسرابوو یەک لە ئەو پێنج کەسە بێت کە زۆرترین ئەشکی ڕشتووە و تاکە ژنی نێوانیان بوو... حاڵی لە ئادەم دەچوو وەختی جودابوونەوە لە بەهەشت، یەعقوبی دوور لە یوسف بوو حاڵی...

خەڵکی مەدینە پەرێشان بوون بە گریان و فرمێسکی بەردەوامی فاتیمە و بەتەمەنەکانی شار کۆ بوونەوە و چوونە لای عەلی: "بەرگەی گریانی فاتیمە ناگرین! کارێ بکە ئەی عەلی؟ ئاوا چۆن دەبێت!" عەلی دەیزانی وا بەئاسانی فرمێسکی چاوەکانی فاتیمە ناوەستن و بۆ دڵدانەوەی لە گۆڕستانی بەقیع هەیوانێکی بۆ دروست کرد، کە دەیڕوانییە سەر گۆڕەکەی نەبی و ئەوێ ئیدی بوو بە جێی ئارامیی فاتیمە و تا درەنگان لەوێ دەمایەوە و دواتر لەگەڵ عەلیدا دەگەڕایەوە. خەڵکی مەدینە ناویان لێ نا 'بیت الاحزان' 'ماڵی خەمەکان'، ئەوێ ئیدی ماڵی خەمی فاتیمە بوو و لەوێوە تەماشای دونیای دەکرد. بەیانییان زوو دەڕۆیشت بۆ ئەوێ و بەدەم گریانەوە خەیاڵ و داڵغە دەیبردەوە و زووزوو دەیگوت: "خودایە،

مـەودای چاوترووکانێکیش مەمـدەرە دەسـت خـۆم!" بڵێـی خـەم و گریانـی ڕۆحێکـی لـەو جـۆرە دونیایـی بوویێـت؟ هەرگیـز... گۆناکانـی هەمیشـە تـەڕ بوون و ئەوەنـدە گریابـوو، هێڵێک لەسـەر گۆناکانـی دروسـت بووبوو، ئـەو هێڵـەی کـە داییـم فرمێسـکەکانی پێدا دەهاتـە خـوارەوە، چـاڵ بووبـوو... هێڵـی خـەم... هێڵـی گریان... هێڵـی حەسـرەت... فاتیمـە دەگریـا و ئەشـکەکانی دەهۆنییـەوە و دەیکـرد بـە وشـە و دیسـان دەگریـا...

ماتەمە یان خاک و خۆڵە ئاسمانی گرتووە؟
چییە، بۆچی نیوەڕوان وا تاریک بووە؟
زەوی لەدوای پێغەمبەر پەرێشانە.
غەمبارە، دڵتەنگە، هەڵلەرزانە.
با بگری باکوور و باشووری شار،
با بگرین یەمەن و شام.
کە وا ئاخیری ئەنبیا ڕۆیی.
ئیدی نە سوور سوورە و نە سەوز سەوز،
ئیدی هەرچیی وەرزە ماتەم و
هەرچی ساڵە ساڵی خەمە.
لەپاش کۆچی پێغەمبەر،
دونیا گەردەلوولێکی لمە.
دە با بگرین هەرچی شاری باکوور و باشوورە.
با ماتەمینی ڕاگەیەنن شام و یەمەن.

فاتیمە بیری دەکرد... زۆر بیری باوکی دەکرد و دەلاوایەوە:

«ئەی کێوەکان

ئەی ئوحود!

دەردی دڵەی هەزار پارچەم لای کامتان بەیان کەم!

ئەی خۆر! تۆش وەک من هەتیو کەوتی و لەمەبەدوا نەبیی لێ نییە نوری لێ وەر بگریت...

ئەی مانگی پڕ! ئەو خۆشەویستەی تیشکی خۆت بەسەردا دەباراند، ئیدی لەسەر ڕووی زەوی نییە!

ئەی بادی سەبا! بۆنی گوڵەکانی یەمەنم بۆ مەهێنە، ڕەسولی لێ نییە کە شنەبای بەهەشتی دەهێنا.“

«بابە گیان... ئاه بابە گیان... دەزانم لە دیندا ماتەم نییە، وەلێ ئەمە ماتەم نییە و حەسرەتی دڵێکە بۆ دووریی خۆشەویستەکەی، لەدوای تۆ کێ لێم حاڵی ببێت؟ لەدوای خودا تەنها لە تۆ ئاشکرا بوو حاڵ و بارم.“

”بووم بە ئەو خاکەی لە نەبوونی باراندا قڵیشاوە

بووم بە ئەو ڕۆژەی ڕووناکیی لەدەست داوە

با بگری، زەوی با بگری بۆ باوکم

با بگری، ئاسمان با بگری بۆ باوکم

فریشتانی عەرش و زەوی با بگرین...“

” بەرگە بگرە... کەمێکی کە بەرگە بگرە دڵەی عاشقم... خۆشەویست لەوێ چاوەڕێت دەکات، کەمێکی ماوە کەیف و سەفا و باخچەی نەمران.“

فاتیمـه گەرچـی گەنـج بـوو، وەلـێ زۆری ناڕەحەتـی دیبـوو! هـەر لـەو وەختـەوەی کیژۆڵەیەکی منداڵ بـوو، لـە وادی شـەیب فێـری برسـێتی و نەبوونـی بـوو، دواتـر خەمـی مردنـی دایکـی لەنێو دڵی بچووکیدا ناشتبوو، دواتر شـایەتی هەمـوو ئـەو سـتەم و فێڵ و تەڵەکانـە بـوو کە لـە بابـە گیانی دەکرا و لەسـەر گۆڕی سـێ خوشـکی گـەورەی گریابـوو فاتیمـە... بەرگـەی چەندیـن ناڕەحەتـی و نەبوونـی و برسـێتی و لەدەسـتدانی گرتبـوو، وەلـێ بەرگـەی لەدەسـتدانی باوکـی نەدەگـرت... بـەردەوام بـە هیـوای مژدەکەیـەوە دەژیـا... دەیزانـی شـادبوونەوە کەمـی مـاوە...

## شەوی زەماوەندی فاتیمە

«ئەو کەسەی خۆشەویستی لەدەست داوە،
تەنانەت زەردەخەنەکەشی خەمئامێزە.»

فاتیمە شەش مانگ بوو بێ ئەو دەیگوزەراند، بەڵام چ گوزەرانێک، خەمەکەی وەک ڕۆژی یەکەم تەڕ و تازە بوو و ئێستا ئاگری حەسرەتیشی تێ بەر ببوو. چاوە جوانەکانی بەقووڵدا چووبوون و گۆنای پەمەیی ئاڵی وەک بیابان زەرد هەڵگەڕابوو و نە نانی نان بوو، نە ئاوی ئاو، نە لەگەڵ کەس دەدوا. هەرچیی دەکرد و بۆ هەرکوێ دەچوو لە سەرمای بێئەویدا هەڵدەلەرزی و هیچ لای سەیر نەبوو وەختێ گوتیان: "قەسوەی حوشتری نەبی تەرکی نان و ئاوی کردووە و خۆی داوەتە بیابان و لەوێ گیانی سپاردووە." دەیزانی قەسوەش وەک ئەو موبتەلای عەشقی نەبی بووە و یەکێ نەیدیبێ و نەیناسێ و خۆشی نەویستبێ، لێی تێناگات! فاتیمە هەستی دەکرد ڕۆژی لیقا زۆری نەماوە و بەردەوام دەپاڕایەوە: "خودایە، دڵخۆشیم زیاد بکەیت، شادیم زیاد بکەیت و ڕێی شادبوونەوەم لەسەر ئاسان بکەیت."

ڕۆژبەڕۆژ وشک دەبوو گوڵی زەهرا و عەلی هەرجارێک

دەستی دەگرت و تەماشای دەکرد، دەیزانی ئەم جار سەرەی کۆچی فاتیمەیە.

ئەو ڕۆژە ماڵی خەم بۆ یەکەم جار لە ماوەی چەند مانگی پێشوودا چۆڵ بوو و فاتیمە نەچووبوو، چوون ئیدی لە جێگەدا کەوتبوو... چی بوو؟ کاتی کۆچی نزیک بووبوویەوە؟ هەمووان بە چاوی پڕ لە ئەشک و دڵی پڕ ماتەمەوە تەماشایان دەکرد و گوێیان لە دەنگی بانگێکی عەسری خەمئامێز بوو. ڕاستیی بانگی عەسر بۆچی شتێک لە خەمی تێدا بوو؟ بۆچی جێیەکی دڵی ئینسانی دەهەژاند؟ کۆچ و گەڕانەوەی بیری ئینسان دەهێنایەوە، یاخود یادخەرەوەی ئەو ڕاستییە بوو کە هەموو بوون و بوونەوەر و ئینسان و ڕووناکی و گیانێک کۆتایی دێ و دەڕوات...؟ وەک بڵێی بڵێت ئێیە، ئیدی وەختی ڕۆیشتنە... کات تەواو بوو... موسڵمانان بەرەو مزگەوت ڕۆیشتن و فاتیمە سەرخەوێکی شکاند و لە خەونیدا باوکی خۆشەویستی بەزەردەخەنەوە فەرمووی: "هەستە کچم! خۆت ئامادە بکە، وەختی شادبوونەوەیە!" کە بەخەبەر هات، زەرەیەک گومانی لە ڕاستیی خەونەکەی نەبوو و وەک بڵێی ئاوی حەیات پرژێنرابێ بە گیانیدا، هەستی بە زیندووبوونەوەیەکی جیاواز دەکرد لە ڕۆحیدا و بە دڵخۆشییەکی جیاواز و شپرزەییەکی شیرین و خەمێکی سەیرەوە دەستی گرت بە دیوارەکەوە و هەستایە سەر پێ. بە دەستە ناسکەکانی ئاوی گەرم کرد و منداڵەکانی بانگ کرد و هەرکێ لە ماڵەکەدا بوو، بەسەرسوورمانەوە تەماشای دەکرد. یەک-یەک منداڵەکانی شۆرد و پرچەکانی

داهێنـان و لـەو کاتـەدا عەلـی هاتـە ژوورەوە و زۆر کەیفخـۆش بـوو کە بەو جۆرە وەک جـاری جاران کەیفسـاز و بەجموجـووڵ بینیی و گوتـی: "خـۆت ماندوو مەکە فاتیمـەم! بۆچـی هەستاویتە سـەر پـێ؟" تەماشـایەکی کـرد وەک ئـەوەی بڵێت، "کۆتـا ئـەرک و کۆتـا حەسـرەتمە، لێـم گـەڕێ..." پاشـان عەلـی تەنهـا بـە ئـەو نیگایـە و بـە شـادیی سـەر ڕوخسـاریدا تێگەیشـت مـژدەی پـێ گەیشـتووە و خـۆی بـۆ نەگیـرا و دەسـتبەجێ چـووە دەرەوە لـە ژوورەکـە... فاتیمـە یەک-یـەک بۆنـی خۆشـی دا لـە منداڵەکانـی و تێـر ماچـی کـردن، دەیزانـی لەوەبـەدوا لـە دونیایەکـی بێدایکدا دەژیـن... حەسـەن هەشـت سـاڵان و حوسـەین حـەوت و زەینـەب پێنـج و ئوموکەلسـوم دوو سـاڵان و فاتیمـەش دایکێکـی بیستوهەشـت سـاڵان و لـە بەهـاری عومریـدا بـوو، وەلـێ شـادیی شـەوی زەماوەنـدی هەبـوو و هـەزار سـاڵی دونیـای نـەدەدا بـە کاتژمێرێکـی بەهەشـت و هـەزار سـاڵ ژیانـی بەهەشـتی نـەدەدا بـە لەحـزەی بینینـی خـودا، بۆیـە ئامـادە بـوو...

دووبـارە و دەبـارە ماچـی منداڵەکانـی کـرد و ئێسـتا ئیـدی کەوتبوویـە نێـو حەسـرەتێکی دوو پارچـە. لـە لایەکـەوە شـادبوونەوە بـە باوکـی خـۆری دڵـی داگیرسـاندبوویەوە و لـە لایەکـی دیکـەوە دابـڕان لـە جگەرگۆشـەکانی سـەرمای دەخسـتە دڵـی. یەک-یـەک ماچـی دەسـت و پەنجـە و چـاو و سـەر و قـژی کـردن. لـە ڕوخسـاری پاکـی حوسـەیندا خـەم و ئـازاری داهاتـووی دەبینـی، ئـاه لـە حەسـەن و حوسـەین، چییـان لـێ بەسـەر دەهـات! ئـای لـەو ڕۆڵانـەی کـە لـە مەحشـەردا ئیمامـی سـتەملێکراوان

دەبوون، تێرتێر ماچی کردن، کوا ئەو خاوەنیان بوو! خودا بوو خاوەنی هەمووی، تەسلیمی خودای کردن...

ئەو ئالایەی لە خەدیجەی دایکیەوە درابوویە دەستی، ئێستا تەسلیمی زەینەبی کچی دەکرد، تەماشایەکی کچەکەی کرد و دڵی لەرزی، هەر لە ئێستاوە فریاد و هاواری زەینەبی دەبیست، دەیبینی چەند فرمێسک دەڕێژێ و شایەتحاڵی چەند زوڵم و ستەم دەبێت... تەماشای ڕوخساری منداڵەکانی دەکرد و سڵاوی لە ئەو ئیمامانە دەکرد کە لە نەوەی ئەوان دەبن و بێ ئەوەی بهێڵێت دڵۆپێ فرمێسکی ببینن، تەماشای کردن و کۆتا ئامۆژگارییەکانی کردن: "ئێوە نەوەی کۆتا پێغەمبەرن، هەرگیز لە ڕێی قورئان و سوننەتی باپیرتان و قسەی باوکتان دەر مەچن... یەکدیتان زۆر خۆش بوێت و ببنە یار و یاوەری یەکتر و تا ئەو ڕۆژەی لە بەرەبەیانێکی بەهەشتدا یەک دەگرینەوە، لە سیرات الموستەقیم جیا مەبنەوە."

بۆ کۆتا جار ئامێزێکی قووڵ و ماچی هەموویانی کرد و کۆتا جار خواردنی بۆ دروست کردن و بۆ کۆتا جار نانی دەستی دایکیان خوارد... ئێستا ئیدی منداڵەکانی تێر و پاک و پۆشتە بوون... منداڵەکانی بێئاگا لە هەموو شتێک، ڕەوانەی ماڵی دراوسێکەیان کرد و وەختێ بردیانن، فاتیمە کۆتا جار چاوی کەوتە سەر ملی حوسەین... کە پێغەمبەر زۆر جار بەحوزنەوە ماچی دەکرد...

عەلی چاوی تەڕ و ڕوخساری کوژاوە بە ڕاسەری فاتیمەوە دانیشتبوو و ئەو یارەی کە هەمیشە پێی دەگوت: "هەرکات

تەماشـات دەکـەم، هەرچیـی خـەم و ناخۆشـیمە دەتوێتـەوە."
ئـەم جـار تەماشـای دەکـرد و خەمـی زیـادی دەکـرد! منداڵـی و گەنجـی و خۆشـی و ناخۆشـیی لەگـەڵ فاتیمـەدا بـەڕێ کردبـوو، هەرجـارەی فرمێسـکی بـۆ یەکێـک لـەو سـاتانە دەڕشـت. عەلـی بێدەنـگ لەتەنیشـت فاتیمـەدا دانیشـتبوو، فاتیمـە تەماشـای کـرد و ئـەوەی لـە دڵیدا بـوو گوتـی: "کوڕە مامـم! مەگـەر مـردن گەشـتێک نییـە بـەرەو دیـداری شـیرنی خۆشەویسـت!"

"بەڵێ وایە فاتیمەم!»

"دەی کـە وا بـێ، خـەم مەخـۆ! ویسـاڵی مـن نزیکـە و دڵانـی عاشـق هەرگیـز جیـا نابنـەوە."

"...!"

"ئەی کوڕی مام، تا ئەم ڕۆژە هیچ درۆیەکت لێ بیستووم!"

"نەخێرا هەرگیز."

"هیچ ناپاکییەکت لێ دیوم!"

"حاشا و کللا!"

"لـە ئـەو ڕۆژەوەی بەیەکەوەیـن، هەرگیـز دەنگـم بەسـەردا بـەرز کردوویەتـەوە؟"

"پەنـا دەگـرم بـە خـودا ئـەی فاتیمـە! تـۆ لـە خوداناسـانی! لـە هەمـووان زیاتـر چاکـە دەکەیـت و لەخوداترسـترینەکانیت، لـە یەکەم ڕۆژی هاوسـەرگیرییەوە بۆ سـاتێکیش دڵت نەڕەنجاندووم و سـوێند دەخـۆم بـە خـودا تـۆش هەمـان ئـەو بەڵایـەم بەسـەردا دەهێنـی کـە ڕەسـول اللـە بەسـەریدا هێنـام! ئـەم قسـانەت لـە قسـەی ماڵئاوایـی دەچـن و جیابوونـەوە لـە تـۆ موسـیبەتێکی

گەورەیە بەسەرمدا دێت، بەڵام ئێمە عەبدین و بێچارەین و لەلای خوداوە هاتووین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە."

چاوە حۆریئاساکانی لەسەر گیر کرد و ئەوەی چەنێک بوو دەیویست بیدرکێنێ، درکاندی: "پیاوان ناتوانن بێ ژن بژین ئەی عەلی! لەدوای من تۆش ناچاریت هاوسەرگیری بکەیت، بەڵام داوایەکم لێت هەیە."

"داواکاریی تۆ ئەمانەتە و ئەرکە، بەجێی بگەیەنم."

"لەدوای من هاوسەرگیری لەگەڵ ئومامەدا بکە، چوونکە زۆر میهرەبانە بەرامبەر منداڵەکانم."

ئەمە چ پردێکی سیراتی سەخت بوو ئیلاهی... عەلی بێدەنگ بوو... زاری قوفڵ بوو... تاکە وشەیەکی بۆ نەگوترا، حۆرییەکەی ئوحود و حونەین و بەدر لە شەقەی باڵی دەدایەوە بۆ بەهەشت و عەلی زۆری مابوو لێی تێر بێت... خۆشەویست مژدەیەی ئەوەی دابوو بە عەلی کە فاتیمە لە بەهەشتیشدا هاوسەری دەبێت، بەڵام بەو جۆرەش، هێشتا جودایی زۆر سەخت بوو، عەلی فرمێسکی دەڕشت: "ئەوەندە خەم مەخۆ ئەبا حەسەن! مەرگ بوونەوەرێکە بۆ ئەم دونیایە خەلق کراوە و ڕۆژی مەحشەر مەرگ دەمرێ و هەرگیز جیا نابینەوە، وەلێ سێ داواکاریم لێت هەیە لەم جیابوونەوە کاتییەماندا."

چاویان لەیەک گیر کردبوو و تەماشای یەکیان دەکرد و هەر وشەیەک لە زاری فاتیمە دەکەوتە خوار، عەلی بە نیعمەتی دەبینی و فاتیمە بەردەوام بوو: "گەر لە ماوەی هاوسەرگیریماندا هیچ مافێکت لەلامە، داواکارم گەردنم ئازاد

بکەیت، دەکرێ بە زانین یاخود نەزانی دڵم شکاندبی، هەرچی بێ لە کۆتاییدا مرۆڤین..."

"ئازاد بێت. هەرچی مافێکت هەیە لەسەرم ئازاد بێت زەهرام، تۆ خۆشبەختییەکت بە من بەخشی لە دونیادا، بە نسیبی هیچ کەسێکی دیکە نەبووە، دەبێ چ مافێکم هەبێ لەسەرت!"

زەردەخەنەیەک کەوتە سەر کوڵمە کوژاوەکانی: "لەدوای من باش ئاگاداری منداڵەکانم بە، تا ئێستا چۆن بووی لەگەڵیان، لەمەبەدوا زیاتریش خۆشت بوێت و دڵیان مەشکێنە، هاواریان بەسەردا نەکەیت، نەوەک هەست بە بێدایکی بکەن و غەمبار بن، با ئەو دڵەیان کە لەدوای باپیریان تەنها بوو، بە ڕۆیشتنی دایکیشیان نوقمی خەم نەبێت، مەهێڵە هەست بە ئازاری بێدایکی بکەن ئەی عەلی."

کۆتا داواکاریی وەک نەخشێک لەسەر دڵی عەلی نەخشاند و بە چاوی پڕەوە گوتی: "ئەی خاوەنی زولفیقار، کە مردم، ئەم بەڵگەنامەیەشم لەگەڵدا بنێژن."

عەلی بەڵگەنامەکەی لێ وەر گرت و تەماشای کرد، مارەییەکەی بوو! مارەییەکەی کە داوای ڕزگاریی ئومەتی دەکرد... عەلی ڕازی بوو بە حوکمی خودا... ڕازی بوو، وەلێ زۆر دڵی تەنگ بوو... بانگی ئێوارەی دا و عەلی بە دڵێکی هەزار پارچەوە ڕێی مزگەوتی گرت...

***

شەوی زەماوەند بوو... شەوی ویساڵ، شەوی گەیشتن بە خۆشەویست بوو ئەو شەوە...

فاتیمــە بانگی لە ئەســمای کچی ئومەیس کــرد: "لە وەفاتی ڕەســول اللــەدا جوبریــل لــە بەهەشــتەوە کافــوری هێنابوو، ڕەســول هەندێکی بۆ من خســتە لاوە، دەتوانــی بۆم بهێنیت؟" ئەســما لــەو جێیــەی پێــی گوتبــوو، بۆنەکــەی هێنــا و فاتیمە دەســتنوێژی گــرت و بۆنــی دا لــە خــۆی و دواتــر داوای لە ئەســما کــرد کــە ئەو کراســەی بــۆ بهێنێــت کە نوێــژی پێوە دەکرد. ئەســما کراسەکەی بۆ هێنا و داوای لێ کرد لە دەرەوە چاوەڕێــی بکات و گوتی: "کەمێک لــە دەرەوە چاوەڕێم بکە و پاشــان بانگــم بکە، گــەر وەڵامم دایتەوە باشــە، گــەر وەڵامم نەدایتــەوە، ئــەوە بزانــە ڕۆشــتووم بــۆ لای باوکــم و عەلــی بانــگ بکە."

کچەکەی نەبی بۆنی خۆشی لە خۆی دا و کراسە سپییەکەی لەبــەر کــرد و خــۆی ڕازانــدەوە و چوویــە ژێــر بەتانییەکــەی و شــایەتومانی هێنــا، ئەســما لەودیــو دەرگاکــەوە نەیدەزانــی چــی بــکات و دڵــی خەریــک بــوو دەبــوو بــە هــەزار پارچــەوە و یــەک لــەدوای یــەک بانگی دەکــرد:

"ئەی فاتیمەی زەهرا!

ئەی دایکی باوکی!

ئەی دایکی ئیمانداران، گوێت لێمە؟"

هیــچ دەنگێــک نەهــات، ئەســما بەپەلــە چوویــە ژوورەوە و بەتانییەکــەی لەســەر ڕووی فاتیمــە لا دا و دەبینــێ وەک بووکێــک پــاک و بێجووڵــە و بێهەناســە کەوتــووە و لەمێــژە دەســتی بابــە گیانــی گرتــووە و ڕۆشــتووە...

ئەسما بەدەم فرمێسکەوە تەنها ئەوەندەی بۆ گوترا: "ئەی فاتیمە! کە چوویت بۆلای پێغەمبەر، سڵاوی ئەسمای کچی ئومەیسی پێ بگەیەنە..."

ئەوەندەی گوت و بەدەم هەنسکەوە هاواری کرد: "فریا کەوە ئەی عەلی!"

عەلی نوێژی کردبوو و بەرەو ماڵەوە دەگەڕایەوە و بە هاواری ئەسما ڕاچڵەکی و نەیزانی چۆن لە مزگەوتەوە گەیشتەوە ماڵەوە. کە گەیشتەوە، دەبینێت فاتیمە وەک بووکێکی تارابەسەر پاڵ کەوتووە و پەیتاپەیتا بۆنی میسک و گوڵ و عەمبەر لە ژوورەکەوە دێت، دەتوت هەرچیی بۆنی جیهانە ڕژێنراوەتە ئەو ژوورە. دەتوت هەرچیی جوانیی بوونە لەوێ کۆ بووەتەوە ئەو ساتە. فاتیمەی دەریای جوانی گەڕابوویەوە لای مەحبوب، عەلی نوقمی ئەشک و گریان بوو و عەباکەی پشتی دانا و لەتەنیشت هاوسەری وەفاداریدا چۆکی دادا و بانگی دەکرد: "فاتیمەم! قسەم لەگەڵ بکە! وەڵامم بەرەوە نوری چاوم."

ژوورەکە نوقمی هەنسک بوو و لە گەرمای مانگی تەممووزدا فاتیمە بەزەردەخەنەوە بۆ تاهەتایە ماڵئاوایی لە دونیای فانی کرد، عاشق بە مەعشوق گەیشت و ئەمجارە دڵی عەلی بوو بە 'ماڵی خەم' و ئوحود دەنگی دەدایەوە:

"انا الله و انا الیه راجعون."

* * *

"ئەی ئەشکی چاوەکانم، مادەم لە دەرگای چاومەوە دەڕۆیت
هیچ نەبێ بچۆرە بەر قاپیی خۆشەویست و سەرت بخە سەر کۆشی ئەو!"
- مەولانا

لە شەوێکی تاریکدا زیحیە و سەلمان و ئەبوزەر و عەمار و عەلی فاتیمەیان لە باقیەوە بۆ بەقا ڕەوانە کرد و لەسەر وەسیەتی خۆی تەنها و دوور لە چاوان بەڕێیان کرد: "با هیچکەس دەستم بۆ نەبا و هیچکەس جەستەم نەبینێ، لە تاریکی شەودا لە گۆڕستانی بەقیع بمنێژن."

لە تاریکیی شەودا پێنج ئیماندار حۆرییەکەی بەهەشتیان بەرەو ماڵی کۆتایی ڕەوانە کرد و عەلی چوویە ناو گۆڕەکە و بەفرمێسکەوە گوتی: "بیدەنە دەستم!" جەستەی نارین و ناسکی فاتیمەیان دایە دەستی، وەک چۆن جەستەی هێندەی پەڕ سووک و بۆنخۆشی لە ڕۆژی لەدایکبوونیدا ڕادەستی ڕەسول کرابوو، ئێستا ڕادەستی عەلی دەکرا! دووبارە لەدایک دەبوویەوە و ئەم جارەش باوکی پێشوازیی لێ دەکرد... فرمێسکەکانی عەلی دەڕژانە سەر کفنەکەی یارە نازدارەکەی و دەیگوت: "خۆشەویستم... هیچ خۆشەویستییەک نییە بتوانێت جێی خۆشەویستیی تۆم بۆ بگرێتەوە، دڵم لە تۆ زیاتر جێی کەسی تێدا نابێ و لە چاویشم دوور بکەویتەوە، هەردەم لە دڵ و ڕۆحم نزیکیت، ماڵئاوا یاری وەفادارم... ماڵئاوا... "

حبيبٌ ليس يُعدُله حبيبٌ
وما لسواه في قلبي نصيبٌ

حبيبٌ غاب عن عيني وجسمي

وعن قلبي حبيبي لا يغيبُ

"ڕۆحەکەم...

شیرینەکەم...

زەهرام...

ئیدی لە دونیادا یەک داواکاریم هەیە، ئەویش گەیشتنە بە تۆ و باوکت.

خۆشەویست ئیدی لەمەبەدوا خەم و کەسەر بۆ تۆ نەما... بە فەرمانی ' کن'ی خودا دەبی بە ئاوی کەوسەر و هیچکەس ناتوانێت زیانت پێ بگەیەنێت، چوون لەژێر پارێزگاریی خودادایت، سەبرم کەمی کردووە یا رسول الله! توانام نەماوە! لەدوای کۆچی تۆ دەبێت بەرگەی کۆچی فاتیمەش بگرم! ئەمەنەتەکەتیان لێ سەندمەوە... ئەمەنەتەکەیان دایەوە دەست خۆت، لەمەبەدوا خەو لە چاوانی من حەرامە..." دواتر خۆڵی دەکرد بەسەر فاتیمەدا و بەدەم گریانەوە دەیگوت: "لە ئێستاوە بە تاسەی ئەو ڕۆژەوەم کە پێت دەگەمەوە."

لەوەبەدوا عەلی هەموو ڕۆژێک بیری فاتیمەی دەکرد و وەک بڵێی پارچەیەکی لێ کرابێتەوە، هەستی بە کەموکووڕی دەکرد. زووزوو دەچووە سەر گۆڕەکەی و دڵی خۆی بۆ هەڵدەڕشت... با مەرگ هاتبێتیشە نێوانەوە، تەنها جەستەیانی لەیەک جودا کردبوویەوە و عەلی لە دونیا و فاتیمە لە قیامەت هەردەم بەیەکەوە بوون، با یەکیان لەسەر خاک و یەکیان لەژێریشیدا بێت، بە هەمان شەوق و عەشقەوە دەردەدڵی بۆ

دەکرد و لەوەبەدوا هۆنراوەکانی عەلی هەمووی بۆ فاتیمە بوون:

ئیشتیاق و حەسرەتی یار دەچێژم
بڵێی هەبێت ڕێیەک بمبات بۆ لای ئەو
من تاقە یارێکم هەبوو،
نە لەسەر ڕووی زەوی
نە لە دڵمدا هاوشێوەی نەبوو...
من وەها یارێکم هەبوو
گەرچی بە جەستە دوورە لێم
خەیاڵی داییم وا لە بەرچاوم...

## لەدوای فاتیمە

ڕێگا درێژ و میحنەت بێکۆتایە و وەختێ دەبیستی داود ئاسنی کردووە بە هەویر و عیسا حەوت تەیری مردووی زیندوو کردووەتەوە و موسا دەریای کردووە بە دوو کەرتەوە، تێدەگەیت وشە بەشی عەشق ناکات... دەبێت بە پاکیزەییەکی مەریەمئاسا و میهرەبانییەکی ئاسیائاسا و مەودەتێکی خەدیجانە و موحیببەتێکی فاتیمانەوە ڕێ بکەیت...

هێندەی فرمێسکی عاشقان سڵاوت لێ بێت ئەی ڕەسول، هێندەی ژمارەی گەڵای دار و ئەستێرەی ئاسمان و نەفەسی گیانداران سڵاوت لێ بێت...

ئەوی ڕۆژێ لەسەر گۆڕت وەستام و سڵاوم لێ کردی، وەلێ وەڵامم وەر نەگرت... ئاە... ئاە... سەبر و ئارامی چەند پیرۆزن بۆ مرۆڤ... دەبێ چاوەڕێی وەڵامی سەر حەوزی کەوسەرت بم...

بارانێکی خەمئاێز نمەنمە بەسەر مەدینەدا دەباری و ئاسمان و خۆر و ئەستێرە و مانگ و ئاووهەوا دەیانزانی ئیدی ڕەسول و کچەکەی نابیننەوە... گەرچی دۆست بە خۆشەویست گەیشت و حەسرەت کۆتایی هات، وەلێ دڵی ئەوانەی مانەوە بە ئاگری جودایی دەسووتا... فرمێسکی هەمووان پەلکەزێڕینەیەکی دروست کردبوو، بە ئاسمانی دونیاوە زەردەخەنەی دەکرد...

سڵاوت لێ بێ ئەی لە بەهەشتدا نزیکترینی حەبیب... سڵاوت لێ بێ ئەی دوڕدانەکەی ڕەسول... ئەی کچە نازدارەکەی خەدیجە... وەک بێچارەکانی ئاخیرەت لە خەمی خۆمان و نەوەکانماندایىن و نزای لێخۆشبوونی تاوانەکانمان و ڕزگاربوونی نەوەکانمان دەکەین... هێندەی ژمارەی نەفەسەکانی ڕووی زەوی سڵاوت لێ بێ ئەی فاتیمە... زیندووهێشتنەوەی یادت لەژێر قوببەی شینی ئاسماندا قەرزی سەر شانمان بێت... شەرت بێ تا ماوین یادت زیندوو بهێڵینەوە... سڵاوت لێ بێ ئەی دایکی حەسەنەین... هەموو دڵێک لە تۆ تێناگات، ئینسان بۆ ئەوەی لە فاتیمە حاڵی بێت، دەبێت ڕێبواری بیابانی موحیببەت بێت...

هەموو دڵێک لە فاتیمە ناگا
هەموو عەقڵێ لە فاتیمە ناگا
هەموو چاوێ ناتوانێ فاتیمە ببینێ...
هەموو ڕۆحێک هەست بە بوونی فاتیمە ناکات...
ئەی ئینسانی شێوە جەوهەر،
ئەی تاقانەکەی ڕەسول،
ئەی جوانترینی هەبووەکان،
ئەی میوەی داری خۆشەویست،
ئەی شاژنی خانمان،
ئەی خاوەن پایە و قەدرگران،
ئەی نوری سەروەری ئەنبیا
هەزار سڵاوت لێ بێت لە ئێمەوە...



## ئەو هۆنراومیەی عەلی بۆ فاتیمەی نووسیوە

هَـلْ إلى طُـولِ الحَيـاةِ سَـبيلُ — وإني وهـذا المـوت ليـس يحـول
وإني وإن أصبحـت بالمـوت موقنـاً — قَـلِيُ أمـل مـن دون ذاك طويـل
وللدّهـر ألـوانٌ تـروح وتغْتَـدىُ — وإن نفوسـاً بينهـن تسـيل
ومنـزل حـق لا معـرج دُونَـه — لـكلّ امْـرءٍ منهـا إليـه سـبيل
قطعـت بأيّـام التَّعـزُّز ذِكـره — وكلُّ عزيـز مـا هنـاك ذليـل
أرى عِلـل الدُّنيـا علـيَّ كثـيرة — وصاحبهـا حتّـى المماتِ عليـل
وإنّي لمشـتاقٌ إلى مـن أحبُّـه — فهـل لي إلى مـن قـد هويت سـبيل
وإنّي وإن شـطَّت بِـىَ الـدَّار نـار — هـا وقد مـات قبـلي بالفـراق جميل
فقـد قـال في الأمْثـالِ في الْبَـينُ قـا — ئـل أضُرَّ بُهَـا يـوم الفـراق رحيـل
لـكلّ اجتـماعٍ مـن خليلـين فرقـة — وكلُّ الـذي دون الفـراق قليـل
وإنَّ افتقـادي فاطـماً بعـد أحمـدٍ — دليـل عـلى أن لايـدوم خليـلٌ
وكيـف هنـاك العيش مـن بعد فقد — هـم لعمـرك شيء ماإليـه سـبيل

سيعرض عن ذكري وتُنْسى مَوَد تيويظهر بعدي للخليل عديل

وليس خليل بالمَلُول لا الَّذى إذا غبت يرضاه سواي بديل

ولكن خليلي من يدوم وصاله ويحفظ سرّي قلبه ودخيل

إذا انقطعت يومامن العيش مدتى فإن بكاء الباكيات قليل

يريد الفتى أن لا يموت حبيبه وليس إلى ما يبتغيه سبيل

وليس جليلاً رُزْءُ مالٍ وفقده ولكن رُزْءَ الأكرمين جليل

لذلك جنْبِي لا يواتيه مضجعُ وفي القلب من حرّ الفراق غليل

حیکایەتێکی دیکەی بێوێنە، ورد و درشت و ناسک و جوان دەگێڕدرایەوە، حیکایەتی فاتیمە و عەلی!

گەر فاتیمە نەبووایە، عەشقمان نەدەناسی، ئاشنا نەدەبووین بە موحیببەتی محەمەدی ﷺ، نەماندەزانی کە دووری لە ئەو مەرگە!

فاتیمە نەبووایە، بەستەی ژنبوون بێئاهەنگ دەبوو، دڵەکان وەک شەوی بێ ئەستێرە گوم دەبوون، ئاوازی دایکایەتی بێمانا و هۆنراوەکان نیوەوناچڵ دەبوون...

حیکایەتی عەلی و فاتیمە وەک داستانێکی قەدیم و گەنجینەیەکی پڕ خشڵ جێ دەهێڵرا بۆ نەوەکانی داهاتوو و هەمووان لە ڕێی خوێندنەوەی سەرگوزەشتەکەیەوە لە ڕازی فاتیمەبوونی فاتیمە تێدەگەیشتن...



07501269689
07511408868


hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com


سلێمانی - کاسۆمۆڵ
نهۆمی دووەم - ژمارە ٤٥








٧٠٠٠ دینار


ISBN:978-9922-710-24-2
9 789922 710242